# مەملەکەتی

# پێغەمبەران

بەرگی دووەم

دیدێکی نوێیە لە قورئان و سوننەت و خوێندنەوەیەکی
واقیعیانەی مێژووە لە ژیانی پێغەمبەران

ماکوان کەریم

بسم الله الرحمن الرحيم

# مەملەکەتی پێغەمبەران

## بەرگی دووەم

دیدێکی نوێیە لە قورئان و سوننەت

و خوێندنەوەیەکی واقیعیانەی مێژووە لە ژیانی پێغەمبەران

نووسین: ماکوان کەریم

پێداچوونەوە: باران ئاریایی


کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی



بەڕێوەبەری گشتی: موحەممەد خضر ئەحمەد 07824671394 - 07504671394

بەڕێوەبەری هونەری: موستەفا موحەممەد کوردی 07509998182

فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

ئنیستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

لقی یەکەم: بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحمود - بەرانبەر مزگەوتی مەحمود عەلاف

ئیمێل: mdmaktaba@gmail.com

تایپیست: باران ئاریایی

نەخشەسازی ناوەوە: موستەفا موحەممەد کوردی

نەخشەسازی بەرگ: برەو نەججاڕ

چاپی یەکەم: ٢٠٢٥

تیراژ: ١٠٠٠

نرخ: ٢٠٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان

ژمارەی سپاردنی (١٢٠٠) ی ساڵی (٢٠٢٤)ـی پێ دراوە.

گرنگ نییە لە ڕابردوودا چی ڕوویداوە!

یان ئەوەی لە ئێستادا لە ژیانتدا ڕوودەدات، ئەگەر بە باوەڕەوە بەرەو ڕووی خودا بڕۆین، هیچ کام لە کێشەکان هێزی ئەوەیان نییە داهاتوویەکی سەرسوڕهێنەر و باشت لێ بسەننەوە.

خودا تۆی خۆشدەوێت!

دەیەوێت بە سەرکەوتوویی بەسەر گوناهدا بژیت

بۆ ئەوەی بتوانیت بەڵێنەکانی زاتی بەرزیت هەبێت بۆ ژیانت لە ئەمڕۆدا!

# پێشەکییەکی کورت لەم بەرگەدا

سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشم بۆ ڕووداوە سیاسییەکانی سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم، تا ئەوکاتەی کە بەرگی یەکەمان تەواوکرد، بەڵام جارێ کۆتاییان بە ژیان و ڕووداوەکانی حەزرەتی ئیبراهیم نەهێناوە، چەند لایەنێکی تری ژیانی ئەم پێغەمبەرە مەزنە ماوە کە بیخەینە ڕوو چ لە سەردەمی لە دایکبوونی ئیسماعیل و ئیسحاق و پاشان لوطی برازای.

لە ناوچەکەدا لە دوای لە ناوچوونی نەمرود بۆشاییەکی سیاسی ڕووی کردە ناوچەکە، (گریک) واتا یۆنانی ئەمڕۆ پەلی هاویشت بۆ ناوچەکانی کەناری دەریای ناوەڕاست، هەروەها لە میسر پادشاکانی خانەوادەی (هیکسۆس) ئەوانیش حوکمڕانی میسریان دەکرد لە باکووری ئەو وڵاتەدا، کەنعانیەکانیش هاوکاری گریکەکان بوون، کە سەرەتای دەستپێکی شارستانیەتی فینیقی دەست پێ دەکات، هەڵبەت دەست پێ دەکات نەک بونیات نرابێت، بۆ ئەوەی لە ڕووی زانستی مێژووەوە دەقیق بم لەگەڵتاندا، هەروەها ئێران کە بە پارسیا ناسرابوو، ئەوانیش لە هەوڵی فراوانی قەڵەم ڕەوی خۆیان بوون، کوردە لۆلۆیەکانیش زۆرێک لە ناوچەکەیان خستبووە ژێر ڕکێفیان و تورک لە ڕێگای خانەوادەی نەبطیەکان ئەوانیش لە جەنگ دابوون لەگەڵ هەموو هێزەکانی ناوچەکەدا، زمانی ئەو ناوچانە هەمووی سریانی بوو، یاخود سوریانی پێ دەوترا، هەرچەندە زمانی لۆکاڵی دروست بووە، بەڵام زمانی سەرەکی میزۆپۆتامیا و کەنعانییەکان بە گشتی سریانی بوو.

هەروەها لەو بۆشاییە سیاسیەدا هەر لایەو قەڵەمڕەوی خۆی زیاد دەکرد، شۆڕشی فیرعەونیەکانیش دەستی پێکرد بوو لە خوارووی میسر دژی بنەماڵەی هیکسۆسیەکان-کە لە دوای حەزرەتی یوسف دەسەڵاتی هیکسۆسیەکان کۆتایی دێت، دەبێت بە دەسەڵاتی فیرعەونی، هەروەها گریکیەکان شێوەی ئۆتۆنۆمیان بەکاردەهێنا و ئیدارەی سەربەخۆ دەدرایە شار و شارۆچکەی ناوچەکان و هەرشوێنێک خاوەنی حاکمی خۆی بوو.

لە ڕووی ئاینیەوە: حەزرەتی ئیبراهیم لە بانگەوازدا بوو لە ناوچەکەدا و تا ڕادەیەک لە وڵاتی میسردا بانگەوازی ئیسلامی حەنیف بەربڵاو بوو هەروەها لە ناوچەکانی شام و حیجازدا، لە هەمانکاتدا بەشێکی زۆری ناوچەکان لە بتپەرستی دابوون بە هۆکاری ئەم بۆشاییە سیاسییە ئایینیە بتپەرستی لە ئەنادۆڵ و عێراق و گریک زۆر بە هێز بوو.

لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە: زۆرێک لە ناوچەکان لە دارمانی ڕەوشتی دابوون، لە هەندێک ناوچە کلتوری نێربازی زۆر بەربڵاو بوو، سەرچاوەکەی لە گریک و هۆزی پەستنای قوبروسەوە گەیشتبووە ناوچەکانی شام، واتا فەڵەستینی ئێستاو وڵاتی ئوردنی ئەمڕۆ.

ئەمە بە گشتی ڕەوشی گوزەرانی ناوچەکە بوو لە ڕووی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان.

## مەملەکەتی نۆیەم:
## ڕووداوەکانی ژیانی حەزرەتی لوط پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ

لوط لە قورئاندا ٢٧ جار ناوی هاتووە، برازای حەزرەتی ئیبراهیم بووە یەکێک بووە لە ئیماندارە سەرەتایەکان، لە دوای گەڕانەوەیان لە وڵاتی میسر خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆر بوون، مێژوونووسان دەڵێن بە هۆکاری زۆری مەڕوماڵات و لەوەڕاندنیان لە گەڕانەوەیان بەرەو وڵاتی شام، شوانەکانی حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی لوط کێشە دەکەوێتە نێوانیان و حەزرەتی ئیبراهیم بۆ چارەسەری ئەم کێشەیەی مەڕوماڵاتەکە دەکات بە دوو بەش، بەشێکی دەنێرێت بۆ ناوچەکانی (سەدوم، عامور، صیعە، عمرە، دوما و صغور) ئەم جێگایانە سەر بە شاری گەورەی سەدوم بوون، ئەم ڕۆشتنەش هاوکاتە لەگەڵ بوون بە پێغەمبەر و خوای گەورە بانگەوازی ئیسلامەتی پیادادەنێرێت بۆ ئەو ناوچانە، کە هەموو بتپەرست و خراپەکاربوون لە ڕووی ئاکار و ڕەوشتی کۆمەڵایەتی کاری (نێربازی) یاخود (هاوڕەگەزبازی) تێیاندا بەربڵاو بوو.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ١٦٠ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ١٦١ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ١٦٢ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ١٦٣ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ١٦٤ أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ١٦٥ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ١٦٦ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ١٦٧ قَالَ إِنِّى لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ١٦٨ رَبِّ نَجِّنِى وَأَهْلِى مِمَّا يَعْمَلُونَ ١٦٩ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ١٧٠ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ١٧١ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ١٧٢ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ١٧٣ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ١٧٤ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ١٧٥﴾ الشعراء

واتە: قەومی (لوط پێغەمبەریش) هەر هەموو پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستەوە ١٦٠ کاتێ کە (لوط)ی برایان پێی وتن: باشە ئەوە ئێوە لەخواناترسن ١٦١ بەڕاستی دڵنیا بن کە من فرستادەیەکی ئەمین و دڵسۆزم بۆتان ١٦٢ لەخوا بترسن و فەرمانبەرداری من بکەن ١٦٣ من داوای هیچ جۆرە پاداشتێکتان لێ ناکەم، من تەنها پاداشتی خۆم لە پەروەردگاری جیهانەکان دەخوازم ١٦٤ ئایا لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا ئێوە بەشوێن نێرینەدا دەگەڕێن و دەتانەوێ (ئارەزووی جووت بوون) لەگەڵ ئەواندا جێبەجێ بکەن؟ ١٦٥ وازدەهێنن لە هاوسەران و هاوجووتانی خۆتان کە پەروەردگارتان بۆی دروستکردوون، بەڵکو ئێوە هەر قەومێکی نالەبار و بەدڕەوشت و ناڕەسەنن ١٦٦ (تاوانباران) وتیان: ئەی لوط، ئەگەر کۆڵ نەدەیت لە دەربەدەرکراوان دەبیت ١٦٧ (لوط) وتی: بەڕاستی من بێزارم لە کاروکردەوەتان و نەفرەتی لێ دەکەم و (بێدەنگ نابم لێی) ١٦٨ (ئەوسا کە ئیتر نائومێد بوو لێیان نزای کردو وتی) پەروەردگارا خۆم و ماڵ و خێزانم لە کار و کردەوەی (ئەم ناپەسەندانە) ڕزگار بکە ١٦٩ (ئێمەش نزامان گیرا کردو) خۆی و ماڵ و خێزانیمان هەمووی ڕزگار کرد ١٧٠ جگە لە پیرەژنێک (کە هاوسەری لوط بوو) لە تیاچووەکان بوو ١٧١ لەوەودوا ئەوانی ترمان (هەر هەموویان بە خۆیان و شارو شارۆچکەیانەوە) کاول کرد ١٧٢ بەسەختی بەردبارانمان کردن، ئای کە بارانی بێدارخراوەکان سەخت و دژوارە ١٧٣ بەڕاستی ئا لەوەدا بەڵگەو نیشانەی (بەهێز هەیە لەسەر دەسەڵاتی خوای پەروەردگار) کەچی زۆربەیان باوەڕ ناهێنن ١٧٤ بەڕاستی پەروەردگاری تۆ (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) باڵادەستە (بەسەر کافراندا) بەسۆز و میهرەبانیشە (بە ئیمانداران) ١٧٥

ئەم هۆزانە لەگەڵ ئەوەی خراپەکار بوون و ئەتوار و ڕەوشتی زۆر خراپیان هەبوو، هەر شتێک باش بوایە بە زەم و خراپەکاری ناویان دەبرد، بە پێچەوانەشەوە هەمووشتێکی خراپیان بە باش دادەنا، بۆ نموونە، ئەگەر بانگی کەسێکیان بکردایە بە ناو و ناتۆرەی ناشیرین بانگ دەکرا، بەڵام بۆ ئەو کەسە گەورەیی بوو خۆ ئەگەر بە جوانی بانگ بکرایە ئەوا پێی ناخۆش بوو چونکە وای دەزانی ڕێزی نەگیراوە.

تەنانەت کە باسی لوط دەکەن دەڵێن: ئەو کەسێکی زۆر پاکە دەریکەن، لە کاتێکدا پاکی بە خراپەکاری ناویان دەبرد! خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿۞ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴿٥٦﴾﴾ النمل

واتە: وەڵامی قەومەکەی تەنها ئەوەبوو کە وتیان: (لوط)و شوێنکەوتووانی لە شارەکەتان دەرکەن، چونکە ئەوانە کەسانێکی پاکن و (بێزارن لە ناپوختی ئێمە)

لەناو یەکتردا خیانەتکاربوون بە زیرەکی لە قەڵەمیان ئەدا، ناو مەجلیسەکانیان هەمیشە شەڕەجنێوبوو، جرطیان بۆ یەکتری لێ ئەدا و لە ناو دانیشتنەکانیاندا بایان لێ دەبووەوە (تریان) لێ ئەدا زۆر ئاسایی بوو لایان بە ئاشکرا باسی زینایان دەکرد لەگەڵ پیاودا واتا نێر لەگەڵ نێردا، بۆ یەکەم جاربوو لە کۆمەڵگەکانی ئەو سەردەمەدا ئەو جۆرە کارە ڕووبدات، کۆمەڵگەیەک بوو پیاوان منداڵەکانیان بەو شێوەیە پەروەردە دەکرد، خۆ وا نەبێت ئافرەتەکانیان باش بووبن، ئەوانیش هاوڕەگەز بازیان دەکرد، هەردوو لایان لە فاحیشە و خراپەکاریدا بوون.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴿٨١﴾ وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴿٨٢﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًاۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ﴿٨٤﴾﴾ الأعراف

واتە: یادی (لوط پێغەمبەریش) بکە کاتێک بە قەومەکەی وت: چۆن ئێوە گوناهو تاوانێکی وا دەکەن کە تا ئێستا هیچ کەس پێش ئێوە لە جیهاندا گوناهو تاوانی وای نەکردوە؟!﴿٨٠﴾ چونکە بەڕاستی ئێوە ئارەزووی (جنسی) خۆتان لەگەڵ پیاواندا ئەنجام دەدەن لەباتی ژنانی هاوسەرتان، نەخێر ئێوە قەومێکی ناپوخت و سنووربەزێن و زیادەڕەوون ﴿٨١﴾ وەڵامی قەومە نالەبارەکەی تەنها

ئەوەبوو کە وتیان: ئەوانە شاربەدەرکەن چونکە ئەوانە کەسانێکن خۆیان پاک ڕادەگرن (داوێن پاکن و وەک ئێمە ناکەن)﴿٨٢﴾ ئێمەش لوط و خانەوادەکەیمان ڕزگار کرد، جگە لە هاوسەرەکەی، چونکە ئەویش لەو کەسانە بوو کە تیاچوون (لەبەر ئەوەی باوەڕی بە لوط پێغەمبەر نەبوو) ﴿٨٣﴾ ئەوسا (بەردمان) بەسەردا باراندن، جا تەماشا بکە و سەرنج بدە و پەند وەرگرە و بزانە، سەرئەنجامی تاوانباران وبێ ڕەوشتان چۆن بوو ﴿٨٤﴾

پێشتر ئاگاداری کردبوونەوە لەوەی کە بە هۆکاری تاوان و خوانەناسیان تووشی سزا دەبنەوە کەچی ئەوان داوای سزاکەیان دەکرد، ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴿٢٩﴾﴾ العنكبوت

واتە: ئایە ئێوە بەڕاستتانە نێربازی دەکەن و ڕێگا بەخەڵکی دەگرن و لە یانەکەتاندا کاری نابەجێ و ناشیرین و نادروست ئەنجام دەدەن؟! کەچی وەڵامی قەومی (بەدخوو) تەنها ئەوە بوو کە وتیان : ئادەی کوا سزا و تۆڵەی خوا، ئەگەر تۆ ڕاست دەکەیت بۆمان بیهێنەوە؟

لوط عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ دوو بۆ سێ میوانی هاتن کە خەڵکەکە بینیانن لە جوانخاسی و بۆن خۆشیان، خێرا چوون بۆ دەرگای ماڵی لوط بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو میوانانەی ڕابوێرن و دەستدرێژی ناموس و شەرەفیان بکەنە سەر بە هەردوو دیوەکەیدا، لوطیش زۆر غەمبار و بێزار بوو، ئەو میوان دۆست بوو داوای لێکردن کە پیاوانە و تێگەیشتووانە بیربکەنەوە، لەگەڵ ئافرەتانی خۆیان ئەوکارە ئەنجام بدەن، بەڵام بێسوود بوو.

ئەو میوانانەش فریشتەی خوایی بوون جوبرەئیل و ئیسرافیل و میکائیل بوون، لوط-یان دڵنیا کردەوە کە ئەوان هیچ زیانێکیان پێناگات و ئەوان لای حەزرەتی ئیبراهیمەوە هاتوون، موژدەی منداڵێکیشیان بەخشیوەتە ئیبراهیم کە خوای پەروەردگار بۆ لەناو بردنی ئەم هۆزە و میللەتە بە گشتی و لە هەمان کاتدا موژدەی ئیسحاق بدەینە ئیبراهیم و خێزانەکەشت لە ناو دەچێت لەگەڵ ئەم گەلە چونکە ئەویش لەوانە، لە بیروباوەڕی بتپەرستی دا.

ئەو هۆزە بە هۆکاری بتپەرستی و پاشان هۆکاری تاوانی تریان هەموو لەناو چوون، لوط و ئیمانداران و منداڵەکانی دەرچوون، کە ٢٠ بۆ ٥٠ کەس دەبوون.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِىٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ﴿٧٧﴾ وَجَآءَهُۥ قَوْمُهُۥ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِن قَبْلُ كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ قَالَ يَٰقَوْمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِى هُنَّ

أَطْهَرُ لَكُمْۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِي ضَيْفِيٓۖ أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٞ رَّشِيدٞ ﴿٧٨﴾ قَالُواْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقّٖ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ ﴿٧٩﴾ قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكْنٖ شَدِيدٖ ﴿٨٠﴾ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيْكَۖ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٖ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمْۚ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُۚ أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٖ ﴿٨١﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ مَّنضُودٖ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَۖ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٖ ﴿٨٣﴾﴾هود

واتە: کاتێ وەفدی فریشتەکانی ئێمە هاتە لای (لوط)، ناڕەحەت بوو پێیان، زۆر دڵتەنگ بوو چونکە لە شێوەی چەند لاوێکی پێکەوتوودا هاتن بە میوانی، ئەمیش ئەیزانی هۆزەکەی شەڕیان پێ ئەگێڕن و خوڕەوشتیان خراپە و ناشتوانێ بەرگریان لێ بکات لەبەر ئەوە (لەدڵی خۆیدا) وتی: ئەمە ڕۆژێکی سەختە (منی تێ کەووتوم) ﴿٧٧﴾ جا هۆزەکەی بە بیستنی هاتنی ئەم میوانانە بە پەلە و (بێ شەرمانە) هاتنە لای، پێشتریش کاری خراپیان دەکرد، (کاتێک لوط ئەم دیمەنە ناشیرینەی دی) وتی: ئەی خزمەکانم ئەمە کچەکانمە و پاک و خاوێنن بۆ ئێوە (وەرن لەناو هۆزدا کێتان بەدڵە بە شێوەیەکی شەرعی و ڕەوا لێتان مارە دەکەم)، لە خوا بترسن، شەرمەزاری لای میوانەکانم مەکەن، ئایا پیاوێکی ژیر و عاقڵتان تیا نییە (کە لە کاری ئاوا ناڕەوا جڵەوگیری بکات) ﴿٧٨﴾ ئەوانیش (بێشەرمانە) وتیان: بەڕاستی تۆ دەزانی ئێمە حەقێکمان نیە بە کچەکانی تۆوە، بێگومان دەشزانی ئێمە چیمان دەوێت ﴿٧٩﴾ لوط وتی: ئای ئەگەر هێزێکم دەبوو بۆ بەرامبەریتان، یان پەنایەکی بەهێزم دەست دەکەوت و دەڕۆیشتم بۆی (تا تۆڵەتان لێ بکەمەوە) ﴿٨٠﴾ میوانەکانی وتیان: ئەی (لوط) ئێمە فریشتەی نێرراوی پەروەردگاری تۆین (ئەو تاوانبارانە ناگەنە لای ئێمە) تۆ مناڵەکانت بە شەو دەرکە، کەستان لانەکاتەوە و ئاوڕ نەداتەوە، بەڵام هاوسەرەکەت کە لاسارە و بەگوێت ناکات، ئەوە تووشی ئەو سزایە دەبێت کە تاوانباران تووشیان دەبێت، بەڕاستی کاتی سزاکەشیان لە سەر لەبەیانی دایە، ئایا بەیانی نزیک نییە؟ ﴿٨١﴾ کاتێ فەرمانی ئێمە (بەتیاچوونیان) دەرچوو (شارۆچکەکەیانمان) ژێرەوژوور کرد، بە قوڕی سوورەوەکراوی وەک بەرد لێهاتوو چین لەسەر چین بەردبارانمان کرد ﴿٨٢﴾ هەموو ئەو بەردانەی دیاری کراو بوون، لەلایەن پەروەردگارتەوە (کە بدا بەسەر تەوقە سەری کێدا) ئەم کارەساتە و ئەم بەرد بارانە وەنەبێ دوور بێ لەستەمکارانەوە (لە هەموو سەردەمێکدا) ﴿٨٣﴾

لوط خۆی پیاوێکی ئازا و بەهێز بوو، پێدەچێت خێزانەکەی لەو میللەتە بووبێت، چونکە خاوەنی هیچ عەشیرەت و هێزێک نەبوو، بێجگە توانای خۆی، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ڕەحمەتی خوا لە لوط بێت، کێشەی توانا و هێزی عەشیرەتی هەبوو

کەس لە پشتی نەبوو لە ناو ئەو میللەتەدا، لە دوای ئەو هەموو پێغەمبەران هاتوون لە ناو هۆز و عەشیرەتی خۆیان پشتگیریان لێ کراوە[1].

لە دوای ڕزگار بوونی لە ناو ئەو گەل و هۆزە، هیچ لە سەرچاوەیەکی وا لەبەر دەست نییە، تا بزانرێت ڕووی لە کوێ کردووە، هەر چەندە هەندێک لە مێژوونووسان دەڵێن: لای ئیبراهیم ماوەتەوە، پاشان لە دوای وەفاتی ئیبراهیم ماوەیەک لەگەڵ ئیسحاق دا بووە پاشان ئەویش وەفاتی کردووە یاخود دەڵێن: بۆ بانگەواز بەرەو ناوچەکانی ئەنادۆڵ ڕۆشتووە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

(1) أَنَّ رسولَ اللّٰه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: رَحِمَ اللهُ لُوطًا كان يَأْوِي إلى رُكنٍ شَدِيدٍ ، و ما بعثَ اللهُ بعده نبيًّا إلا و هو في ثروةٍ من قومِه./ الترمذي، رقم ٨٣٧٣ و أحمد، رقم ٣١١٦.

## کۆی گشتی باسی لوط عَلَيْهِ السَّلَامُ

ژیانی حەزرەتی لوط عَلَيْهِ السَّلَامُ تەنها لایەنی زیادە ڕۆیی و ئاكاری پیسی بەدڕەوشتی ناو ئەو كۆمەڵگەیە زیاتر ڕۆشن كراوەتەوە، لەبەر ئەوەی ئەو كارە ئەوەندە قێزەونە چەندین جار خوای پەروەردگار نەشیاوی و دووری لە سرووشتی مرۆڤ لە قورئاندا باس كردووە بۆ ئومەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، لە ڕووی زیانەكانیەوە لە ناو كۆمەڵگەدا كاریگەریەكی زۆر خراپ بەجێ دەهێڵێت چ لە ڕووی كۆمەڵایەتی هەروەها لە ڕووی تەندروستیشەوە.

هەروەكو زیناكردنی نێوان ژن و پیاو مرۆڤ تووشی چەندین نەخۆشی كوشندە دەكات، لەو نەخۆشیانە (سفلس-زوهری-سەیلان-برینی شل و نەرم)، بێجگە نەخۆشی پێست كە تووشی چەندین دەرد و حەساسییەتی دەكات.

نێربازی دەبێتە هۆی لاوازی كۆمی مرۆڤەكە كە توانای پیسایی هەڵگرتنی بە خۆی نامێنێت و هیچ خۆڕاگری نییە لە كاتی پیسایدا و بە خۆیدا دەكات بێ ئەوەی لە توانا و ئیرادەی دا هەبێت، جگە لە نەمانی دەزوولەی خوێنی و گۆشت پارەی ماسولكە و چەندین دەردی وەكو هەوكردنی(الإلتهابات) كە كێم و جەراعەت فڕێ ئەدا، ئەو جێگایەش بە سرووشتی جێگایەكی پڕ میكرۆبی پیسە كە مرۆڤ هەڵی گرت تووشی چەندین نەخۆشی تر دەبێت، خوای گەورە هەرگیز ئاگادارمان ناكاتەوە لە شتێک كە زەرەر و زیانی زۆری نەبێت، ئەمەش هەر لە ڕەحمی خوای پەروەردگارە.

سزای نێربازی زۆر توندە لە قورئاندا كە خوای گەورە بۆی باس كردووین لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿فَجَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ﴾﴿٧٤﴾ الحجر

واتە: ئینجا شارەكەمان ژێرەوژوور كرد و بە سەنگڵ بەرد بارانمان كردن.

ئەم كارە قێزەونە هەركەس ئەنجامی بدات لە ئایینی ئیسلامدا هەڕەشەی زۆر توندی لەسەرە، دەبێت بەرد باران بكرێت، جا ئەگەر خاوەنی خێزان بێت، یاخود ڕەبەن بێت واتا بێ خێزان و زگورتی بێت، ئەمەش ڕای سێ ئیمامی شەریعەتە لە شافعی و مالكی و ئیمامی ئەحمەد، لەم بارەیەوە ئیمام ئەحمەد لە ئیبن عەباسەوە ئەویش لە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ

فەرموودەیەک ڕیوایەت دەکات و دەفەرموێت: هەر کەستان بینی ئەو کارەی ئەنجامدا، بکەر و کارلێکراو بکوژن[٢].

ڕای جیاوازی ئەبو حەنیفە لەم بارەیەوە دەڵێت: دەبێت لە شاخێکی بەرزەوە فڕێبدرێت و پاشان بەرد باران بکرێت وەکو چۆن بەرامبەر گەلی لوط خوای گەورە ئەنجامی دا بۆ بەهێزکردنی ڕاکەی ئەم ئایەتەی هێناوە، ﴿مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَۖ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٖ﴾هود

واتە: هەموو ئەو بەردانەی دیاری کراو بوون، لەلایەن پەروەردگارتەوە (کە بدا بەسەر تەوقە سەری کێدا) ئەم کارەساتەو ئەم بەرد بارانە وەنەبێ دوور بێ لەستەمکارانەوە (لە هەموو سەردەمێکدا).

پاشان: ڕێزگرتنی میوان لای پێغەمبەران و شوێنکەوتووانی واجبێکی زۆر گەورەیە، هەر وەکو چۆن حەزرەتی ئیبراهیم نەیناسین خێرا چوو ئاژەڵێکی بۆ سەربڕین.

بە هەمان شێوەش حەزرەتی لوط نەیزانی ئەو میوانانە مرۆڤ نین، ئەگەر چی زۆر قورس بوو بۆی بەڵام هەر میوانداری کردن، خوای گەورە بۆمان باس دەکات هۆکاری سەختی میواندارییەکە لەبەر بەدڕەوشتی ئەو گەلە بوو، چونکە دەیزانی خاوەنی چ بەها و نەریتێکی بۆگەنن، بۆیە فەرمووی: ﴿وَلَمَّا جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗا وَقَالَ هَٰذَا يَوۡمٌ عَصِيبٞ﴾ هود

واتە: کاتێ وەفدی فریشتەکانی ئێمە هاتە لای (لوط)، نارەحەت بوو پێیان، زۆر دڵتەنگ بوو چونکە لە شێوەی چەند لاوێکی پێکەوتوودا هاتن بە میوانی ئەمیش ئەیزانی هۆزەکەی شەڕیان پێ ئەگێڕن و خوڕەوشتیان خراپە و ناشتوانێ بەرگریان لێ بکات لەبەر ئەوە (لەدڵی خۆیدا) وتی: ئەمە ڕۆژێکی سەختە (منی تێ کەوتوم).

کە هاتن بۆ ئەنجامدانی کارە قێزەونەکە، ناچار هیچ توانایەکی نەبوو بۆیە وتی: ئەگەر دەسەڵاتم دەبوو خاوەنی هێز و عەشیرەت دەبووم ڕامدەگرتن، کەواتە ڕێزی میوان زۆر گەورەیە لە ئیسلامدا و لای پێغەمبەرانیش هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەر کەس بڕوای بە خوا و ڕۆژی قیامەت هەیە با ڕێز لە میوان بگرێت[٣].

---

[٢] أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- قَالَ: مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ.

[٣] مَن كان يؤمِنُ باللهِ واليومِ الآخرِ فلْيُكرِمْ ضيفَه أخرجه البخاري، رقم ٦٠١٩ و مسلم، رقم ٤٨.

پاشان: هۆکاری خێزانی لوط بەو سزایە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بڕوای بە پێغەمبەرایەتی لوط نەبوو، سەرزارەکی بە لوطی وتبوو کە بڕوای هێناوە، بەڵام درۆی کرد و مونافیق بوو، هەر بەم هۆکارە خوای گەورە لەگەڵ خێزانەکەی نوح دا بە خیانەت کار ناوی بردووە، ئەوان خیانەتی شاردنەوەی بیر و باوەڕیان کرد لە هاوسەرەکەیان ڕاستگۆ نەبوون بتپەرست بوون، هیچ پەیوەندی نییە بە خیانەتی هاوسەرگیرییەوە، ئەمەش ئەو ئەندازەیە کە لە قورئان و سوننەت وەرمانگرتووە لەم باسەدا کە ژیانی حەزرەتی (لوط)ە.

## مەملەكەتی دەیەم:

## ڕووداوی ژیانی حەزرەتی ئیسحاق و یەعقوب پێغەمبەر عَلَيْهِمُ السَّلَامُ

ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە ناوی ١٧ جار لە قورئاندا هاتووە،كوڕی حەزرەتی ئیبراهیمە، ناوی ئیسحاقە و كوڕەكەشی بە ناوی یەعقوب پێغەمبەر ١٦ جار ناوی لە قورئاندا هاتووە.

ژیانی ئەو دوو پێغەمبەرە ئازیز و بەڕێزە كە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەردووكیانی بە خاوەن كەرەم و ڕێز ناوبردووە لەگەڵ یوسفی كوڕیاندا فەرموویەتی: (كەریمی كوڕی كەریمی كوڕی كەریم) [٤].

ئیسحاق علیه السلام
فەڵەستین، نێوان دوو روبار (فەدات ئارام).
خەلیل (حبرون)

---

[٤] (إنَّ الكَريمَ ابنَ الكريمِ ابنِ الكريمِ) أخرجه البخاري، ٤٦٩٤.

ژیانی حەزرەتی ئیسحاق زۆر ناڕوونە، بێجگە ئەوەی کە لە قورئاندا بۆمان باس کراوە و هەنێک لە مێژوونووسانی ئیسلام، ژیانی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە و یەعقوبی کوڕی لە ئەهلی کیتابەوە گێڕاوەتەوە بۆمان ژیانیان یاداشت کردووە، ئەوەی جێگای سەرنجە لە هەندێک لایەنیەوە، لێرەدا باسی دەکەین و پاشان سەرنجەکانیش دەخەینە ڕوو.

حەزرەتی ئیسحاق مژدەی خوای پەروەردگار بوو بۆ خاتو سارای خێزانی حەزرەتی ئیبراهیم، کە ئەهلی کیتاب دەڵێن: لە تەمەنی ٩٠ساڵیدا ئەو کوڕەی بووە ئەو سەردەمەش تەمەنی حەزرەتی ئیبراهیم ١٠٠ ساڵ بووە، ئەهلی ئیسلام گومانمان لە پیری هەردوو لایان نییە، بەڵام ساڵەکان جێگای سەرنجە و لە قورئان و سوننەت ژمارەی باس نەکراوە، بە دڵنیاییەوە باسی پیری هەردووکیان کراوە لە سارا خاتوون و حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خوا لە هەموویان بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوا۟ سَلَـٰمًا ۖ قَالَ سَلَـٰمٌ ۖ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۚ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَـٰهَا بِإِسْحَـٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَـٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتْ يَـٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَـٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۖ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَـٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴿٧٣﴾﴾ هود

واتە: بێگومان وەفدێکی فریشتە هاتە لای ئیبراهیم بەمژدەوە (مژدەی بوونی منالێک)، وتیان: سەڵاوی خوات لێبێت، ئەمیش وتی: سڵاوی خوا لە ئێوەش، (دوای بەخێرهاتینیان ڕۆشت و) زۆری پێ نەچوو گەڕایەوە بە گۆشتی گوێرەکەیەکی برژاوەوە﴿٦٩﴾ کاتێ (ئیبراهیم) بینی دەستی بۆ نابەن، پێی ناخۆش بوو، گومانی خراپی لێ کردن، لەدڵی خۆیدا لێیان ترسا، ئەوانیش هەستیان پێ کرد و پێیان وت: مەترسە، ئێمە نێردراوین بۆلای قەومەکەی لوط﴿٧٠﴾ خێزانی پێغەمبەر ئیبراهیم وەستابوو (لە خۆشی مژدەکە)، (خوای گەورە فەرمووی) ئێمەش مژدەمان دایە کە (ئیسحاق)ت پێ دەبەخشین و لەدوای ئەویش (یەعقوب، لەنەوەی ئیسحاق دەبێت)﴿٧١﴾ خێزانی ئیبراهیم پێغەمبەر وتی: (شەرمەزار خۆم) چۆن منالّم دەبێت من پیر بووم و ئەمەش مێردەکەمە، پیرو بەساڵا چووە، بەڕاستی ئەمە شتێکی سەر سوڕهێنەرە ﴿٧٢﴾ فریشتەکان وتیان: ئایا سەرت سوڕ دەمێنێ لە فەرمان و کاری خوا، ڕەحمەت و بەرەکەتی خواتان لێ بێت ئەی خێزان و ماڵی پێغەمبەر، بێگومان خوای گەورە کاری وا دەکات، هەمیشە سوپاسکراوەو خاوەنی بەرزی و دەسەڵاتیشە﴿٧٣﴾.

هەر چەندە لە ژیانی پێغەمبەر لوط دا ئاماژەی ئایەتەکان کراوە بۆ حەزرەتی ئیسحاق لێرەدا بەم ئایەتەی تر وەکو بەڵگە زیاتر درێژی ناکەینەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ وَبَٰرَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ إِسْحَٰقَ ۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ مُبِينٌ ﴿١١٣﴾﴾الصافات

واتە: مژدەی هاتنە دنیای (ئیسحاق)یشمان پێ بەخشی کە ئەویش پێغەمبەرێکە لە چاکان ﴿١١٢﴾ بەرەکەتیشمان دابەزاندە سەریان و خستە ناو نەوەکانیەوەو منداڵمان زۆر کردنە نەوەی ئەمانیش هەبووە چاکەکار بووە، وە هەیشبووە تاوانبارو خراپەکار بووە﴿١١٣﴾.

ئەم پێغەمبەرە ئازیزە لە نێوانی شام و حەران دا گەڕاوە و بانگەوازی کردووە بۆ خواپەرستی و چاکەخوازی، خێزانی ناوی (رفقە) خەڵکی ناوچەی حەران-ە و کچی (بتوئیل کوڕی ئیلیاس)ە، خێزانی لە تەمەنی چلساڵیدا سکی کردووە و دووو منداڵی بووە واتا (دوانەیەکی بە یەکجار بووە) هەردوو منداڵەکە کوڕ بوون، ناویان(عیصو و یەعقوب)ە، ئەهلی کیتاب دەڵێن: عیصو پێش یەعقوب لە دایک بووە، یەعقوب دەستی بە قاچ و پشتی عیصوی برای بووە گوایە بۆیە ناونراوە بە (عقب) گوایە یەعقوب لەوە هاتووە.

لێرەوە چیرۆکەکە دەست پێدەکات لە ژیانی یەعقوب و عیصو، عەرەب بە عیصوی دەڵێن: (العیص)، گوایە دایکیان یەعقوبی خۆشوویستوە بە هۆکاری ئەوەی لە عیص بچووکتر بووە، باوکیشی عیصوی خۆشویستووە لەبەر ئەوەی کوڕە گەورەیەتی، ناوی عیصو بەواتا سورفل و قژ زەردباودێت ئەم بەسەرهاتەی کە دەیگێڕمەوە لە تەورات دا (سفری تکوین ٢٤-٢٧) باسەکە هاتووە هیچ پەیوەندی بە قورئان و سوننەتەوە نییە، ئەگەر چی زانایانی ئیسلامی و مێژوونووسان و ڕاڤەکاران لە پەرتوکەکانیاندا ئاماژەیان پێداوە، هەروەکو ئاماژەم پێداوە هەموو لە تەورات وەرگیراوە.

کاتێک یەعقوب و عیصو گەورە دەبن و باوکیان بەساڵادا چووە، چاوی زۆر لاواز و نابینا بووە، حەز لە گۆشتی برژاو و کەباب دەکات، دەیەوێت دوعای موبارەکی یاخود پێغەمبەرایەتی بۆ ئەو کوڕەی بکات کە بتوانێت ڕاو بکات و لە گۆشتی ئەو ڕاوە بخوات و نزاکە ببێتە موڵکی ئەو کەسەی کە ڕاوەکە دەکات.

دایکیان گوێی لەم وتانە دەبێت بە عیصو دەڵێت: حەزرەتی ئیسحاق خێرا مەڕێک سەر دەبڕێت و گۆشتەکەی ئەداتە دەستی یەعقوب و جلک و بەرگی عیصو لەبەر دەکات، دەچێتە لای باوکی گوایە باوکی دوعاکە بۆ یەعقوب دەکات و پاشان عیصو توڕە دەبێت سوێند دەخوات یەعقوبی برای بکوژێت ئەمە پوختەی ڕووداوەکەیە، هەرچەندە بە جۆری تریش هاتووە، بەڵام

بە گشتی هەمووی هاوشێوەی ئەم باسەیە کە لێرەدا بۆم یاداشت کردوون ئەگەر سەرنج بدەین، گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە لە فەرمایشتی خوای پەروەردگار ناچێت لە تەوراتدا، پاشان کارەکەش لە کاری بنەماڵەی پێغەمبەران ناچێت، وەکو چیرۆکی بەر ئاگردانی ئاغا و کوڕەکانی یان جوتیارێک و دوو کوڕەکەی...هتد.

سەرەتا خۆشەویستی هەردوو منداڵەکە دوانەن کێ لە پێشەوە هاتووە یان دواکەوتووە چەند ساتێک، ئەوە ناکاتە ئەوەی دایک و باوک جیاوازی و خۆشەویستی لە نێوان گەورە و بچووکدا بەو شێوەیە بکرێت، پاشان هەڵبژاردنی پێغەمبەر لە لایەن خوای پەروەردگارەوەیە، نەک بە دوعای پێغەمبەران، خوای گەورە پێغەمبەران هەڵدەبژێرێت، پاشان ئەوانەی کە دەبن بە پێغەمبەر شەڕ لەسەر پێغەمبەرایەتی ناکەن.

خیانەت چۆن لە دوعا کردن و لەبەر خاتری کەباب و گۆشت دەکرێت و لە پێناوی گۆشت و کەبابدا پێغەمبەر هەڵبژێررێت، هەموو ئەم باسانە دەستی نووسەرێکی زۆر چیرۆک نووسی قەدیمی پێوە دیارە، ئەمە نە فەرمایشتی خوایە نە ژیانی پێغەمبەرێکی ئازیزە، دوورە لە وەحییەوە.

کەواتە دەر ئەنجام چیە؟

کاتێک کە باسی مێژوویەکی ڕاستی ناڕووندەکرێت بە تەواوەتی گۆشەکانی زانستی مێژوو دەتوانێت لە ڕێگای ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایین تا ڕادەیەک سەرەداوێکی دەست بکەوێت، یاخود لە پاشماوەی دێرین و یان ئەو نووسینانەی باسیان کردووە، ئێمەش لەم کتێبەدا ئاماژەمان پێداوە، ئەگەرچی مێژووەکە ناوی تەوراتە، ڕاستە کەلامی خوای گەورەیە بەڵام بۆ ئێمە بووە بە مێژوو، لەگەڵ ئەوەشی کە بۆتە مێژوو دەستکاری کراوە، خوای پەروەردگار لە قورئاندا بۆی باس کردووین.

ئەوەی کە لێرەدا دەمەوێت باسی بکەم هەر گریمانە کە دەمەوێت مەعریفەتی ڕاستی و دروستی پێغەمبەرایەتی ئیسحاق و یەعقوبی بدۆزینەوە، دەرئەنجامی سەرەتای بنەڕەتی قورئان و سوننەتی پێغەبەری نازدارە ﷺ، سەرەتا وتمان کە ژیانی پێغەمبەران لە ڕووی بانگەوازەوە تا ڕادەیەکی زۆر هەموو لە یەک دەچن، هەموو بانگەوازی یەکتاپەرستی و لەخواترسان و خۆپارێزی لە تاوان و باوەڕبوون بە ڕۆژی قیامەت و کارکردن بۆی، ئەم دوو پێغەمبەرە بەڕێزە کە کوڕ و باوک و باپیر و نەوەکانی داهاتوووشیان هەموو هەر پێغەمبەرن، بەڵام لە سەردەمی سێ پێغەمبەردا ژیاوە، کە کاریگەری زۆریان لەسەر ناوچەکە داناوە، چونکە ئەم پێغەمبەرانە ئەگەر چی لە ژیاندا بوون یان هەموو گەلەکە گوێی بۆ گرتوون وەکو ئیسماعیل یان لە ناو چوون وەکو لوط، یان بەردەوام بووە لە گەڕان و هیجرەت بە بانگەوازەکەیەوە وەکو

حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خوا لە هەموویان بێت، کەواتە درێژە پێدەری ڕێگای ئەو موبارەکانە ترە کە باوانیەتی.

پاشان بە هۆکاری بانگەوازی حەزرەتی ئیبراهیم و ناوناوبانگی خەڵکێکی زۆر لە وڵاتان و شاران ئایینی ئیسلامی حەنیفی، بە بەڵگەی ئەوەی کاتێک یوسف لە زیندان ئازاد دەبێت یەکێک لە هۆکاری ئەوەی کە دەچێتە پلەی وەزیری بە هۆکاری شەو و ڕۆژێک نەبووە، بەڵکو خێزانی هیکسۆس دەزانن کە ئەم کوڕە لە بنەماڵەی پێغەمبەرانە، بانگەوازەکەی بانگەوازی ئیبراهیمیە، باوباپیرانی ناوناوبانگی پێغەمبەرایەتیان هەیە خاوەنی نفوس و خەڵکی شوێنیان دەکەون زیاتر لە مەعبەد و تەمپڵەکانی تری بتپەرستەکان.

کەوایە حەزرەتی ئیسحاق یەکێکە لە پێغەمبەرە چالاکەکان کە بەردەوام لە بانگەواز دابووە لە شوێنانی ئەنادۆڵ و شامدا درێژەدەری ڕێگای باوکی بووە و بانگەوازی یەکتاپەرستی بڵاو کردۆتەوە.

تەنانەت چوونی یەعقوبی کوڕی بۆ زێدی باوباپیرانیان لە شاری ئوور لە خوارووی عێراق و هیچ پەیوەندی نەبووە بە ترسی براکەی بەڵکو بە پێچەوانەوە هۆکاری چوونی بانگەواز بووە بۆ ئەو ناوچە، کە گوایە نازناوی (ئیسرائیل)ی وەرگرتوە بە مانای بە شەودا ڕێگای بڕیوە بەڕۆژدا پشووی داوە، ئەمەش پیشەی بە تەنها حەزرەتی یەعقوب نەبووە، بەڵکو هەموو کەسێک یان کاروانەکان بەو ناوچەیەدا لەبەر گەرمای ڕۆژ بە شەودا ڕێگایان دەبڕی و بە ڕۆژدا پشویان ئەدا لە ژێر سێبەری بەرد و دەوارەکانیاندا.

هەرچەندە لە بنەڕەتدا وشەی (ئیسرائیل) واتا بەندەی خوای گەورە بە عیبری، ئەوەش زیاتر ڕێگای تێدەچێت.

چوونی بۆ ئەو ناوچەیە بێجگە بانگەواز و بانگکردنی خەڵکی بۆ خواناسی، هەروەها لە ماڵی باوان و خاڵوانی خێزانی پێکهێنا، جا کۆمەڵێک دەڵێن: لە حەڕان لە ماڵی خاڵوانی و پێشتریش لە ئوور لە بنەماڵەی باوانی حەزرەتی یەعقوب خاوەنی چوار خێزان بووە (خاتوو لیا و خاتوو راحیل) لە دوای مەرگی لیا خواستوویەتی، هەندێک لە ئەهلی کیتابەوە وەرگیراوە کە گوایە لە یەک کاتدا هەردوو خوشکەکەی خێزانی بوون ئەمەش بە دوور دەزانم، چونکە دوورە لە ئاکار و ڕەوشتی پێغەمبەران، گوایە لە تەورات دا ئەو شەریعەتە هەڵوەشاوەتەوە.




دوو هاوسەرەکەی تریشی بە ناوی (زولفی و بلهی) گوایە هەریەکە و لە جاریەی لیا و راحیل بوون لە داخی یەکتری پێشکەش بە یەعقوبیان کردووە، ئەمەش قسەیەکی زۆر بەتاڵە، چونکە سرووشتی هەموو ئافرەتێک وایە حەز ناکات لە خۆی زیاتر هاوسەرەکەی خاوەنی ژنی تر بێت، خۆ ئەگەر بوو حەز بە زیاد بوون ناکات چونکە کاریگەری لەسەر خۆی زیاد دەکات.

جا لەبەر ئەو مونافەسەی کە جوولەکە دروستی کردووە لە مێژووی پێغەمبەراندا، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەوەکانی ئەم منداڵانەی یەعقوب کە لە داهاتوودا باسیان دەکەین بە پشتیوانی خوا، گوایە ئەو دوو خێزانەی تری یەعقوب جاریەی (لایان) بوون باوکی لیا و راحیل پێشکەشی کچەکانی کردووە، کچەکانیشی پێشکەشی یەعقوبیان کردووە!

بەهەرحاڵ لەم چوار خێزانەی چەند منداڵێکی هەبووە کە ١٢یان کوڕ بوون

لە لیا: ڕوبیل، شەمعون، لاوی، یەهوزا، یاساکر و زابلون

لە راحیل: یوسف و بنیامین

لە بەلهی: دان و نیفتالی

لە زولفي: جاد و عەشیر

ئیسحاق و یەعقوب و براکەی عیصو بە تەواوەتی فەرمانڕەوای قودس و خەلیل بوون کە ئەو دەمە ناسراو بوو بە ئۆرشەلیم و ناوچەی ساعیر، هەروەها ئیسحاق و یەعقوب و عیصو بونیادی مزگەوتی قودسیان کردووە پاشان داوود و سولەیمان نوێی دەکەنەوە...

ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات بنەماڵەی حەزرەتی ئیبراهیم، بنەماڵەی پێغەمبەر و پاشان فەرمانڕەوایان خاوەنی خەڵک و موڵک و سامان و بەندە و کەنیزەک بوون.

هەر ئەم دەسەڵات و توانایانە کە خوای گەورە هەڵیبژاردوون تا ببنە گەلی هەڵبژاردە، نەک لەبەر ئەوەی خەڵکەکەی زۆر باشە و پاکە، نا لەبەر ئەوەی پێغەمبەرانیان زۆر باش و بانگەوازی جیهانیان کردووە بۆ یەکتا پەرستی کە ئەو بابەتەش لە کاتی خۆیدا باس دەکەین .

پاشان حەزرەتی ئیسحاق کۆچی دوایی دەکات و لەو جێگایە دەنێژرێت لە خاکی کەنعان، لە جێگایەکە بە ناوی (حبرون) لەگەڵ باوکی لە ئەشکەوتێکدا نێژراون کە حەزرەتی ئیبراهیم ئەشکەوتەکەی کڕیبوو بۆ بنەماڵەکەی، کە مردن لەو جێگایەدا بیاننێژن و بە خاکیان بسپێرن.

خوای گەورە لە وەسفی ئەم سێ پێغەمبەرە دەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرۡ عِبَـٰدَنَآ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَـٰقَ وَيَعۡقُوبَ أُوْلِي ٱلۡأَيۡدِي وَٱلۡأَبۡصَـٰرِ ۝٤٥ إِنَّآ أَخۡلَصۡنَـٰهُم بِخَالِصَةٖ ذِكۡرَى ٱلدَّارِ ۝٤٦ وَإِنَّهُمۡ عِندَنَا لَمِنَ ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ۝٤٧﴾ص

واتە: ئەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ باس و یادی بەندە بەڕێزەکانمان ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب بکە، هەموویان دەستێکی باڵایان هەبوو لە گەیاندنی ئایینی خوادا، دەستێکی باڵایان هەبوو لە چاکە و چاکەکاریدا، هەروەها بەرچاوڕوونی و شارەزایی تەواویان هەبوو لە هەموو ڕوویەکەوە۝٤٥ ئێمە بەڕاستی کردمانن بە بەندەیەکی تایبەتی خۆمان بەهۆی سیفەتی دنیانەویستی کە ئەویش یادەوەری ڕۆژی قیامەتە۝٤٦ بەڕاستی ئەوانە لای ئێمە لەو کەسانەن کە هەڵمان بژاردوون و پەسەندمان کردوون ۝٤٧

## کۆی گشتی باس

خوای گەورە لە حەزرەتی ئیبراهیم لە ئیسحاقی کوڕی و پاشان یەعقوب کۆمەڵێک پێغەمبەر بۆ گەلی ئیسرائیل دەنێرێت، خۆ گەلی ئیسرائیل ئەوەندە زۆر نەبوون، بەڵکو لە ڕێگای گەلەکە و پێغەمبەرەکەیانەوە کە بانگەوازی جیهان بکەن، ئەم ئیمتاز و جیاکارییە وای کرد لەم گەلە کە خوای پەروەردگار بیانکاتە گەلی هەڵبژاردوو، نەک بە هۆکاری لاشە و مێشکیان، نا- بەڵکو بە هۆکاری ئەوەی کە بانگەوازی جیهان دەکەن، ئەم بە جیهان بوونی بانگەوازی بەنی ئیسرائیل تەنها بۆ یەک جێگا نەبووە، بەڵکو لەسەر گەلەکە پێویست بووە کە بڕۆنە ناوچەکان و دینداری بڵاو بکەنەوە بەجێی بهێڵن، هەر ئەمەش وای کردووە کە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل لە ناوچەکانی دنیادا بڵاو ببنەوە، دانیال لە بابل و یونس لە نەینەوا و میخا لە ئەوروپا و بەهەموو جێگاکاندا بڵاو بوونەتەوە، لە ئێستادا یەهود تەنها بڕوای بە ٤٨ پێغەمبەر هەیە و نەسرانیش بە ١٦ پێغەمبەر، هەموو پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل لە کوڕانی یەعقوبەوە هاتوون کە پێیان دەوترێت (سبط) واتای (کوڕ) دێت، یان (نەوە) واتا کوڕی کوڕەکەی (الأسباط) واتا نەوەکان کە پێغەمبەرانن لە کوڕانی یەعقوبن سەلامی خوا لە هەموویان بێت.

سەلامی خواش لە هەموو کوڕانی یەعقوب بێت.

لە ناو ئەم ١٢ نەوەیە هەر یەکە لە ئێستادا خاوەنی مەزهەبی تایبەتی خۆیەتی، لەناو بنەماڵەی یەهوزا دەبوو هەمیشە پادشا بوایە، لە بنەماڵەی لاوی دەبێت پێغەمبەران بێت، هەر یەکە و لە شوێنکەوتووانی شتێکیان بۆخۆیان پچڕی بوو، پێغەمبەرانی نەوەکانی ئیسرائیل بریتین لە ئیبراهیم، ئیسحاق، مووسا، هاروون، یەشوع، فینحاس، ئەلقانە، عالی، صامۆئیل، جاد، ناتان، داوود، سولەیمان، یەعرو، میخا کوڕی یەملە، عوبادیا ئەخیای شیلۆنی، یاهو کوڕی خانی، عەزریا کوڕی عودید، یەجزەئیل کوڕی زەکەریا، ئەلیەعزر کوڕی داووداوا، هۆشع، عاموس، میخای مورشتی، ثاموص، ئیلیای تەشبی، یەشەعی کوڕی شافاط، یونانی کوڕی مەتا، کە مەبەستیان (یونسە)، ئەشعیا، یوئیل، ناحوم، حبقوق، حەفنیا، ئەوریا کوڕی شەمعیا، ئەرمیا، حزقیال، شەمعیا باروخ کوڕی نیریا کوڕی مەحسیا، تیریانی کوڕی مەحسیا خۆی کە ناسراوە بە (ئەبو باروخ)، سەرایا، مەحسیا ناسراو بە (ئەبو تیریا) حەججی، زەکەریا، ملافی، مەردخای کوڕی یائیر، صفنیا، عبودیا ناسراو بە (ئەبو عەزریا)، حەنانی ناسراو بە (ئەبو یاهو)...

ئیتر لە هەندێک مەزهەبیاندا یوسف بە پێغەمبەر دەزانن، هەندێکیان ڕەتی دەکەنەوە یوسف پێغەمبەر بووبێت، لەگەڵ چەند پێغەمبەرێکی تر.

ئەوانەی کە لە قورئاندا ناویان هاتووە بە دڵنیاییەوە جێگای باوەڕی ئێمەن، ناوی ئەم پێغەمبەرانەش، ئەگەر پێغەمبەربن ئەوا سەلامی خوایان لێبێت و خۆ ئەگەر واش نەبوو، ئێمە

وەکو موسڵمان وەکو خۆی دەهێڵینەوە و باسی دەکەین نە بڕوای پێدەکەین نە بە درۆشی دەخەینەوە، پێغەمبەرانی نەسرانی بریتین لە ٤ پێغەمبەری گەورە و ١٢ پێغەمبەری بچووک، گەورەکان (دانیال و حزقیال و ئەشعیا و إرمیا ) ئەم چوارە گەورەکانیانن ئەوانیتر بریتین: لە هوشەع، یوئیل، عاموس، عوبدیا، یۆنان(یونس)، میخا، ناحوم، حبقوق، صفنیا، حەجی، زەکەریا، ملاخی.

ئەمانیش بە گوێرەی مەزهەبەکانیان جیاوازی دەکەوێتە نێوانیان و تەنانەت خودی زەمەنەکانیشیان.

ئەمانە و بە دڵنیاییەوە زۆر لەمانەش زیاتر دەکەونە ناو و نازناوی (الأسباط) کە لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە، هەروەکو ئاماژەمان پێدا بە گوێرەی قۆناغی سەردەمەکان کە جێگای بڕوا نییە، زۆرجار جیاوازی زۆر گەورە لە نێوانی ئۆرتۆدۆکس و پرۆتستانت و کاتۆلیک و هەریەک لەمانەش دابەش دەبن بۆ توێژ و مێژوو و گۆرانی و دروشمی تایبەت بە نەسرانی و ژیانی بەنی ئیسرائیل.

ئەمەش کورتەی باسی پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل لە ئەسباطەکان کە نەوەی حەزرەتی یەعقوبن.

هەروەها حەزرەتی یەعقوب تووشی نارەحەتی دەبێت، بە هۆکاری سەرکەشی بەشێک لە منداڵەکانی، لە ناوخۆیاندا بڕیاری لەناو بردنی برایەکیان دەدەن کە لە دایکەوە جیاوازن، هەروەها هۆکاری سەرکەشی منداڵەکانی دەبێتە ئەنجامی ئەوەی کە لە وڵاتی میسر ببنە خاوەنی هێز و دەسەڵات، یەعقوب بەو هۆکارە چاوی کوێر دەبێت و ئەو کوڕەی کە پلانی دژی دەگێڕن ناوی یوسف-ە، هۆکارەکەشی پێدەچێت بگەڕێتەوە بۆ جیاوازی چینایەتی نێوان دایکیان، کە لە چوار دایکی جیاواز بوون، کورد دەڵێت چوار بەرەبابن، هەرچەندە بەرە باب لە هەندێک ناوچەدا بە واتای منداڵی برا دێت، بەڵام لە هەندێک ناوچەی تردا، بە واتای بەرە باب یەک باوک و چەند دایکێک دێن.

ژیانی یەعقوب لایەنێکی تری ڕووداوەکانی ژیانی لە بەسەرهاتەکان و ڕووداوەکانی یوسف زیاتر دەخەینە ڕوو.

پێش وەفاتی یەعقوب وەسیەتی کرد کە بیگەڕێننەوە بۆ ئەو جێگایەی کە باوک و باپیرانی لێ نێژراوە، لەسەر وەسیەتی خۆی حەزرەتی یوسف باوکی گەڕاندەوە بۆ وڵاتی شام لەو ئەشکەوتەدا ناشتیان کە حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسحاقی تێدا نێژراوە.

مێژوونووسان کارە سەرەکییەکانی ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕەکانی هەڵکەندنی بیری ئاو بووە لە ناوچە بیابان نشینەکان، هەوڵی زۆریان داوە لە زۆربەی بیابانی

ئەردەن و حیجاز و پاشان نێوانی حیجاز و شام دا بیری زۆریان هەڵکەندووە، کەواتە بێجگە کاری بانگەواز، هەمیشە خەریکی کاری خزمەتگوزاری بوون لە ناوچەکەدا، ئەمەش هۆکارێکی تر بووە کە ئەو بنەماڵە بەناوبانگ و خۆشەویست بوون لە ناو خەڵکیدا، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات لەگەڵ بانگەواز و بڵاوکردنەوەی شەریعەتدا کاری خزمەتگوزاری پێویستە.

# مەملەکەتی یانزەیەم:
# ڕووداوەکانی ژیانی یوسف پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ

ناوی حەزرەتی یوسف لە قورئاندا ٢٧ جار هاتووە ٢٥ جاریان تەنها لە سورەتی یوسف دا هاتووە، هەروەها لە سورەتی (غافر و الأعراف) دا ناوی هاتووە.

پێش چوونە ناو باسی ژیانی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە، هۆکاری باسکردنی لە قورئاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم سەردەم و زەمەنەی کە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە کۆتاییەکانی بانگەوازی لە شاری مەککەدا دەگوزەراند، لەو پەڕی ناڕەحەتی و ناهەمواری و خێزانی وەفاتی کردبوو کە سەنەدێکی عاطفی بوو، پاشان ئەبوطالیب مردبوو ئەرشیفی سەنەدێکی گەورەی هێز و پاراستنی پێغەمبەر بوو لە دەسەڵاتدارانی قوڕەیش، لە ژیانی ئەم پێغەمبەرەدا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ ڕووداوەکانی هاوشێوەی ژیانی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، هەڵبەت کت و مت لە ڕووداوەکاندا نە، بەڵکو لە ئازار و ناسۆر و دووری و دەربەدەری و ناڕەحەتییەکانی، ئەم سورەتە کە ناوی یوسفە، بە یەکجار دابەزیوە، لایەنەکانی ژیانی یوسفی تێدا باسکردووە، خوای موتەعال بۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نارد تا سەبووری دڵی بدات، کۆتاییش بۆ ئیماندار و سەربەرزی دنیا و قیامەتە.

لە ئێستادا کە ئەم باسە دەنووسم لە زینداندا بۆ منیش هەمان ئەزموونە، زۆر سەبووری ئەدات بە دڵ و دەروونم، ئەوانەشی کە پابەند بوون بەم دینەوە لە زیندانەکانی نەرویج و ئیطالیا ناسیومن، هەمان حاڵەتیان هەبووە لەگەڵ ئەم سورەتە دا، تەنانەت کۆمەڵێک برا لە ئیطالیا هەڵسان بە لەبەرکردنی ڕووداوەکانی موعجیزەیەکی زۆر عەجیبە، گونجاوە لەگەڵ ژیانی هەموو کەسێکدا جا چ لە زیندان بێت، یان دووری وڵات، دور لە کەسەکان، زۆربەی کێشەی سیاسی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و ئابووری زۆربەی سیستەمەکانی لە خۆی گرتووە.

لە کاتی خوێندنەوەی ئایەتەکانی ئەم سورەتە ئیحساسێکی زۆر عەجیبت پێ دەبەخشێت، لە ناو ناسۆری باوک و کوڕ و زوڵم و زۆری ناو ئەم باسە، هەموو ئازارەکانی خۆت لە بیر دەکەیت، گەورە و بچووک لە هەموو سەردەم و زەمەنێکدا و تا ڕۆژی قیامەت، حەز بە باسی سەردەمی ئەم ڕووداوە دەکەن کە خوای موتەعال بە وەحی ناردوویەتی بۆ پێغەمبەری ئازیز، ئەم سورەتە سارێژی خەم و ئازاری پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوو ئیتر چۆن سارێژکەری خەمی ئێمە نییە.

خوای پەروەردگار لە قورئاندا لەسەر زمانی کەسێکی میسری بۆ دەست و پێوەندی فیرعەونی دەڵێت: ﴿وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ٣٢﴾غافر

واتە: ئەی قەوم و هۆزم من دەترسم لە ڕۆژی هاوار و ئاهو ناڵە و بانگکردنتان.

خوای پەروەردگار بە سورەتی یوسف (تەحەددای عەرەبی) پێکردووە، بەڵام لە ناوەخنیشدا و لە باس و گێڕانەوەی ئەو مێژووەدا، هەموو جوولەکە و نەسرانی دوواندووە، لە ڕاستیدا تەحەدداکە بۆ ئەهلی کیتابە لە دوای عەرەبی جاهیلی، هەڵبەت کە تەمەشای پەیمانی کۆنم کرد واتا تەورات بەشی سفری تەکوین، لە ڕووی ماناوە جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە، هەر چەندە لە زۆر جێگادا بیستبووم کە گوایە لە تەورات دا نووسراوە یوسف لەگەڵ خێزانی عەزیزدا خەوتووە، بەڵام ڕاست نییە و شتی وای تێدا نییە و هەر کەس وا بڵێت ڕاست ناکات و درۆزنە.

بەهەر حاڵ بۆیە ئەوەم خستە ڕوو، بۆ ئەوەی هەرگیز مرۆڤی موسڵمان لە خۆیەوە بێ بەڵگە و سەرچاوە قسە نەکات، چونکە ئەگەر کەسێک بڵێت لە تەورات نووسراوە یوسف پەنا بە خوا زینای کردووە، پاشان کەسێکی تر تەماشای تەوراتی کرد، ئەوا موسڵمانان بە درۆزن تەماشا دەکەن، پێویستە لەسەر دەقەکان ڕاستگۆ بن، بەڵام لە سفری تەکوین دا بە بەراورد لەگەڵ قورئان دا، لە قورئان دا لە ١١ لاپەڕەی نووسینی خەتی عوسمانی ( خط عثماني) جێگای ئەم سورەتە بۆتەوە، کە بەراوردم کرد لەگەڵ سفری تەکوینی پەیمانی کۆن، چاپی میسر بە زمانی عەرەبی، زیاتر لە ٤٠ لاپەڕە باسی یوسف-ە، هەر هەمان واتای قورئانی هەیە!

ئەمەش شتێک نییە لە زانایەکم وەرگرتبێت، نا- بەڵکو خودی خۆم لە زینداندا بەراوردەکەم کردووە، سەر ئەنجام ئەوەت بۆ دەردەکەوێت، کە نووسینی تەورات لە ئێستادا گۆڕاوە، بەڵکو دەست نووسی مرۆڤە، قورئانیش ئەگەر عەرەبی زان بیت، ئەوەندەی تر سەرسامت دەکات بە وشە و شیتەڵکاری باس و دەنگی ڕیتمی مۆسیقای وشەکان، لەرە و مەحزونی وشە و جوانی وشە و خۆشی وشە لەو سورەتەدا و بە گشتی لە قورئاندا بەدی دەکرێت، بێجگە ئەوەی لە تەورات دا مەبەستم ئەو باسەیە لەسەر یوسف پێغەمبەر عَلَيۡهِ السَّلَامُ جیاوازی لە نێوان پادشا و فیرعەوندا ناکات، گومانی تێدا نییە کە هەڵەیەک هەبوو بە ناوی کەلامی خوا، کەواتە هەموو پەرتوکەکە هەڵە دەردەچێت، چونکە نابێت خوات موتەعال هەڵە بکات، لێرەدا دەڵێم پاک و بێگەردی بۆ خوا، حاشا خوا هەڵە ناکات، بەڵکو ئەوە جوولەکە و نەسرانییەکانن بە ناوی خواوە نووسین هەڵ ئەبەستن.

سەراپای مێژووی یوسف عَلَيۡهِ السَّلَامُ قورئانییە و هەمووڵاکانی لە قورئاندا بۆمان دیاری کراوە، سورەتێکی تایبەت بەو پێغەمبەرە کراوە، خوای موتەعال هەر ناوی جەنابیانی لێ ناوە، کەواتە چەندە باسەکە لە لایەنی-نووسەرەوە- بە مێژوو باس بکرێت، بەڵام ڕاستەوخۆ دەبێتە تەفسیری

قورئان، بێ ویستی بەندە-ماکوان- خوای گەورە لێم خۆشبێت و بە هەڵە لێموەرنەگرێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەر کەس بە ئارەزووی خۆی قورئان تەفسیر بکات با جێگایەک لە ئاگردا بۆ خۆی هەڵبژێرێت، منیش زۆر دەترسم بەر ئەو هەڕەشەیە بکەوم خوای گەورە قەڵەمی عەفووی بەسەر تاوانەکانماندا بهێنێت.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ۝ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ۝ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ۝﴾ یوسف

واتە: ئەم ئایەتانەی (کە ڕەوانەمان کردووە لەم سورەتەدا) بەشێکە لەو قورئانە ڕوون و ئاشکرایە ۝ ئێـمە ئەم ئایەتانەمان دابەزاندووە لە شێوەی قورئانێکی پاراودا بە زمانی عەرەبی بەڵکو لێی تێبگەن و ژیریتان بخەنە کار ۝ ئێـمە چاکترین چیرۆک و بەسەرهاتت بۆ دەگێڕینەوە (ئەی محمد ﷺ) لە ڕێگەی (وەحی)و نیگامانەوە، لەشێوەی ئەم قورئانەدا، هەرچەندە تۆ پێش ئەم باسە لەم بەسەرهاتە بێ ئاگا بووی ۝.

خوای پەروەردگار بەم پیتانە قورئانی ناردووە بۆ پێغەبەری نازدار ﷺ، لەهەر ئایەتێک کە کەمتر ئەحکامی یاسای لە خۆ گرتووە و واتا زیاتر ڕووداوی مێژووی هەروەها بیروباوەڕە، بەم پیتانە دەست پێدەکات، هۆکارەکەیشی بێجگە ئەوەی کە زانایانی تەفسیر زۆر جوان شیکردنەوەیان بۆ کردووە، بە تایبەت (ئیبنو قەییم)، بەڵام لە ڕاستیدا ئاگادار کردنەوە سەرنج ڕاکێشانە بۆ لای سورەت و ئایەتەکان، بۆ نموونە ( النساء، المائدة، الأنعام، الأنفال، التوبە، الحج، المؤمنون...هتد) ئەمانە زۆرترین ئەحکامیان لە خۆ گرتووە باسەکان زیاتر لە یاسا تەشریعەکاندا خۆی دەبنێتەوە، بەڵام خۆ سورەتی (البقرة، آل عمران، مریم...هتد) ڕاستە ئەحکامی شەرعی لە خۆ گرتووە بە دڵنیاییەوە، بەڵام زۆرینە باسی مێژوو و ڕووداوەکانی پیاوچاک و خراپەکانە بۆیە لەو دەرئەنجامەوە تەماشای دەکەم کە زیاتر ئاگادار کردنەوە بێت بە وشە وەکو زەنگێک، چونکە کاتێک کە (نضری کوڕی حارس) چوو بۆ وڵاتی فارس تا دژی پێغەمبەر ﷺ چیرۆکی ڕۆستەم و ئەسفەندیار بهێنێت و پاشان ئافرەتی فارسی سەماکەری هێنا بۆ شاری مەککە لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ قورئانی دەخوێند (نضری کوڕی حارس) ئافرەتەکانی دەخستە سەما و چیرۆکی ڕۆستەمی زاڵ و ئەسفەندیاری دەخوێندەوە!

قورئان دژ بەو ڕاگەیاندنەی قوڕەیش بەم پیتانە سەرنجی عەرەبی ڕادەکێشا بۆ ئەوەی گوێ لە قورئان بگرن، (والله أعلم).

لێرەدا وەکو وتمان تەفسیر ناکەین- باسێکی مێژووی دەگێڕینەوە.

پاشان لە چوار چێوەی ئەم پیتانە خوای گەورە دەفەرموێت: قورئانێکم یاخود کتێبێکم بۆ ناردوون ڕوون و ئاشکرایە لەبەر دەستاندایە عەرەب، بەڵام موعجیزەیە (آیات) واتا ئێوە ناتوانن شێوەی بنووسن کە ئێوە نەتوانن، ئیتر (محمد) چۆن دەتوانێت کەواتە بڕوابکەن و ئیمانی پێ بهێنن، وشەی (لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ) زۆر لە کورد دەڵێت واتای عەرەب بێ ئەقڵ بووە، بەڵکو مەبەست لە بێ ئەقڵی نییە، بەڵکو بۆیە ئەم قورئانە بە عەرەبی هاتووە تا عەرەب تێبگات، چونکە زمانی عەرەبی زمانێکی قووڵ و پڕ زانیارییە، کە ئەوان بازاڕی زمانیان هەبوو واتا شیعری تێدا دەفرۆشرا و بە کەعبەدا هەڵدەواسرا، تا ئەم ساتە وەختە زمان زانایانی عەرەب نەیانتوانی وەکو قورئان بنووسن، هەڵبەت باسی نەخوێنەوارە عەرەبە مولحیدە مەسیحییەکان ناکەین، مەبەستم شارەزا و پسپۆڕانی زمانی عەرەبییە، یاخود ئەکادیمییەکانە، هەموو ئەوانە تا ئێستا و ڕۆژی قیامەتیش هەر دەستەوسان دەبن بەرامبەر بە ڕێزمان(گراماتیک) و بەلاغە و ڕەوانبێژی قورئانی پیرۆز.

هەموو ئەم پێشەکییە بۆ چیە؟!

بۆ ئەوەیە کە خوای گەورە باشترین ڕووداوی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و ئومەتەکەی دەگێڕێتەوە، کە عەرەب بە گشتی و تەنانەت پێغەمبەری خواش ﷺ پێش پێغەمبەرایەتی نە ناوی یوسفیان بیستبوو، نە ژیان و مێژووی لای عەرەب و بە تایبەت شاری مەککە نەزانراو بووە، هەرگیز باس نەکراوە ئەم جوانترین هەواڵ و ڕووداو و ژیانی ئەم پێغەمبەرە عەزیزە لە مەککە دێتە خوارەوە، کە سەراپای پڕە لە جوانی چ لە وشە بێت، یان ڕیتم و ئیقاعی مۆسیقای وشەکان و یاخود شێوەی (سەرد) و پاشان خودی زانیارییەکانی ناو باسەکە هەمووی موعجیزەیە.

ئەم بەسەرهاتەش بەشێکی کەمە لەو کتێبەی کە ناونراوە بە قورئان بۆت دائەبەزێت، لە ڕاستی هەرچۆن بیر لە وشەکانی دەکەیتەوە هەمووی ئۆتۆماتیکی دەبێتە موعجیزە.

دیسانەوە ئەم باسە ناچارت دەکات کە وەکو شێوەی تەفسیر باسە مێژووییەکە بگێڕمەوە.

جا هەموو ئەم باسە ورد و قووڵانە کە لە قورئاندا هاتووە محمد و قوڕەیش هەر زۆر لێی بێئاگابوون، غافڵ بوون لە باسی مێژووی گەلان، تەنانەت ئادەم و حەواشیان نەئەناسی، چجای یوسف و یەعقوب و ئیسحاق.

سەرەتا هاوشێوەی ڕیکلامێکی زۆر بەهێز و سەرنج ڕاکێش بۆ دراما و شانۆیەک کە ڕاستەوخۆ پێشکەش دەکرێت، یاخود پەردە لەسەری لا دەدرێت، وا زنجیرەی یەکەمی ژیانی ئەو پێغەمبەرە لە منداڵییەوە دەست پێدەکات، بە جوانترین دیمەن کە خەونێکە دەیگێڕێتەوە،

﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَـٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَـٰجِدِينَ ④ قَالَ يَـٰبُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيْدًا ۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ لِلْإِنسَـٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ⑤ وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَـٰقَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ⑥﴾ يوسف

واتە: باسی ئەوە بکە: کاتێ یوسف بە باوکی وت: باوکی (بەڕێزم) من لە خەونمدا بینیم کە یانزە ئەستێرە و خۆر و مانگیش کڕنووشیان بۆ من برد ④ (باوکی) وتی: ڕۆڵە گیان خەونەکەت مەگێڕەوە بۆ براکانت (نەوەکو) فێڵێکت لێ بکەن و تووشی بەڵایەکت بکەن چونکە ئەم خەوە داهاتوویەکی بڵند بۆ تۆ دەگەیەنێت، ئەوانیش حەسوودیت پێ دەبەن) بەڕاستی شەیتانیش ( دوژمنێکی ئاشکرای ئادەمیزادە ⑤ بەم شێوەیە خوای پەروەردگار تۆی دیاری کردووە (ئەی یوسف) ئامادەی کردوویت بۆ پێغەمبەرێتی، لێکدانەوەی خەوت فێر دەکات و نیعمەت و پلە و پایەی بەرزی دنیاو قیامەتت بۆ تەواو دەکات، هەروەها بۆ نەوەکانی یەعقوب هەروەک نیعمەت و پلە و پایەی بڵندی بەخشی بە باوانت (ئیبراهیم و ئیسحاق) بەڕاستی خوای پەروەردگارت زۆر زانا و دانایە ⑥

منداڵێک لە تەمەنی ١٢بۆ ١٤ ساڵ خەونێک بە ئەدەبەوە بۆ باوکی دەگێڕێتەوە، کاتێک کە دەیگێڕێتەوە خەونەکە خەونێکی منداڵانە نییە، بەڵکو خەونێکی پڕ مانایە کە مانگ و ڕۆژ و ئەستێرەکان لە دەوریدان و سوجدەی بۆ دەبەن، خەونەکەش زۆر ڕوونە لای یوسف، چونکە دڵنیایی ئەداتە باوکی کە بە چاوی لە خەونەکەدا بینیویەتی ڕوون بووە، شتێکی لێڵ و ناڕوون نەبووە، بە ئاشکرا دەڵێت (رَأَيْتُ) واتا بینیویەتی پاشان جاری دووەم دڵنیایی دەکاتەوە کە هەر هەمووی سوجدەی بۆ بردووە.

یوسف لە شێوەی مانگ و ڕۆژ و ئەستێرە بینیویەتی سوجدەی بۆ دەبەن، جا دەشێت هەر خودی شێوەی مانگ و ڕۆژ و ئەستێرە سوجدەیان بردووە، یان لە شێوەیەکی تردا کە دڵنیایی داوەتە یوسف کە ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە بوون، باوکیشی پێغەمبەرە بە دڵنیاییەوە دەتوانێت بۆی تەفسیر بکات، بەڵام واز لە تەفسیر کردنی خەونەکەی یوسف دەهێنێت و دەست دەکات بە ئامۆژگاری کردنی، دەڵێت ئەم خەونە بۆ براکانت مەگێڕەوە دیارە براکانیشی شارەزا بوون لە بواری خەون و لێکدانەوەی خەوندا.

هەر بۆیە یەعقوب زانی کە ئەم کوڕەی داهاتووویەکی زۆر گەورەی هەیە، پێدەچێت لە دوای ئەم خەونە کە یوسف بینیویەتی، باوکی زیاتر گرنگی پێئەدات و ئەمەش دەبێتە هۆکاری داخ لە دڵی براکانی تری بە تایبەت لەوکاتەدا تەنها دایکی یوسف ماوە لەگەڵ یەعقوب دا، واتا راحیل هەموو خێزانەکانی تری مردوون.

چونکە لە قورئاندا ئاماژە بۆ دایک و باوکی دەکات لە کاتی چوونیان بۆ وڵاتی میسر کە لە کاتی خۆیدا و جێگای باسەکەدا ئاماژەی زیاتری پێئەدەین، بە هەرحاڵ ئامۆژگاری باوکی لە گوێی دەگرێت و باسی خەونەکە ناکات بۆ هیچ کەسی تر، چونکە باوکی عیللەت و هۆکاری نەگێڕانەوەی خەونەکە دەخاتە بەرچاوی یوسف پێی دەڵێت: کە شەیتان خەڵک گومڕا و سەرلێشێواو دەکات.

پاشان حەزرەتی یەعقوب ئاماژە بەشتێکی زۆر گرنگ دەکات ئەویش هەڵبژاردنی پێغەمبەرانە لەلایەن خواوە هەڵدەبژرێن، پێغەمبەرایەتی بە هۆکاری باوک و برا و خوا پەرستی زۆر نییە، بەڵکو خوا هەڵیدەبژێرێت، لەوانەیە خەڵکانێک بڵێن ئەی ئەوە نییە مووسا بە دوعاکردنی و داواکردن هاروونی برای کردە پێغەمبەر؟

بەڵێ ڕاستە، بەڵام هیچ خیانەت و کاری ژێر بە ژێر نەکراوە بۆ ئەوەی بگاتە ئەو پۆستە کە پۆست و مەقامی پێغەمبەرایەتییە، بەڵام ئەگەر تەماشای گێڕانەوەی مێژووی یەهود بکەین پێغەمبەرایەتی یەعقوب بە فێڵ بووە، حاشا کە شتی وا لە پێغەمبەران ناوەشێتەوە، چونکە مووسا داوای هاوکاری دەکات لە خوای گەورە، بەڵام لای یەهود بڕیاری پێغەمبەرەکەیە بەسەر خوادا (پەنا بە خوا) کە دوعای کرد تەواو ئیتر دەبێت بە پێغەمبەر، هەرچەندە ئەمە تا ڕادەیەک باشترە لە چاو ئەوەی کە تاوانی زینا کردن ئەدەنە پاڵ لوط پێغەمبەر لەگەڵ کچەکەی خۆیدا و بەسەر خۆشیش، ئەمەش لە سفری تەکویندا هاتووە، زۆری تر لەم جۆرە درۆ و بێ ئەدەبییانە کراوە بە پێغەمبەران، لەلایەن یەهود و نەساراوە، کەواتە یەعقوب ئەوە دەردەخات کە باوک و باپیرەکانی هەڵدەبژێرێت بە پێغەمبەر، بەڵام بە ئاماژە پێکردن نەک بە ڕاستەوخۆیی، هەروەکو چۆن خوای گەورە نیعمەتی پێغەمبەرایەتی بەخشیوە بە باوانت، ئەوا تۆش لە بنەماڵەی یەعقوب لەو زنجیرە موبارەکە دەبیت، بەڵام خەونەکە خەونێکی ئاسایی نییە، ناڵێت(حُلم) دەڵێت (رؤیا) ئەم دوو جۆرە زۆر جیاوازە، روئیا دێتە دی وابەستەیە بە قەدەری مرۆڤەوە، دەشێت دیندار و بێ دین ببینێت، یەعقوب ئاماژە بۆ (يَجْتَبِيک) دەکات واتا هەڵبژاردنی خوایی لەگەڵ ئەوەشدا باسی زانستێک دەکات کە دوو خوێندنەوەی بۆ دەکرێت سەید قوطب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: ( التأويل، بە واتای شارەزا بوونە لە ماڵ و سەروەت و سامان و بواری ئابووری (الأحَادِيثِ) بە واتای ڕاستگۆیی لە وتە و هەڵبژاردندا پێشبینی کردنی

ڕووداوی سیاسی و ئابووری کە هەمووی نیعمەتی خوایە و بەدوایدا تەعقیب دێت کە دەفەرموێت: (إِنَّ رَبَّک عَلِيمٌ حَكِيمٌ).

هەروەها دەڵێت جەوی حیکمەت و زانستەکە لەگەڵ مەبەستی (الأَحَادِيثِ) زانستی خەون بینینیش دەگرێتەوە، ئەو زانایانەی وایان وتووە وتەکەیان تەواوە، چونکە باسی خەون بینین زۆر دێتە ئاراوە لە باسی ڕووداوەکانی یوسف دا لە زیندان و هەروەها لەگەڵ خەون بینینی پادشای ئەو وڵاتە.

کەواتە ئێمە وەکو موسڵمان پابەندین بەوەی هەندێک خەون کە ئاماژەیە بۆ داهاتووو لەگەڵ قەدەری مرۆڤ ڕێگا دەبڕێت.

بەڵام نووسەر پێی وایە کە (ڕۆیا) ئامانجت پێ دەڵێت، ڕێگا گرتنە بەرەکەی دیار نییە و کەس نازانێت چۆن دەگەیتە ئەو ئامانجە، چونکە قەدەری ئەم پێغەمبەرە ئازیزە وابەستەیە بە خەونەوە کە بینیویەتی و خوای گەورە و پەروەردگار تا کۆتایی ژیانی تەفسیری ئەو خەونە نیشان ئەدات.

لێرەدا دەبێت باسی ئەو مەخلوقەی خوای پەروەردگار بکەم کە جێگای سەرنجی هەموو زانایان بووە، قوتابخانە جیاجیا فیکری و دەروونیەکان هەر یەک تەفسیری ماددی تایبەتی خۆی بۆی هەیە، جا (فرۆید بێت یاخود میسالی...هتد) هەموو باس لە بیر و ڕای خۆی دەکات و هیچ بنەمایەکی زانستی نییە، تەنها و تەنها تەفسیری خودی فەیلەسوفەکانە لە ڕووی تیۆرییەوە، ئێمەش وەکو موسڵمان قەناعەتمان وایە کە بەشێک لە داهاتووی خەڵکی کە بریتییە لە قەدەری ئینسانی ئەدات وەکو ئاماژەیەک (سیگناڵێک) و (برقية) لێدانێک بۆ مرۆڤەکە، یاخود ئاگادار بوونە لە حاڵی کەسێکی نزیک...هتد، بەڵام هەموو ئەمانەی کە باسمان کرد، بێجگە پێغەمبەران کە خەونیان وەحییە، هەموو مرۆڤەکانی تر کە خەون دەبینن هیچ ئەحکامێک و یاسایەکی لەسەر دانامەزرێت، تەنها خەونی پێغەمبەرانە یاسا و ئەحکامی لەسەر دادەمەزرێت.

زنجیرەکەی تر لە ڕووداوەکانی ژیانی یوسف دەست پێدەکات لەم بەشەدا

پلانگێڕ و کۆمەڵێک کارەکتەری نوێی ڕاستەقینە لە ڕووداوەکاندا دەردەکەوێت ئەوانیش براکانیەتی. ﴿۞ لَّقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ۝٧ إِذْ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ۝٨ ٱقْتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَٰلِحِينَ ۝٩ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ۝١٠﴾ يُوسُف.

واتە: بێگومان لەم ڕووداوەی یوسف و براکانیدا نیشانەی پێغەمبەرێتی محمدی تیایە بۆ کەسانێ کە پرسیار بکەن لەو بارەیەوەو (بەشوێن ڕاستی پێغەمبەرێتی تۆدا بگەڕێن) ﴿٧﴾ کاتێ براکانی یوسف وتیان: بەڕاستی یوسف و براکەی (بنیامین) لای باوکمان، لە ئێمە نازدارترن و زیاتر لە ئێمە گرنگییان پێ دەدا، لە حاڵێکا ئێمە کۆمەڵێکی بەهێزین، بەڕاستی باوکمان لەسەرلێشێواوییەکی ئاشکرادایە ﴿٨﴾ (لەنێوان خۆیاندا هەندێکیان وتیان) یوسف بکوژن، یان فڕێی بدەنە شوێن و زەوییەکی دوور، ئەوکاتە ڕووی باوکتان یەکلایی دەبێتەوە بۆ ئێوەو خۆشەویستییەکەی هەمووی بۆ ئێوە دەبێت، ئینجا دوای نەمانی یوسف ببنە کوڕو کەسانێکی چاک و ڕێک و پێک ﴿٩﴾ یەکێک لە براکانی یوسف وتی: یوسف مەکوژن، بەڵکو بیخەنە ناو بیرێکی قووڵەوە دوایی کاروان دێت و دەیدۆزنەوەو دەیبەن، ئەگەر بڕیار بێ هەر شتێکی لێ بکەن ﴿١٠﴾.

خوای پەروەردگار سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ لای براکانی یوسف کە جێگای سەرنج و پلان دانان و جێگای پرسیار گەلێکی زۆرن لای خەڵکی هەروەکو ناساندنێک لە سەرەتای دانانی پلان بۆ براکەیان و بە دوایدا ئەو پلان و کارە خراپە دێتە ئاراوە کە ئەوان بیری لێ دەکەنەوە، دیمەنی چۆنیەتی پلان دانان بۆ کوشتنی براکەیان.

لە پەیمانی کۆندا، ئەوە باس کراوە کە گوایە هەواڵەکە دزەی کردۆتە لای براکانی یوسف، ئەویش دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە یوسف نەبێتە پێغەمبەر بیکوژن!

نەوەکانی ئیسرائیل لایان ئاسایی بووە بە درێژایی مێژوو پێغەمبەر بکوژن و کارەکەشیان ئەنجام داوە،

پاشان لە دڵ و دەروونیاندا ڕق و قین هەیە بەرامبەر بە یوسف، لە ئایەتەکانی قورئاندا لە زمانی خۆیانەوە دەردەکەوێت، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی باوکیان یوسفی لەوان خۆشتر دەوێت، لە کاتێکدا ئەوان بە هێز و بە توانا و پارێزەری باوکیان و سەروەت و سامانیانن، چۆن دەبێت باوکیان بەم شێوە بەرخورد(بەڕەنگاری) بکات لەگەڵیاندا، بەو هۆکارە دەیانەوێت بیکوژن و ئەم خۆشەویستییە ون بکەن لە دڵ و دەروونی باوکیاندا، و تا خۆشەویستیەکە بگەڕێتەوە بۆ کوڕەکانی تری، هەموو ئەم ڕقە شەیتان کاری لەسەر دەکات و زیاتری دەکات، هۆکاری تریشی دەگەڕێتەوە بۆ دایکە جیاوازەکان، هەموو ئەم هۆکارانە کاری کردۆتە سەر ناخیان کە کوڕانی گەورەن و هاوکارن و بەرگریکارن لە ماڵ و سەروەت و سامان و باوکیشیان.

ئەو تاوانە گەورە ئەنجام بدەن کە ڕۆحی براکەیان لە لاشەی دەرکەن، بیر لە تاوانێک دەکەنەوە کە زۆر گەورەیە، بە دوای شیرک و هاوبەش دانان دێت، لە کاتێکدا کوڕی

پێغەمبەرێکن و باپیر و باپیرە گەورەیان پێغەمبەرە ئەمەش زیاتر سرووشتی مرۆڤ دەردەخات، پاشان براکەشیان بچووکە و توانای بەرگری کردنی نییە لە خۆی، هەموو هەم و خەمی ئەوانیش ئەوەیە کە لەبەر چاوی باوکیان ونی بکەن، بە ئەقڵی ئەوان باوکیان خۆشەویستی یوسف دابەش دەکاتەوە بەسەر کوڕەکانی تریدا.

بۆ ئەوەی بەردەوام بن لەسەر تاوانەکە و ئەنجام دانی پلانەکەش دەڵێن کە کارەکەمان ئەنجام دا دوای ئەوە تۆبە دەکەین و بڕیاری باش بوون لە خۆماندا ئەدەین.

ئەمەش بیرکردنەوەی شەیتانی و سوور بوونە لەسەر تاوان، یاخود وەکو عەرەب دەڵێت بیانووە(موبەڕیرە) بۆ ئەنجامدانی تاوانەکە، تا ڕق و کینەی دڵیان ئاو پێبخۆنەوە، چونکە تەوبەکردن لای ئەوان وەکو قوتوی موعەلەب وابوو دەیانویست تاوانەکە ئەنجام بدەن و پاشان تەوبەی لەسەر بکەن، لە ئێستاش زۆرێک لە خەڵکی هەمان دید و تێڕوانینیان هەیە، لە کاتێکدا تۆبە کردن لە تاوان ئەوەیە کە مرۆڤ بە نەزانیەوە بیکات و پاشان تووشی پەشیمان بوونەوە دەبێت و بڕیاری ئەوە ئەدات کە نەچێتەوە سەری.

بەڵام قسەکەیان بۆ ئەوە بوو تاوانەکە ئەنجام بدەن، پاشان شەیتان لە ناخیاندا تاوانەکەی لا ڕازاندبوونەوە.

یەکێک لە براکان ویژدانی دەجوڵێت و پلانەکەیان پێدەگۆڕێت بۆ دوورخستنەوەی براکەیان با کوشتن ئەنجام نەدەن، بەڵکو بیخەنە ناو بیرێک و پاشان کاروانچی و خەڵکی ڕێبوار هەڵیبگرنەوە، بیبەن بۆ خاک و وڵاتێکی نادیار.

ئەمەش گومانێک بوو کە کەوتە ناویان کە ئازاری یوسف نەدەن واتا نەیکوژن، بەڵکو دووری بخەنەوە، لە کاتێک دا ئەوان بڕیاریان داوە کە لە ناوی بەرن، بەڵام کە بە قسەی براکەیان دەکەن کەمترین کارە دژی ئەنجامی ئەوەی کە ڕق و کینە لە ناخیاندا کەم ببێتەوە واتا (إقل شيء)، هەموو لەسەر ئەوە بڕیار ئەدەن کە بیخەنە ناو بیرێک و ڕزگاریان بێت لە دەستی و لە بەرچاوی باوکیان ونی بکەن و وا هەڵدەستن بە ئەنجامدانی پلانەکەیان و هەموو خۆیان ئامادە دەکەن کە بڕۆنە لای باوکیان و یوسف لە بن دەستی دەربهێنن. قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ قَالَ إِنِّي لَيَحۡزُنُنِيٓ أَن تَذۡهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأۡكُلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَأَنتُمۡ عَنۡهُ غَٰفِلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ لَئِنۡ أَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّآ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ﴿١٤﴾ يُوسُف.

واتە: (ئەوجا هاتنە لای باوکیان و) وتیان: باوکە بۆچی لە ئێمە دڵنیا نیت لەبارەی یوسفەوە بەڕاستی ئێمە زۆر دڵسۆزی ئەوین ﴿١١﴾ بەیانی بینێرە لەگەڵمان با گەمەو یاری بکات و بای باڵی بدات، بێگومان زۆر پارێزگاری دەکەین و ئاگامان لێی دەبێت ﴿١٢﴾ باوکیان وتی: من زۆر غەمناک دەبم کە ئێوە یوسف بەرن، دەترسم گورگ بیخوات و ئێوە گوێی نەدەنێ و بێ ئاگا بن لێی﴿١٣﴾ وتیان: ئەگەر بێت و یوسف گورگ بیخوات، ئێمەش کۆمەڵێکی ئاوا بەهێز لەگەڵیدا بین، بەڕاستی ئێمە زۆر خەسارەتمەندین ﴿١٤﴾.

هەموو لای باوکیان کۆبوونەتەوە بۆ ئەوەی هەرچیان کردووە یوسف ڕابکێشن و لەگەڵ خۆیاندا بیبەنە دەرەوە، پێش هەموو شتێک دەیانەوێت باوکیان هەڵبخەڵەتێنن! بزانین چی ڕوونەدات؟

ئینجا بە وشەکانیانەوە دیارە لە فێڵ و پیلاندانان و لە سەرەتا و کۆتاییدا پلانەکە لەدڵیان ڕەگی داکوتاوە و سەعاتی سفر دادەنێن بۆ جێبەجێ کردنی، ئینجا بە شێوەیەکی نەرم و نیان دەڵێن (بابە)، زۆر بە ئەدەبەوە داوا دەکەن بەڵام لە شێوەی پرسیاری ناڕەزایی، بۆ هەرچیان کردووە بەرەکەتی ئیبراهیم کە پێغەمبەرایەتیە بەر یوسف ئەکەوێت!

بابە تۆ بۆچی بڕوا بە ئێمە ناکەیت و یوسف لەگەڵماندا بێتە سەیرانگا و جێگای یاری و لەگەڵماندا بە ئارەزوی خۆی خواردن و خواردنەوە بخوات و یاری بکات، جۆری وتەکەیان بۆ ئیحراج کردنی باوکیانە.

لە شێوەی ئامۆژگاری بەڵام ناڕەزایشی لە خۆیدا هەڵگرتووە، دەڵێن ئێ باشە خۆ لەگەڵماندا دێت چی دەکات، یاری دەکات و بە ئارەزوی خۆی خواردن دەخوات و ئێمەش برای ئەوین و دەیپارێزین، هەموو ئەم قسانەیان جەخت و دڵنیایی لەسەر پاراستنی یوسف دەکات، پاشان وەکو سەرزەنشت بە باوکیان دەڵێن تۆ هۆکاریت کە ناهێڵیت براکەمان یاری بکات و چالاکی وەرزشی هەبێت و چاو کراوە بێت.

باوکیان ڕاستگۆیە، ناڕاستەوخۆ پێیان دەڵێت، بەڵێ بەڕاستی پێم خۆش نیە بێت لەگەڵتاندا، بە هۆکاری ئەوەی نەکو گورگ بیخوات! بەڵام هۆکارەکە ئەداتە پاڵ گورگ، خۆ براکانی بۆ یوسف هەر گورگ بوون بەڵام وەکو کورد دەڵێت لە پێستی مەڕدا.

بە واتایەکی تریش؛ من ئارام نابم دڵم دڵنیای وەرناگرێت کە یوسفم لێ جیابێتەوە، ئەم وتەیەی یەعقوب ئەوەندەی تر ڕق و کینەی لە دڵی ئەواندا دروست کرد، کە عیللەتەکە درایە پاڵ گورگ، ئیتر ئەوانیش هەڵسان بەو پلانە و دڵنیایی تەواوەتی بدەنە باوکیان، وتیان باشە ئەگەر

گورگ هێرش بێنێت ئەی ئێمە چین، یانی بە پیاومان نازانیت؟ باوکی ڕێگای ئەوەشی لێ بڕین کە لەوانەیە ئێوە لێی بێئاگا بن بە هۆکاری سەرقاڵی و یاری کردنتان، ئەوانیش دڵنیا کردنەوەیان دا بە باوکیان ئەگەر شتی وا ڕووبدات ئێمە زیان و زەرەرمان بەردەکەوێت و سەرگەردان دەبین، واتا ئێمە کۆمەڵێک گەنجی بەهێزین جا ئەگەر نەمان توانی براکەمان بپارێزین کەواتە خێرمان نییە و بە کەڵکی هیچ نایەین!

بەم شێوەیە باوک ڕازی بوو کە کوڕەکەی یوسف لەگەڵ براکانی بنێرێت، داخۆ یوسفی منداڵ ئەو شەوە چەندە بە خۆشی و بیرکردنەوەی خۆشەوە خەوی لێ کەوتبێت، چەند دڵنیا بووە کە لەگەڵ براکانیدا دەچێتە سەیرانگا و جێگای یاری و ڕاکردن و ...هتد.

باوکیان یوسفی ڕادەستی براکانی کرد لەسەر بنەمای دڵنیای ئەوان و ئیحراج کردنیان بەوەی کە متمانەی پێیان نییە.

هەموو ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ ستراتیژی قەزا و قەدەری خوای پەروەردگار، وا کاتی ڕۆیشتنیانە و یوسف دڵ خۆش و ئامادەدەیە، لەوانەشە چەند جار لە خۆشەویستنیدا باوەشی کردبێت بە براکانیدا، ئەوانیش خەریکی جێبەجێ کردنی پلانەکەیانن.

بەڵام نەیانزانی ناڕەحەتییەکە بەسەر یوسفی برایاندا دێت و ئەوانیش دەکەونە ژێر باسکردنی خوای پەروەردگار و لە کارەکەیان هەموو خەڵکی جیهان دەیزانن، نەیانزانی دژایەتی پێغەمبەران هەروا کارێکی ئاسایی نییە، شەڕ لەگەڵ خوادا ناکرێت!

ئینجا کەوتنە گێڕانی پلانەکە و کۆبوونەوە لە یوسف، هەڵبەت یوسف-یش وای زانیوە یاری لەگەڵ دەکەن، داوای کراسەکەی دەکەن و کراسەکەی لەبەردا دادەکەنن و فڕێی ئەدەنە ناو بیرێکی ئاو.

﴿فَلَمَّا ذَهَبُواْ بِهِۦ وَأَجۡمَعُوٓاْ أَن يَجۡعَلُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمۡرِهِمۡ هَٰذَا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ١٥ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ عِشَآءٗ يَبۡكُونَ ١٦ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبۡنَا نَسۡتَبِقُ وَتَرَكۡنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ١٧ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٖ كَذِبٖۚ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ١٨﴾ يُوسُف.

واتە: کاتێ یوسفیان برد هەموو هاتنە سەر ئەو بڕیارەی کە بیخەنە ناو بیرەکەوە لەو کاتەدا (وەحی)مان بۆ نارد کە هەواڵی ئەم بەسەرهاتە لە ئایندەدا بە براکانت دەدەیت، کاتێ ئەوان ئاگایان لەخۆیان نابێت و لەبیریان چۆتەوە ﴿١٥﴾ ئەنجا هاتنە لای باوکیان کاتی ئێوارەو بەدەم

گریانەوە ﴿١٦﴾ وتیان: باوكە ئێمە ڕۆیشتین پێشبڕكێمان كردو (یوسف)مان لای كەل و پەلەكەمان بەجێهێشت، گورگ (پەلاماری داو) خواردی، بەڵام تۆ بڕوامان پێ ناكەیت هەرچەندە ڕاستگۆش بین ﴿١٧﴾ براكانی هەندێ خوێنی درۆینەیان دابوو لە كراسەكەی، (باوكیان) وتی: وادیارە خۆتان شتێكتان لەژێر سەردایە، چارم تەنها خۆگریی و ئارامگرتنە بەجوانی، (داواكارم) خوا كۆمەكیم بكات بەرانبەر ئەو باسەی ئێوە دەیكەن ﴿١٨﴾

جارێ واز لە یوسف بهێنن كە خستیانە ناو بیرەكە، بگەڕێینەوە بۆ لای براكانی بزانین چی درامایەک ئەنجام ئەدەن، كارەكەیان لەسەر ئەوە تەواو بوو كەبراكەیان بخەنە ناو بیرێک و وازی لێ بهێنن، تا وەكو كاروانێک یان قافڵەی ڕێبواران بیدۆزنەوە و لەگەڵ خۆیاندا بیبەن.

ئێوارە گەڕانەوە بۆ لای باوكیان و بە گریان و شین و ڕۆڕۆوە، بەم هەواڵە پڕ ئازار و پڕ سوێیەوە بۆ باوكیان،خێرا هۆكاریان دروست كرد كە گوایە چوون بۆ پێشبڕكێ و یوسفیان لای خواردن و كەرەستەكانیان جێ هێشتووە و گورگ خواردوویەتی، ئەمەش بەڵگەی قسەكەمانە كە كراسەكەیمان هێناوەتەوە بۆت ئەوەندەش پەلەیان بووە بۆ لەناو بردنی، هەر هەمان پلانیان دووبارە كردەوە كە باوكیان ئاگاداری كردبوونەوە وتەكانی باوكیان كردیانەوە بە بەڵگە لەسەر ئەنجامدانی كارەكەیان، ئەمەش دوو بۆچوونی لێ وەردەگیرێت كە شێوە خێرایەک و نەزانیەكی پێوە دیارە، یان ئەوەتا دەڵێن وەڵاهی خۆ ڕاستت كرد قسەكەت هاتە دی، یان هەر بە عەمدەن ئەو قسەیەیان كردووە، یەعقوب دەشێت خوای گەورە ئاگاداری كردبێتەوە لە پلانی منداڵەكانی هەر بۆیە بە شوێن یوسف دا نەگەڕاوە داوای هیچ شتێكی تری نەكرد لە كوڕەكانی وەكو بەڵگە، چونكە دەیزانی ناتوانن یوسف بكوژن، بەڵام دەیزانی پیلانیان دژی گێڕاوە، چونكە دەیزانی گورگ ئەوەندە بە ڕەحم نییە یوسف بخوات و كراسەكەی تەنها خوێناوی بكات و دەمی پێ پاک بكاتەوە، دیار بو درامایەكی زۆر سادەیە و دەرهێنەرەكانیشی و كارەكتەرەكانی زۆر لاوازن.

با بگەڕێینەوە بۆ لای یوسفی زوڵم لێكراو لە لایەن براكانیەوە، داخۆ منداڵێكی وا لەو تەمەنەدا چۆن ژیان بگوزەرێنێت لەو بیرەدا، كە پێشتر هەمیشە لە تەنیشت باوكیەوە بووە، وا ئێستا بە دەستی براكانی خراوەتە ناو بیر و لەوێدایە كە پڕیەتی لە مار و مێروو و دووپشک، ئەوان وا پەییان دەبرد، خوای پەروەردگار بە هانای بەندەی خۆیەوە نایەت؟!

یوسف ماوەی سێ شەو لە بیرەكەدا مایەوە، هەندێک لە براكانی خواردنیان بۆ دەبرد، چونكە بە هیوای ئەوە بوون، كە كاروانێک لەگەڵ خۆی ببیات و ڕزگاریان بێت لەو تاوانەی ئەنجامیان داوە.

ڕۆژانە لە ماوەی مانەوەی یوسف لە بیرەکەدا براکانی سەردانی ناوچەکەیان دەکردو خواردنیان بۆ دەبرد، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو درۆیەی کە کردبوویان لاواز بوو بۆیە دەیانویست زوو دووری بخەنەوە تا لەبەر چاوی باوکی ون بێت.

باوکی یوسف فەرمووی: هیچ سکاڵا و هات و هاوارێک ناکەم، ئەزانم ئەوەی بۆتان وەسف کردم وا نییە، لە نەفسی خۆتانەوەیە، ئارامگر دەبم و پشت و پەنا تەنها بە خوای پەروەردگارم دەگرم، لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە هەر شتێک وەسف و پێناسەی خۆی نەکرێت بە تاوان و درۆ هەژمار دەکرێت، بۆ نموونە، پێناسەی دیموکراسی پێویستە وەکو خۆی بۆ خەڵک بکرێت تا خەڵکی بزانن چییە، یان عەلمانیەت، یان لیبرالیەت، شاردنەوەی هەر پێناسەیەک بە واتای درۆ دێت و هەموو درۆیەکیش تاوانە لەسەر خاوەنەکەی بە هەڵە دەنووسرێت. ﴿وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ فَأَدۡلَىٰ دَلۡوَهُۥۖ قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ١٩ وَشَرَوۡهُ بِثَمَنِۭ بَخۡسٖ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ٢٠﴾ يُوسُف

واتە: کاروانێ هات و ئاوهێنەرەکەیان نارد ئاو بێنێ، (ئەویش چووە سەر بیرەکە، سەتڵەکەی داهێشتە ناو بیرەکەو کاتێ هێنایە سەرەوە لەجیاتی ئاو یوسف هاتە دەرەوە، کاتێک کابرا بینی)، وتی: مژدە بێت ئەمە منالێکە (ئەوسا هەر منالێ بدۆزرایەتەوە دەکرا بە بەندەو دەفرۆشرا) ئەم باسەیان شاردەوەو کردیانە کەرەستەی فرۆشتن، خوای گەورەش زاناو ئاگایە بەکارو کردەوەیان ١٩ سەرئەنجام (بردیان و) فرۆشتیان لەبازاڕی کۆیلە فرۆشەکاندا لە میسر بە نرخێکی هەرزان، چەند درهەمێکی کەم، لە فرۆشتنیدا هیچ گرنگییان پێ نەدا، چونکە پشتیان پێوەی نەئێشابوو ٢٠.

ئەگەر جارێکیتر بگەڕێینەوە بۆ لای یوسف بە خێرایی تەماشای ڕووداوەکانی ژیانی بکەین، ئەم قۆناغە یەکەم قۆناغی ناڕەحەتی ژیانی یوسف-ە عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ، بەڵام سوێیەکی زۆر گەورەیە، بەو تەمەنە منداڵیەوە ئەو ناڕەحەتی و موصیبەتەی بەسەردا دەهێنن.

کاروانێک لە شامەوە بەرەو میسر دەگەڕایەوە، یەکێک لە ئەندامانی کاروانەکە بە دوای ئاودا دەگەڕێت بە دۆڵچەوە یاخود (سەتڵ) هەر چەندە بە کوردی مانای دۆڵچەیە و لە سەتڵ بەهێزترە، دەشێت دۆڵچە لە تەختە و دار دروست کرابێت یاخود پێستەی ئاژەڵ، کاتێک کە دۆڵچەکە شۆڕ دەکاتەوە، منداڵێک خۆی بە گوریسی دۆڵچەکە هەڵواسیوە و لە تاواندا تووشی شۆک دەبێت، منداڵێک لەو بیرە دەردەهێنێت خۆشحاڵە بە ڕزگار کردنی منداڵێکی ئاوا هەر بۆیە مژدەی ژیانی منداڵەکە ئەدات، خۆی دەزانێت کە منداڵەکە ئەگەر مردوو بوایە بە ناوی مردووە بانگی دەکرد بەڵام لە خۆشی ئەوەی منداڵێک ڕزگاری بووە، حەتمەن بیری بۆ ئەوە چوو لە ئەنجامی یاری کردنی کەوتۆتە ناو ئەو بیرە، ئەو کاروانچییە هەر وا منداڵێک نابات لەگەڵ

خۆیدا، بە دڵنیاییەوە دەگەڕێت بۆ ئەوەی بزانێت کەس و کاری کێیە و تا بیگەڕێنێتەوە بۆ لای کەس و کارەکەی لێرەدا ڕووداوە مێژوویەکەیە کەسەکە دێتە لای براکانی و دەیفرۆشن بە پارەیەکی زۆر کەم، ئەمیش لە دوو حاڵەت بەدەر نییە، حاڵەتی یەکەم بە ندەی خۆیان ناوزەندیان کردووە بە ئاسانی فرۆشتوویانە و هەڕەشەی کوشتن لە یوسف کراوە کە نەڕوات دەیکوژن، بۆیە زۆر بە ئاسانی یوسف لەگەڵیاندا دەڕوات، حاڵەتی دووەم یوسف باسەکەی بۆ کاروانەکە گێڕاوەتەوە وتویەتی کە ئەمانە براین و ویستیان لە ناوی بەرن و شەڕ و دەمەقاڵە لە نێوانیان دروست دەبێت و بەو پارە کەمە قافڵەکە یوسف ڕزگار دەکات و ئەوانیش ئامادەن بە هەر نرخێک بووە یوسف دوور بکەوێتەوە، پێدەچێت یوسف کە داوای باوکیشی کردبێت، بەڵام بە هۆکاری هەڕەشە و چاوسوورکردنەوەی براکانی وازی لەو گریمانەش هێنابێت.

هەر بۆیە زۆر بە پارەیەکی کەم فرۆشتیان؛ لاتان سەیر نەبێت، نەوەکانی ئیسرائیل واتا یەعقوب بەم شێوەیە بوون لەگەڵ برا پێغەمبەرەکەیان، ئیتر چۆن وەفا و سۆزیان هەیە بۆ خەڵکی تر، چۆن دنیا وێران ناکەن لەبەر خاتری بەرژەوەندی خۆیان لە داهاتوویەکی نزیک دا هەموو ئەمانەمان زیاتر بۆ ڕوون دەبێتەوە لە نەوەکانی ئیسرائیل بە گشتی کە چەندە سەرکەش بوون، چۆن ئازاری پێغەمبەرەکانیان داوە تەنانەت شەهیدیشیان کردوون.

براکەی خۆیان کرد بە کاڵا و فرۆشتیان نەیانکردە بەندە، چونکە منداڵە کردیانە کاڵا!

ئەمەش کۆتایی بەڵا و موصیبەتی ناو بنەماڵەکەیەتی، داخۆ دایک و باوکی یوسف لە چ حاڵەتێکی دژواردا بووبن، حەتمەن بۆیە ڕووی لە باوکیەتی، چونکە خۆشەویستی یەعقوب هیچی کەمتر نەبوو لە دایکی(راحیل) تەنانەت چاوی بۆی کوێر دەبێت، براکانی ویستیان یوسف لە چاوی باوکی ون بکەن کەچی باوکی لە یوسف زیاتر کەسی تری نەدەبینی.

ئەوانیش هاوسۆزی و هاو خەمیان بە دڵنیاییەوە دەربڕیوە لەگەڵ باوک و داکی یوسف دا، درامایەکی ئەوتۆیان کردووە کە قسە و باس نەیەتە سەریان و هەناسەی درۆیان بۆ هەڵمژیوە و فرمێسکی ساختەیان هەڵڕشتوە بۆی.

## قۆناغێکی تری ژیانی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ لە منداڵیەوە بۆ لاویەتی و پێگەیشتوی بوون لە قۆناغی پیاوانە

﴿وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾ وَرَٰوَدَتْهُ ٱلَّتِى هُوَ فِى بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلْأَبْوَٰبَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ ۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ رَبِّىٓ أَحْسَنَ مَثْوَاىَ ۖ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾﴾ يُوسُف

واتە: ئەوەی کە یوسفی کڕی، بەخێزانەکەی وت: ڕێزی ئەم لاوە بگرەو شوێن و جێگەی بۆ ئامادە بکە، بەڵکو سوودمان پێ بگەیەنێ یان بیکەینە کوڕی خۆمان، ئا بەم شێوەیە جێگەمان خۆش کرد بۆ یوسف لەم دنیادا، فێری بکەین چۆن خەون لێک بداتەوە و ڕووداوەکانی چواردەوری وەک خۆی تێبگات، خوای گەورە زالە بەسەر کارو فەرمانەکانی خۆیا بەڵام زۆربەی خەڵکی بەمە نازانن﴿٢١﴾ کاتێک یوسف گەورە بوو، عەقڵ و بیرو هۆشی بەهێز بوو، پلەی پێغەمبەرێتی و شارەزایی باشمان پێ بەخشی، هەر بەو شێوەیە پاداشتی چاکەخوازان دەدەینەوە﴿٢٢﴾ ئەو ئافرەتەی کە یوسف لەماڵی دابوو هەوڵی دا لە خشتەی ببات و (تووشی گوناهی بکا)، هەموو قاپییەکانی داخست و وتی: من خۆم بۆ تۆ ئامادەکردووەو شێت و شەیدای تۆم، یوسف وتی: پەنا دەگرم بە خوا (کاری وا ناکەم) چونکە (پەروەردگارم) دەرووی لێ کردوومەتەوە، هەروەها (مێردەکەت) چاک ڕەفتار بووە بۆم (چۆن خیانەتی لێ دەکەم)، چونکە من دڵنیام ستەمکاران سەرفەراز نابن﴿٢٣﴾.

ئەم دیمەنانەی تر کە باسی دەکەین لە قورئاندا هاتووە، مێژووەکەی هەمووی لە وڵاتی میسرە، پێشتر لە خاکی قودس دا بوون، ئێستا کراوە بەرەو وڵاتی میسر هێنراوە، منداڵێکی هاوشێوەی یوسف ناتوانێت لەگەڵ کاروان چیەکاندا بێت، جارێ پێویستی بە سەرپەرشتی هەیە، بۆیە کاروانەکە گەیشتە وڵاتی میسر دەست بە جێ فرۆشتی، لە سەرەتای دەستپێکی هاتنی سەردەمی بەندایەتییەوە پادشا و گەورە پیاوانی سەربازی منداڵیان کڕیوە و بەخێویان کردووە و پاشان ئەوانیش وەکو سەرباز لە گەورە بووندا بەکاریان هێناوە، یوسف دەکەوێتە بەر دەستی کەسێک کە سەرۆکی وەزیرەکانی میسرە و خاوەنی پلە و پایەیەکە بە ناوی (عزیز) ئەم پۆستە تەفسیرێکی تریشی بۆ دەکرێت کە گوایە(عزیز) وەزیری کاروباری ئابووری و کۆمەڵایەتی بووە دوور بووە لە بوارەکانی جەنگ، بەڵام پێویستی بە سەرباز و دەست و پێوەند هەبووە بۆ کۆکردنەوەی باج و خەراج بۆ دەوڵەت.

یوسف لە بازاڕدا نەفرۆشراوە، بەڵکو کاروان چییەکان بازرگان بوون زانیویانە کە چۆن کاڵاکانی خۆیان ساغ دەکەنەوە، یوسفیان فرۆشتوە بە (عزیز)ی میسر کە ناوی لە پەیمانی کۆندا هاتووە لە سفری تەکوین دا ناوی(فوطیهار یان پوتیفار)ە، هەروەها پایتەختی ئەو دەوڵەتە ناوی (تانیس) بووە یاخود(أفاریس) بە عەرەبی پێی وتراوە (صان الحجر) بە پایتەختی هیکسۆسەکان ناسراوە، ئەو جێگایە لە ئێستادا هەر بە (صان الحجر) ناسراوە نزیک دەریاچەی (المنزلة) لە وڵاتی میسر.

یوسف فرۆشرا - قۆناغێکی نوێ دەست پێدەکات لە ژیانی، بۆ ماوەیەک لە ناڕەحەتی و ئازار و ئەشکەنجەی براکانی ڕزگاری بوو، بەڵام مەینەت و بەڵا و موصیبەتی تر ڕووی تێدەکات کە زۆر بە سوێترە لەوەی براکانی لەگەڵیاندا ئەنجامیاندا.

ئەوەی کڕی بردیەوە بۆ لای خێزانی و ئاگاداری کردەوە کە زۆر باش بێت لەگەڵیدا، چونکە سیما و ئاکاری بە کەسێکی باش و پڕ خێر و چاکە دەچێت تەنانەت، جێگای تایبەتی بۆ دابین کرا (أکرمي مثواه) بە واتای جێگای مانەوە پشوی با باش و جوان و تایبەت بێت وەکو بەندە و خزمەتکارەکانی تر نەبێت، پاشان عەزیز هۆکارەکەشی دیار دەکات و دەڵێت: لە داهاتووو دەیکەینە کوڕی خۆمان و سوودمان پێ دەگەیەنێت، هەروەها ڕەحمی خوای گەورەیە کاتێک کە عەزیز داوای جێگای باشی بۆ دەکات و پاشان وشەکان هەموو واتای قووڵیان لە ناو خۆیاندا هەڵگرتووە، بۆ ئەوەی پێشتر لە ناو بیرێکدا دۆزراوەتەوە، دەشێت عەزیز بە ڕووداوەکەی زانیبێت، بۆیە قەرەبووی بۆ دەکاتەوە بە جێگایەکی زۆر باش لە ئەنجامی ئاخافتنی لەگەڵ یوسف بە دڵنیاییەوە بۆی دەرکەوتووە کە منداڵێکی ئاسایی نییە، بەڵکو کەسێکی زۆر بە توانا دیارە لە ڕووی ئەقڵ و ئاخافتنەوە، هۆکارێکی تریش عەزیز و هاوسەرەکەی منداڵیان نەبووە. دەشێت ئەوانیش عیللەتێکیان هەبووبێت، بۆیە حەز دەکەن بیکەنە منداڵی خۆیان، بە سرووشتی وەکو زانراوە خوای پەروەردگار بە جوانی و جوانخاسی درووستی کردووە، بە دڵنیاییەوە ڕوح سوک و لە دڵدا شرین بووە یوسف.

لێرەدا دەبێت بوەستین لەسەر تەقدیری خوایی کە بۆ یوسف تەمکین و جێنشینکردنی پێ دەبەخشێت و فێری بواری ئابووری دەکات، جا یەکەم جار لە ڕێگای عەزیزەوە دەبێت، یاخود لە ڕێگای وەحیەوە بێت خوای گەورە لەگەڵ گەورە بوونی تەمەنیدا، براکانی ویستیان وابوو کە ونی بکەن و ناوی نەمێنێت بەڵام ئیرادەی خوای موتەعال بە جۆرێکی ترە، خوای پەروەردگار بە توانایە بەسەر هەموو شتێکدا، ئەوەی بیەوێت ئەنجامی ئەدات، براکانی یوسف، یوسفیان لەدەست دەرچوو لە ئیرادەشیاندا نەبوو هیچی لێکەن.

خوای پەروەردگار یاسا و سوننەتەکانی بە گوێرەی ویستی خۆی هەڵدەسوڕێنێت و کەس توانای نییە بەسەریدا، ئەمەش زۆرێک لە خەڵکی نایزانن.

پاشان لە دوای گەورەبوونی و فێرکاری لە بوارەکانی حوکم و ئابووری لە سەرو هەموو ئەوانەوە خوای پەروەردگار حیکمەت و زانستی پێ دەبەخشێت جا حیکەمت لە دیندا و کە وەحی دەگرێتەوە و زانست لە بوارەکانی ژیان، هەموو بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە، ئەمەش پاداشتی خوایە بۆ ئەو کەسانەی کە چاکەخواز و سەر ڕاست و دادپەروەرن.

یوسف ڕۆژ بە ڕۆژ لە ناو ماڵی عەزیزدا و لە ناو دەست و پەیوەندی عەزیزدا بەهێزتر و خۆشەویستر دەبێت، گوێ بۆ گیراو و خاوەن دید و تێڕوانینی خۆیەتی، ئەمانەش هەموو بە وەحی لە لایەن خوای گەورە ئاراستە کراوە بۆ حەزرەتی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ، بەڵام لە دوای ئەم بەرز بوونەوەیە یوسف تووشی بەڵا و موصیبەتێکی زۆر گەورە دەبێت، کە زۆر سەخت تر و ناهەموار ترە لەوەی براکانی دەرهەقی ئەنجامیان دا، ئەمەش هەر لە چوار

چێوەی ئەو خەونەیە کە بینیویەتی، ئەگەر چی جوانی و بەهێزی لاشە و حیکمەتی و زانستی پێ بەخشراوە، تاقیکردنەوەیەکی تر دێتە ئاراوە بۆ یوسف کە بتوانێت ڕووبەڕووی بێتەوە، جا ئەگەر حیکمەت و زانستەکەی ڕێگری

لە موصیبەتەکان نەکات، کەواتە حیکمەت و زانستەکەی هیچ کاریگەری نەبووە، ئەویش حاڵەتی وروژاندن و گەنجایەتی لاشەی ڕووت و قووتی ئافرەتانی (بۆرجوازو) پڕ بۆنی خۆش و خۆشی ژیانە و هەموو لەزەتێکی گەنجانەی لەخۆدا هەڵگرتووە، ئەگەر مرۆڤ بە ئیمانی نەتوانێت خۆی بپارێزێت ئەوا بە دڵنیاییەوە ڕۆدەچێت و سەرگەردانی دنیا و قیامەت دەبێت.




﴿وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ ۖ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَٰنَ رَبِّهِۦ ۚ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ۚ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾ وَٱسْتَبَقَا ٱلْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٍ وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلْبَابِ ۚ قَالَتْ مَا جَزَآءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٥﴾ قَالَ هِىَ رَٰوَدَتْنِى عَن نَّفْسِى ۚ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيْدِكُنَّ ۖ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا ۚ وَٱسْتَغْفِرِى لِذَنۢبِكِ ۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلْخَاطِـِٔينَ ﴿٢٩﴾﴾ يُوسُف.

واتە: بێگومان (شاژن) ویستی پەلاماری بداو مەست و حەیرانی بوو، (یوسف)یش گیری خواردبوو بەدەستیەوەو (هەر ئامۆژگاری دەکرد)، ئەگەر بەڵگەی ئیمانی لە دڵ و دەروونی خۆیدا هەست پێ نەکردایەو سزای دۆزەخ نەهاتایەتە بەرچاوی، بەو شێوەیە (بەهۆی ئیمانی دامەزراوەوە) هەرچی گوناهو تاوان و خراپەیە لێی بەدوور دەگرین، بەڕاستی ئەو لە بەندە هەڵبژاردەو پاکەکانی ئێمەیە ﴿٢٤﴾ سەرئەنجام یوسف بە پەلە ڕای کرد بەرەو دەرگاکەو زولەیخاش بەشوێنیا (توانی دەستی لە کراسەکەی گیر بکات) بەدەستیەوە دڕا، لەبەردەمی قاپییەکەدا تووشی مێردەکەی هاتن، (خێرا شاژن هاتە گفت و ویستی یوسف تاوانبار بکات بۆیە) وتی:

باشە ئاخۆ سزای ئەو کەسە چییە کە بیەوێ دەستدرێژی بکاتە سەر خێزانەکەت و بیەوێ خراپەی لەگەڵدا بکات مەگەر بەند بکرێت، یان سزایەکی بەئێش بدرێ ﴿٢٥﴾ یوسف وتی: (نەخێر وانییە) ئەو ویستی لە خشتەم بەرێ، ئەو ویستی گوناهم پێ بکات، (یەکێک لە) خزمانی شاژن (کە گوێی لە بەسەرهاتەکە بوو، دیاربوو کە پیاوێکی دنیا دیدە بوو) شایەتیٔ داو وتی: ئەگەر کراسەکەی یوسف لە پێشەوە دڕابێ ئەوە (شاژن) ڕاست دەکات و یوسف لە ڕیزی درۆزناندایە ﴿٢٦﴾ بەڵام ئەگەر کراسەکەی لە پشتەوە دڕا بێ ئەوە شاژن درۆ دەکات و یوسف لە ڕیزی ڕاستگۆیاندایە ﴿٢٧﴾ (کاتێ شا) بینی کراسەکەی یوسف لە پشتەوە دڕاوە، بە (شاژنی) وت: بەڕاستی ئەمە پیلان و نەخشەی خۆتانە، بەڕاستی فێڵ و تەڵەکەو نەخشەو پیلانی ئێوە زۆر گەورەیە ﴿٢٨﴾ ئەوجا ڕووی کردە یوسف و وتی: ئەی یوسف: ئەم باسە فەرامۆش بکەو گوێی مەدەرێ، تۆش (ئەی زولەیخا) داوای لێخۆش بوون و لێبوردن بکە لە هەڵەو تاوانەکەت چونکە بەڕاستی تۆ لە گوناهباران و بەهەڵەچواندایت﴿٢٩﴾

لە باسەکانی ئایەتەکەدا تەمەنی کارەکتەرە سەرەکییەکان دیاری نەکراوە، بەڵام لە ڕێگای گریمان و لەوانەیەوە دەتوانین بڵێین عەزیز تەمەنی لە چلەکاندایە، چونکە باسی نەزۆکی نەکراوە، بەڵام دەشێت خێزانەکەی تەمەنی لە خۆی منداڵ تر بووبێت لە بیستەکاندا بووبێت، یوسفیش تەمەنی پێدەچێت لە بیستەکاندا بووبێت، بەڵام خێزانەکەی عەزیز گەورەتر بووە بە چەند ساڵێک لە یوسف پێدەچێت یوسف ٢٠ ساڵ بووبێت و خێزانی عەزیز ٢٧ ساڵ بووبێت، ئەمەش زۆر ڕێگای تێدەچێت، چونکە هەر بۆیە لێرەوە وروژاندنی سێکسی لای بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و بۆرجواز و مەخمەڵی بۆ گەنجێکی خزمەتکار دەجوڵێت، داوای کاری سێکسی لێ دەکات و هەموو گیانی سەراپا بۆ ئەو کارە

ئامادە کردووە لەگەڵ یوسف دا، بەڵام یوسف لە دنیایەکی تردایە ئەویش بە دوای خواپەرستی و زانستەوەیە، هەرچەندە سید قوطب مەزەندەی دەکات تەمەنی یوسف بە ٢٥ ساڵ و تەمەنی خێزانەکەی عەزیز بە ٣٠ ساڵ، کاتێک کە ئافرەتەکانی شار دەڵێن ژنەکەی عەزیز (سەرگەرمە لەگەڵ فەتا) دا وشەی(فەتا) بە واتای بەندە بەکار هاتبێت، ئەوە تەمەن گرنگی نییە، بەڵام بە واتای لاویەتی بەکار هاتبێت ئەوا خێزانی عەزیز زۆر لەو گەورەتر بووە، چونکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا سەرزەنشت کردنی خێزانەکەی عەزیزە کە ناوی (زولەیخا)یە.

هەروەها دەردەکەوێت ئەو ئافرەتە زۆر بەهێز و خاوەن توانایە و قسە ڕۆشتووە و توانای پلانگێری هەیە خاوەنی نفوز و دەسەڵاتیش بووە، هەروەها ژیانی یوسف لەو قۆناغەدا کەسێکی هەرزەکار و ڕەبەن بوو، هەموو هۆرمۆناتی لاشەی ڕژێنەری وروژاندنی سێکسی بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی پێغەمبەرە و مەعسومە (پارێزراوە) لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، هەروەها

پەروەردەکراوی ناو بنەماڵەی پێغەمبەران بووە، لەگەڵ ئەو کەشەدا لە بارەی ناو باڵەخانەکاندا، ئافرەتێک کە هەموو بیرکردنەوەی خۆ ڕازاندنەوە و بۆنی خۆش و دەرخستنی لاشە و ورژاندنی بەرانبەرەکەی بووە، هەروەها لە تەمەنێکی لێزانیدا بووە بۆ ئەوەی دەیەوێت ئەنجامی بدات پلانی بۆ داناوە زۆر بە ئەدەبەوە یوسف لەو پەڕی ڕاگریدا دەڵێت، من چۆن کاری وا ئەنجام ئەدەم، لێرەدا بە خوا پەرستی ناتوانێت کاریگەری لەسەر زولەیخا دروست بکات، بەڵکو وەکو سۆزێکی منداڵانە و لە هەمانکاتدا بە وەفا و پیاوانە دەڵێت: چۆن کاری وا لە من دەوەشێتەوە لە کاتێکدا ئەوەی منی پەروەردە کردووە مەبەستی عەزیزی میسرە، باشترین خزمەت و ڕێزی لە من گرتووە.

ژینگەکە زۆر ترسناکە ئافرەتێک جلەکانی لەبەر خۆیدا داکەندوە، هەموو دەرگاکانی لەسەر داخستوە، پێشتریش ئەم ئافرەتە خەریکی وروژاندنی هەستی یوسف بووە بە ناڕاستەوخۆیی، ئیتر ئێستا ئارامیی لێ هەڵگیراوە و توانای نەماوە خۆی لەبەردەم یوسف دا ڕووت کردۆتەوە، تەواو لە توانایدا نییە ڕاستەوخۆ پێیدەڵێت هیچ بوارێکی دەرچوونت نەماوە، هەر دەبێت کاری سەرجێیم لەگەڵدا بکەیت، یاخود ئەگەر تۆ نایەیت بۆ لام و ئەوە من دێمە لات لەگەڵتا ئەو کارە ئەجام ئەدەم، شێوە دەستدرێژییەکە لە ناموسی یوسف.

هەرچەندە یوسف سەرەتا پەنای گرت بە خوا و دوای پەناگرتنی خۆی بە خوا هیچ کاریگەری لەسەر ئافرەتێکی (ئەرستۆکراتی) بەرژەوەندچی کە هەموو ژیانی لەسەر حەزەکانی دامەزراوە، پاشان بیری خستەوە بە چاکە و پیاوەتی هاوسەرەکەی کە هاوسەری ئەوە و پاشان پەروەردەکاری من بووە لە منداڵییەوە، ئیتر هەموو ئەمانە سنوور بەزاندنە، خوای پەروەردگاریش سەرکەش و سەرەڕۆکان و زاڵمەکان ڕزگار ناکات.

ئەمە وەڵامی سەرەتا بوو، بەڵام کە وتی: (هَیتَ لَک) واتا هیچ چارەیەکت نەماوە، دیارە ماوەیەکی زۆریش ماوەتەوە بەو حاڵەتەوە، یوسف-یش هەر داوای لێ دەکات کە وازی لێ بهێنێت، بەڵام یوسف هەر مرۆڤە و هەموو توانا وروژاندنەکانی هاتۆتە هۆش و خرۆش ئەمەش بۆ گەنجێک کارێکی هەر وا ئاسان نییە زۆر ترسناکە، هەر چەندە هەندێک ئەوە بە دوور دەگرن کە یوسف هەستی بۆی جوڵابێت!

ئەمەش زیادەڕەویەکە دەکرێت لە حەقی یوسف، یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ وەکو هەموو مرۆڤێکی ئاسایی خاوەن توانای پیاوەتی بووە (سێکسی)، بەڵام ئەو لە شێوەی یەعقوبی باوکی جوبرەئیل گوایە هاتووە بە سەقفی ماڵەکەیانەوە خۆی نیشان داوە ئیتر کارەکەی نەکردووە، ئەمەش بەڵگەی لەسەر نییە و تەنها پێ دەچێت ئیسرائیلیات بێت و هیچی تر.

یوسف دەبێت هەست و سۆزی بۆی جوڵابێت، ئەگەر وا نەبێت کەواتە مرۆڤ نەبووە، موعجیزە و کارە گرنگەکە لەوەدایە کە یوسف هەموو گیانی ئارەزووی ئەو ئافرەتەی کردبێت، بەڵام خۆڕاگر بووە لەبەر خوا و ترسی خوای موتەعال وازی لەو کارە هێناوە، دانی بە خۆیدا گرتووە، جا ئەگەر وەکو هەندێک لە ڕاڤەکاران دەڵێن، هیچ سۆز و هەستێکی بۆی نەجوڵاوە، ئیتر گرنگی و هێز و خۆڕاگرییەکەی یوسف لە کوێدایە؟ بێگومان من ئەوە بە دوور دەگرم، حەزرەتی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ توانا و ئارەزووی تەواوەتی بۆی هەبووە، بەڵام لەبەر خوا وازی هێناوە، ناچار کە زولەیخا پەلاماری داوە ئەویش ڕایکردووو، تەنانەت کراسەکەی لە دواوە دڕاندووە، ڕووی تێنەکردووە، هەرچەندە لە تەفسیری مەناردا، محمد ڕەشید دەڵێت، لە یەکیان داوە کە یوسف نەیویستوە ئەو کارە ئەنجام بدات، ئەمەش بە دوور دەگرین، چونکە یوسف خزمەتکار و بەندەیەک بووە توانای لێدانی نەبووە لە خێزانی عەزیز، بەڵام بە دڵنیاییەوە لە دەستی ڕایکردووە، ئەو خۆڕاگرییەی یوسف پێغەمبەرایەتی دەردەخات ڕزگار بوونیەتی لەو فیتنەیە، چونکە نابێتە بەڵا و فیتنە و موصیبەت ئەگەر یوسف لە ڕووی ناخ و دەروونەوە هەستی نەجوڵابێت.

ئەوەش کە شێخ محمد ڕەشید ڕەزا دەڵێت لێیداوە، ئەگەر وابوایە حوجەی بەهێز دەبوو زولەیخا، بەڵام عەزیز بڕوا بە یوسف دەکات، نەک بە زولەیخا، پاشان ئەم کارە هەروا لە پڕێکدا ڕووی نەداوە، بەڵکو یوسف بە درێژایی تەمەنی لاوی (موراهقی) لەو میحنەت و ئازار و ڕاکردنە و خۆشاردنەوە دابووە لە دەستی ئەم ژنە سەرکەشەی عەزیز، بۆیە فیتنەکە زۆر لەوە گەورەترە لە ڕووداوێکدا مرۆڤ لێکدانەوەی بۆ بکات، بەڵکو ئەم ڕووداوە ئەنجامی چەندین ساڵە کە یوسف بە پاکی خۆی ڕاگرتوە و خۆی نەداوە بە دەستەوە، لەو حاڵەتەش کە لاواز بوو، خێرا گەڕاوە خوای گەورەش هاوکاری بوو، بە دڵنیاییەوە کە ئەو خراپەیەی لێ دوورخستەوە، بەردەوام نەبوو پرۆسەکە، لە پڕ عەزیزی میسر لە دەرگاکەوە دەردەکەوێت، ئەمەش بۆ خۆی هاوکارییەکی خودایە کە لەو کاتە عەزیزی میسر بۆچی گەڕاوەتەوە بۆ قەسرەکەی، خۆ ئەگەر قەدەری خوای گەورە نەبوایە و ئەو کەسە کە هاوسەریەتی نەگەڕایەتەوە ماڵ، زولەیخا ورووژاو بوو هەروا بە ئاسانی وازی نەدەهێنا، خوای گەورە کردی ئیرادەی وابوو عەزیز لە پڕ دەرگای لێ کردنەوە، ئەوەش بە دووری دەگرین کە ڕاست بێت و گوایە دەرگاکان لە خۆیانەوە کرابێتەوە، بەڵکو کە ڕادەکات و توانای دەرچوونی نییە کراسەکەی یوسف لە دواوە دەدڕێنێت، حەتمەن بە دەنگە دەنگی ئەوانەوە دەڕوات، (فوطیفار) دەرگا دەکاتەوە، دەبینێت خێزانەکەی لە حاڵەتێکی ورووژاوی زۆر ئاژەڵیدایە، ئەویش هاوسەرەکەی دەبینێت خێرا وتەی ئامادەکراوی پێ نییە دەڵێت: چی دەکەیت بەرانبەر بە کەسێک بیەوێت بەرانبەر هاوسەرەکەت کاری خراپە بکات؟!

بەردەوام زولەیخا لە درۆکردندایە دژی یوسف، خۆ هەر بەندەیەک بەرانبەر ئافرەتێکی ئازاد دەستدرێژی بکات، لایەنی کەم کوشتنە دەنا بە کوشتن وازی لێ ناهێنن، بەڵکو پارچە پارچە و

هەلا هەلای دەکەن، بەڵام تا ئەم ساتە وەختە زولەیخا عاشقی یوسف-ە عاشقێکی زۆر شێتانە، هیچی لا گرنگ نییە یوسف نەبێت، بۆیە لەگەڵ ئەوەی درۆی بۆ دروست دەکات، دەیشیپارێزێت و دەڵێت دەبێت زیندانی بکرێت و ئازارێکی زۆر لە زینداندا ببینێت.

یوسف لەوێدا بە تەواوەتی ئاشکرای دەکات کە نەخێر ئەوەی خێزانی عەزیز دەیڵێت ڕاست نییە، بەڵکو جەنابی عەزیز بزانە کە هاوسەرەکەت دەست درێژی کردۆتە سەرم و ئەو ویستوویەتی من کاری سەرجێی لەگەڵ بکەم و بە دڵنیاییەوە، منیش ڕەتم کردۆتەوە لێرەدا هەردوو لا بە تەنها بوون، پێویستە کە کەسێک بانگ بکرێت بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەم باسە، دەشێت عەزیز توانای بەسەر یوسفا نەبێت، چونکە ئەو بە دیاری پێشکەشی هاوسەرەکەی کردووە ئەمە ڕایەکی لاوازە، هەروەها دەشێت نەیەوێت لە ناو خەڵکیدا ئابڕووی بڕوات و خەڵک دەپرسێت هۆکاری کوژرانی بەندە و خزمەتکارەکەی چییە؟!

جا بۆیە بۆ ساغکردنەوەی ئەو باسە، کەسێکی هێنا تا شاهیدی بدات کامیان ڕاستی کردووە و کامیان درۆی کردووە، شاهیدی بە واتای بڕیار لەسەر شتێک کە نادیارە و کەس تاوانبار ناکرێت مەگەر بە گوێرەی شاهیدەکە کە دراوە لە کێشەکەدا، ئەویش بریتییە لە: ئەگەر کراسەکەی یوسف لە پێشەوە دڕابوو ئەوا ئافرەتەکە ڕاست دەکات و یوسف تاوانبارە، ئەگەر کراسەکەی یوسف لە دواوە دڕابوو ئەوە یوسف ڕاستگۆیە و خێزانت درۆزنە!

ئەم شاهیدییە بۆ ڕوونکردنەوەی ڕاستی و حەقە، کە بینیان کراسەکەی یوسف لەدواوە دڕاوە.

کە زانرا لە ١٠٠٪ یوسف بێ تاوانە و ئافرەتەکە تاوانبارە، عەزیز بە یوسفی وت گوێی پێمەدە و ئیهمالی بکە، چونکە خێزانە ئەرستۆکراتیەکان وان، گرنگ ئەوەیە حەیامان نەچێت، کەواتە یوسف بێ دەنگ بە و لەسەر ئەم کێشەیە مەڕۆ با لێرەدا کۆتایی پێبێت، بەڵام ئەگەر تاوان کەوتە سەر دەسەڵاتدار و خەڵکی مەخمەڵی ئەوا کەس گوێی پێنادات و ئیهمال دەکرێت، بەڵام یاسا و ڕێساکان لە دەوڵەتی دەسەڵاتی پادشا و خواپێداو و عەلمانییەکاندا تەنها بەسەر هەژار و بێ دەرەتانەکاندا پیادە دەکرێت، خەڵکی دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن ئەمەش حاڵ و گوزەرانی ژیانی خەڵکییە لە ئێستا و ڕابردوودا!

بەم شێوەیە کێشەکە لەوێدا پەردە پۆش کرا بۆ زولەیخای خاوەن دەسەڵات، بەڵام قەدەری خوای گەورەیە کە ئەم کێشەیە دەبێتە هۆکاری زیاتر ناوبانگی یوسف، ئەگەرچی ناڕەحەتی زۆری لەسەر دەکێشێ، هەواڵەکە لە ناو باڵەخانەی عەزیزەوە دزەی کردە ناو خەڵکی، قەسرێکی وا گەورە پڕە لە خزمەتکار و (حەشەم و خەدەم)، بەتایبەت لە نێوانی مەخمەڵییە بۆرجوازەکان، کەوتنە قسە هێنان و بردن و لە ناو شاردا باس باسی زولەیخا و خزمەتکارەکەیەتی، ئەمەش لە ڕابردوو و ئێستادا هەر یەک شکڵ و شێوەیە، لە ئێستادا لە ڕێگای گۆڤار و ڕۆژنامە و تۆڕە

کۆمەڵایەتییەکانەوە بە هەمان شێوەیە، لە سەرۆک و وڵاتەوە دەست پێ دەکات بۆ هونەرمەند و نووسەر و ئەکتەرەکان...هتد، جارانیش لە ڕێگای گواستنەوەی خزمەتکار و خەڵکی ترەوە هەواڵ بڵاو دەبووەوە.

هەروەها لە لایەکی ترەوە نەیاری عەزیزی میسر ئەم هەواڵە بڵاو دەکەنەوە، چونکە بە دڵنیاییەوە لە ناو دەسەڵاتەکەیاندا عەزیز نەیاری هەیە، بۆ شکاندن و سەر شۆڕکردنی ئەوەندەی تر باسەکە گەورە دەکەن.

﴿۞ وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي ٱلْمَدِينَةِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفْسِهِۦ ۖ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا ۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾﴾ يُوسُف.

واتە: (ژنانێک لە ئافرەتانی ناو شار ئەم دەنگ و باسەیان بیست بۆیە) وتیان: (سەیرە) ژنەکەی پاشا لاوەکەی خۆی بەگیر هێناوەو خۆشەویستی هەموو دڵ و دەروونی داگیرکردووە، بەڕاستی ئێمە بە ئافرەتێکی سەرلێشێواوی ئاشکرای دەبینین﴿٣٠﴾

هەمان قسەیە کە ئافرەتانی هەمان کلتورەکانی ژینگە جیاوازەکان دووبارەی دەکەنەوە و لە ڕێگای میوانداری و دانیشتنەکانیان و تەلەفون و نامە گۆڕینەوە، کلتوری ناو دەسەڵاتی میسریش هەر هەمان کلتورە، سرووشتی ئافرەتانی جیهانە هەموو وەکو توتی قسەکەیان دووبارە دەکردەوە دەیانوت (کچێ ئاگات لێیە ئەو ژنەی سەرۆک وەزیران حەزی لە خزمەتکارەکەی خۆیەتی)!

ئیتر ئەوە مانشێتی هەواڵەکانی ئەو سەردەمە بوو، دەیانوت ئەو ئافرەتە شێت و هار بووە بۆ خزمەتکارەکەی، هەر وەکو یەکەم جاربێت کاری وا ڕوو بدات، ئیتر قسە لە دوای قسە دروست دەکرا.

ئینجا بۆ خۆشکردنی دانیشتنەکەیان، هەر وەکو ئێستا هەندێک یەکتری بانگ دەکەن دەڵێن وەرە با تۆزێ دانیشین و زەمی ئەم و ئەو بکەین، بە شانازییەوە ئەم قسەیەش دەکەن!

ئەم خووە نا پەسەندە و کارە قیزەونە بە تایبەت لە ناو موسڵماناندا تاوانێکی زۆر گەورەیە، لای خوای گەورە سزاکەی زۆر قورسە، لە سورەتی (نور)دا بە گەورە و سەخت هەژمار کراوە لای خوای موتەعال.

لە دوای ئەم قسە و باسانە و سەرزەنشتانەی ناو خەڵکی خێزانی عەزیز هەڵسا بە ڕێکخستنی میوانداریيەک بۆ ئافرەتە مەخمەڵیەکان تا هەر چۆنێکە پۆزش بۆ کارەکەی خۆی بهێنێتەوە، چونکە زانیویەتی قسە و باسێکی زۆری لەسەر کراوە، وەکو کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسی بگرێت،

ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئافرەتێکی خاوەن جورئەت و بەهێز بووە، بۆیە بڕیاری دا لە بنەماڵە بۆرجوازیەکان بانگهێشت بکات پاشان ببێتە شاهید لە داهاتووودا لەسەر حەزرەتی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ.

﴿فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ۖ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴿٣١﴾ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ ۖ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ ۖ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾﴾ يُوسُف

واتە: کاتێ کە شاژن هەواڵی قسەو گوفتاریانی بیست، ناردی بەشوێنیانداو جێگەیەکی خۆشی بۆ ئامادەکردن، هەریەکەیان چەقۆیەکی دایە دەستی (بۆ میوە قاش کردن) (ئینجا فەرمانیدا بە یوسف و) وتی: ئادەی وەرە دەرەوە بۆلایان (با بتبینن)، کاتێ کە بینیان لاوێکی زۆر ڕێک و پێکە، (مەست و حەیران بوون) و دەستی خۆیان بڕی و وتیان: پاکیی و بێگەردیی و دووری لە هەموو کەم و کوڕییەک شایستەی خوایە، ئەم (لاوە) بەشەر نیە (ئەوەندە جوان و قەشەنگە)، ئەم (لاوە) هەر فریشتەیەکی قەشەنگ و جوان و پیرۆزە﴿٣١﴾ (شاژن) وتی: ئا ئەم (لاوە) کە ئێوە لۆمەی من دەکەن لەسەری (ئەوەیە ئێوەش مەست و حەیرانی بوون)، بێگومان من هەوڵم دا لە خشتەی بەرم، بەڵام ئەو خۆی گرت و خۆی پاراست و دوورەپەرێز بوو، خۆ ئەگەر ئەوەی من دەمەوێ نەیکات، ئەوە بەڕاستی دەبێ بەند بکرێ و دەبێ زەلیل ببێ﴿٣٢﴾

ماڵی ڕازاندەوە بە حەشەم و خەدەم، هەر لەو سەردەمەوە ئەتەکێتی خەڵکی بۆرجواز دەردەکەوێت کە بە چەقۆ و چەتاڵ دەستیان بە خواردنیان کردووە.

بەهەر حاڵ لە دوای بانگهێشت کردنیان لە لایەن ئەو ئافرەتە خاوەن جورئەتەوە کە دەیەوێت ڕووبەڕووی هەموو ئافرەتانی ناو ئەو چین و توێژە مەخمەڵییە ببێتەوە، لە باڵەخانەکەیان بۆ ئەم چینە ڕاقییە لە خەڵکی خوانی ئامادەکرد و هەریەکە چەقۆیەکی دا بە دەستیانەوە

گوایە لە سەردەمی هیکسۆسدا بە سێو وتراوە (متكأ) بە واتای (التفاح) هاتووە، ئەوەش وتەی جەنابی مامۆستا کرێکارە لە تەفسیری سورەتی یوسف دا، بە زاراوەی یەمەنی کۆن بە سێو وتراوە (متكأ) بە واتا شان دادانیش دێت.

هەموو دیمەنی ئەم ڕووداوانە لە ناو وشەکاندا خەڵکی خۆشگوزەران و دەوڵەمەند دەردەخات، یاخود چەقۆکەیان بۆ میوە بووە یان بۆ گۆشت خواردن بووە، خواردنەکە لە دەستی

یوسف دایە و ئەو خواردنە دابەش دەکات و بۆیە داوای لێ دەکات لە پشتی پەردەوە دەردەکەوێت، حەزرەتی یوسفیان بینی هەموو تووشی شۆک بوون لە جوان خاسی و باڵا و شێوەی دەم و چاوی، هەر کۆمەڵگەیەکیش لەسەر بنەمای وروژاندنی سێکسی تەماشای پیاو و ژن کرا کۆمەڵگەیەکی فاسیدە، ئەگەر ئەم دید و تێڕوانینە گۆڕا بوو بۆ تەماشاکردنی مرۆڤ، ئەوا بە دڵنیاییەوە کۆمەڵگەیەکی تەندروستە، ئەو کۆمەڵگەیە دیارە ئافرەتەکانی تەنها بە چاوی جوانی ڕوخسار و باڵا هەستیان جوڵاوە لە تاو جوانی یوسف دەستی خۆیان بڕی، بریندارکردنی دەستیان بە ئاگای هێنانەوە لە تەماشای یوسف، ئینجا بە سەرسامیەوە وتیان: ئەمە مرۆڤ نییە، بەڵکو لە جوانیدا هاوشێوەی فریشتەیە، لێرەدا وشەی فریشتە (الملائكة) بەکار هاتووە، کەواتە ئایینی ئیبراهیمیی لەو وڵاتەدا بوونی هەبووە، پاشماوەی ئایینی یەکتا پەرستی تێدا ماوەتەوە، ئەگەر چی لای ئەو ئافرەتانە بە خوار و خێچی بیر و باوەڕەکەیان وەرگرتبێ یان هەر ئایینی ئیبراهیم بەربڵاو بووە، بەڵام لە ڕووی تاوان و خراپەکاری و خۆشی ژیانەوە نغرۆ بوون. لەگەڵیدا تووشی شیرک و هاوبەشی دانان بوو بوون، بەڵام بنەڕەتی ئایینی ئیبراهیمی و تەوحید لە ناویاندا ماوەتەوە ئینجا جێی شەرم کردن و بێ پەردە و بە ئاشکرا وتی کە ئەوە ئەو کەسەیە کە لۆمەتان دەکردم، ئەم بێ شەرمی و ڕاستەوخۆ لە داننان بە کارەکەیدا زانی هەموو ئافرەتن و لە جنسی خۆین و ئەوانیش بەردەوامن لە هاوشێوەی کاری زولەیخا، بۆیە بە ڕاشکاوی بۆی باس کردن، یاخود کە لە جوانی یوسف هەموو دەستی خۆیان بریندار کرد، ئیتر هەنجەت و بیانووی باشی دایە دەست زولەیخا بڵێت، بۆ لۆمەی من دەکەن ئەوەتا ئێوە لە چەند چرکە ساتێکدا بینیتان دەستی خۆتان بڕی، ئەی من چیبکەم کە تەمەنێکە لەگەڵمدا دەژی، کەواتە دەمتان دابخەن و لۆمەم مەکەن جارێکی تر.

ئینجا شتێکی زۆر گرنگ باس دەکات و لە داهاتوووشدا دەبێتە شاهید بەسەر خۆیەوە دەڵێت داوام لێ کردووە کە لەگەڵما بێت و سەرجێی لەگەڵدا بکەم، بەڵام ڕووی نەداوە لەبەر ئەوەی یوسف کارەکەی ئەنجام نەداوە بە ئاشکرا و ڕوونی دەڵێت: من ئارەزوومەندم کارەکە بکەم، بەڵام بۆ لۆمەم دەکەن خۆ هیچ ڕووینەداوە!

کەواتە جارێ دەمتان داخەن هیچ ڕووی نەداوە، زۆر بێ شەرمانە و بە ئاشکرا لە ڕووی شانازی کردنەوە قسەکە دەکات دەڵێت من دەبێت هەر لەگەڵی بخەوم خۆ ئەگەر ڕازی نەبوو، ئەوا بە دڵنیاییەوە زیندانی دەکەم و بچووکی دەکەمەوە و ئازاری ئەدەم تا ڕازی دەبێت، ئەمە جۆرێکە لە هەڕەشە و تەهدیدکردنی یوسف، خودی یوسفیش گوێی لەم وتانەیە بۆیە لە ترساندا لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە کە تووشی تاوان نەبێت و پێدەچێت لە تاو گەورەی تاوانەکە پەشۆکا بێت، بۆیە هەڵبژاردەی زولەیخا هەڵدەبژێرێت دەڵێت خوایە زیندانم پێ خۆشترە لەو کارەی ئەنجامی بدەین، زانایان دەڵێن خۆ ئەگەر یوسف داوایەکی تری بکردایە خوای گەورە بۆی جێبەجێ دەکرد!

ئەم داوایەش بۆ ئەوە بوو کە ئیتر لە دەستی ئەم ئافرەتانە ڕزگاری بێت و نەکەوێتە ناو تاوان تووشی تاوان نەبێت، داوا لە خوای گەورە دەکات بیپارێزێت و ڕزگاری بکات لە دەستتان، دوعاکەی دوعایەکی عارفانەیە لە دەست تاوانی تاوانباران، خوایە لە پلان و فێڵیان ئاسوودەم بکە و زیندان بم باشترە تا تووشی ئەو کارە نا پەسەندە ببم لە تاوان.

﴿قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِۖ وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ٣٣ فَٱسۡتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنۡهُ كَيۡدَهُنَّۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٣٤﴾ يُوسُفَ

واتە: لە ترسی خوای گەورەو ئومێدی پاداشتەکەی بەندکردنی هەڵبژارد بەسەر تاوان کردندا، لەگەڵ ئەوەی لەوپەڕی گەنجێتی و جوانێتیدا بوو، ئافرەتەکەش لەوپەڕی جوانی و دەوڵەمەندی و دەسەڵاتدا بوو، فەرموویەی پەروەردگار سجن و بەند کردنم لەلا خۆشەویسترە لەوەی کە ئەوان بانگی منی بۆ ئەکەن لە خراپەکاری، ئێوە هەمووتان بە کۆمەڵ داواتان لە یوسف کرد کە کاری خراپتان لەگەڵدا بکات، ئەی پەروەردگار ئەگەر فرو‌فێڵ و نەخشەو پیلانی ئەوانم لەسەر لانادەی لەوانەیە منیش مەیلم بەلایاندا بچێ، ئەو کاتە لە خەڵکی نەزان و نەفام بکەم، لە خۆی ترساو پەنای بۆ خوای گەورە بردو خوای گەورەیش پەنای دا ٣٣ پەروەردگاری وەڵامی دایەوەو پاراستی لە نەخشەو پیلانی ئەوان، نەخشەو پیلانی ئەوانی لێ دوورخستەوەو لێی لایدا، بەڕاستی خوای گەورە زۆر بیسەرە بۆ دوعاو پاڕانەوە، زۆر زانایە بەحاڵی ئەو کەسانەی کە پەنا بۆ خوای گەورە ئەبەن ٣٤.

دوعا کردنەکەی گیرا بوو بۆ زیندان، چونکە خوای پەروەردگار دەبیستێت و بینایە ئەوەی یوسف داوای کرد خوای گەورە بۆی جێبەجێ کرد، بەمەش یوسف لە میحنەتی تاوان ڕزگاری بوو، بەڵام میحنەتێکی گەورەتر ڕووی تێدەکات ئەویش زیندانە.

زیندان ئاوا جێگایەکی ئاسان نییە، بەڵکو مرۆڤ ئەگەر وترا زیندانیت لە خۆشترین باڵەخانەشدا زیندانی بکرێت ئازاری تایبەتی خۆی هەیە، چجای ئەوەی زیندانی سەردەمی هەزاران ساڵ بەر لە ئێستا، زیندان سزایەکی زۆر سەختە تەنها بۆ خاوەنەکەی نا - بەڵکو بۆ کەسوکارەکەشی دەبێتە خەم و میحنەتی، بۆیە دەسەڵاتدارانی ملهوڕ هەمیشە پەنا بۆ زیندان دەبەن، بەڵام هەموو ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵان زیندانیان نەبووە، بەڵکو لە ئیسلامدا قیصاص هەیە، هەرکەس تاوانی کرد بە گوێرەی تاوانەکەی سزا دەدرێت و دوایی دەچێتەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆی.

بۆ حەزرەتی بەڵا و موصیبەتێکی تر هاتە پێشەوە ئەویش زیندانی کردنی جەنابیانە لە خاکی میسر قەلەندەر و بێ کەس و بێ کەسوکار، کەسیش سەردانی ناکات و بە دەمیەوە ناڕوات.

﴿ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُاْ ٱلْأٓيَٰتِ لَيَسْجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٍ﴿٣٥﴾﴾ يُوسُف

واتە: پاشان بۆیان دەرکەوت لە دوای ئەوەی ئەو نیشانانەیان بینی لەسەر پاکێتی یوسف، لە دڕاندنی قەمیسەکەی یان شایەتی دانەکە، یان دەستبڕینی خۆیان دوای ئەوە بڕیاریان دا کە بیخەنە بەندیخانەوە تا کاتێکی نادیار﴿٣٥﴾.

لەم ماوەیەدا لە زینداندا خوای گەورە فێری زۆر شتی کرد لەوانە خەو لێکدانەوە و وەحی و ئامادەکردنی بۆ کارێکی گرنگ تر، بەم شێوەیەش ڕزگاری بوو لە جەو و کەشی ناو باڵەخانەکانی ئەرستۆکراتی و کەشی جاهیلەکانی ئەو سەردەمە، ماوەی زیندانیەکەی یوسف دیار نییە (لە سێ ساڵەوە بۆ نۆ ساڵە) دەشێت ٥ بووبێت، دەشێت ٧ ساڵ بووبێت، بەڵام ئەوەی کە بڵاوە ٧ ساڵ بووە و هیچ بەڵگەیەکیشمان لەبەر دەست نییە.

ئینجا کۆتایی دێت بە ژیانی دەرەوە و ژیانی ناو زیندان دەست پێ دەکات ژیانی ناو زیندان دنیایەکی ترە زۆر جیاوازە لە دنیای دەرەوە، خەڵک تانەگیرێت و زیندانی نەکرێت هەست بەو ئازار و ناسۆرە ناکات، هەڵبەت باسی خەڵکانێک دەکەم کە بە زوڵم دەکرێتە زیندان، ساڵانێکی تێدا بەسەر دەبات، دەنا لە ئەوروپادا هەندێک کەس ئەوەندە دڕندە و پیسن بۆ ئەوە باشن کە هەموو ژیانیان لە زینداندا ببەنەسەر، چونکە ترسناکن بۆ کۆمەڵگە، بەهەر حاڵ بگەڕێینەوە لای حەزرەتی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەو کەسەی دەچێتە زیندان هاوڕێی بۆ دروست دەبێت، با بزانین هاوڕێکانی یوسف کێن؟!

﴿وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعْصِرُ خَمْرًاۖ وَقَالَ ٱلْأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزًا تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُۖ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴿٣٦﴾ قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَاۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْأٓخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱتَّبَعْتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشْرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيْءٍۚ ذَٰلِكَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ﴿٣٨﴾﴾ يُوسُف

واتە: دوو گەنجیش لەگەڵیدا خرانە بەندیخانەوە کە یەکێکیان نانەوای پاشا بووەو ئەوەی تریشیان خەمرو مەی بۆ پاشا دروست کردووەو پێی داوە، زانیان کە یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ لە لێکدانەوەی خەون ئەزانێ یەکێکیان وتی: من لە خەودا بینیم کە ترێ ئەگوشم و مەی لێ دروست ئەکەم بۆ پاشا، ئەوەی تریان وتی: من لە خەوندا بینیم کە نان لە بان سەرمەو هەڵمگرتووەو باڵندەش دێت لەو نانە ئەخوات، تۆ هەوڵی لێکدانەوەی ئەم خەونانەمان بۆ بکە ئێمە وا ئەبینین کە تۆ لە چاکەکارانی لە لێکدانەوەی خەون، یان چاکەکاری بەرامبەر بە

بەندییەکان ﴿٣٦﴾ فەرمووی: هیچ خواردنێکتان لەلایەن پاشاوە بۆ نایەتە ناو بەندیخانەوە ئیلا من پێتان ئەڵێم کە چ خواردنێکتان بۆ دێت پێش ئەوەی کە پێتان بگات، یاخود لە خەودا بۆتان نایەت ئیلا من پێتان دەڵێم: ئا ئەمە پەروەردگارم فێری کردوم، من قەومێکم بەجێ هێشتووە کە ئیمانیان بەخوای گەورە نییە، ئەوان باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نییە ﴿٣٧﴾ من شوێن دین و بیروباوەڕی باوک و باپیرانم کەوتووم ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب کە هەموویان پێغەمبەر بوونە، ئێمە بۆمان نییە هیچ جۆرە شەریکێک بۆ خوای گەورە بڕیار بدەین. ئەمە فەزڵ و چاکەی خوای گەورەیە بەسەر ئێمەو تێکڕای خەڵکی بەوەی پێغەمبەرانی بۆ ناردوون، بەڵام زۆربەی خەڵکی شوکرانەبژێری نازو نیعمەتەکانی خوای گەورە ناکەن﴿٣٨﴾.

دوو کەس لەگەڵیدا خرانە زیندان، لە دوایدا دەردەکەوێت کە ئەم دوو کەسەش لە دەست و پێوەندی تایبەتی پادشان، دیارە ئەو زیندانەی یوسف تێیدا بووە، پەیوەست بووە بەوانەی کە لە ناو دەسەڵاتدا کاریان کردووە.

خوای پەروەردگار ڕاستەوخۆ دەیباتە ناو زیندانەکە و کەشی ناو زیندان و هاوڕێیەتی زیندانەکان، لە هەمووی گرنگ تر دیسان پرسی خەون بینین دێتەوە ئارا، ئەو دوو کەسە خەون دەبینن، هەردوو کەسەکەش بینینی خەونەکەیان پەیوەندی هەیە بە کاری ڕابوردوویانەوە، کە لە ناو قەسری پادشادا مەیگێڕ و چێشتلێنەر بوون، خەونەکەشیان پەیوەستە بە کارەکەیانەوە حەزرەتی یوسف نەیفەرموو ئێوە پێشتر کارەکەتان ئەو کارە بووە، دیارە بە خەیاڵی کارەکەتانەوە خەوتون، نا - بەڵکو ڕێک تەفسیری خەونەکەی بۆ کردن بۆی لێکدانەوە، چونکە پەیوەست بوو بە قەدەریانەوە.

هیچ مێژوو و بەڵگەیەکم لەبەر دەستا نییە، هۆکاری زیندانی کردنەکەیان چییە بەڵکو لێرەدا پرسی خەون و فریشتەکە بۆ ئێمە گرنگە کە ئاماژەیە بۆ قەدەری مرۆڤ ئاگادار کردنەوە ئاماژەیەکی (سیگناڵێکی) خوای پەروەردگارە بۆ هەموو بەندەکانی بە کافر و موسڵمانەوە.

خەونی یەکێک لە زیندانیەکانی هاوڕێی یوسف دەڵێت: خەریکی گوشینی ترێ بووم بۆ مەی، ئەویتریش لە هاوڕێکەی لە خەوندا بینیویەتی نانی لەسەر سەری هەڵگرتووە و باڵندە لە نانەکەیان خواردووە.

لە ناو زیندانیشدا، هەرکەس بیروباوەڕی خۆی دەخاتە بەردەمی خەڵکی، جێگای بانگەوازە بۆ هەموو بیر و باوەڕێک، یوسفیش پێغەمبەرێکە و ئەرکی سەر شانی بانگەوازە، چۆن هەلی زیندان بەکار ناهێنێت لەگەڵ زیندانییەکاندا بۆ ڕاستکردنەوەی بیر و باوەڕیان و بڵاو کردنەوەی یەکتا پەرستی.

جیاوازی لە نێوان خەڵکی ئازاد و زیندانییەکان بۆ بانگەواز، هەموو مرۆڤێک حەقی ئەوەی هەیە لە هەر بار و زروفێکدا بێت بیر و باوەڕی ڕاست بکرێتەوە لە شتی گەندەڵ و خراپەکار ئاگادار بکرێتەوە، پەروەردگاریەتی خوا و خوایەتی لە بەندایەتی بۆ خەڵکی ڕوون بکرێتەوە، یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ دەستی کرد بە بانگەواز لەگەڵ هاوڕێکانی زیندانی کە سەرقاڵ بوو مێشک و ژیان و هەموو بیرکردنەوەی بۆ ئەو کارە تەرخانە.

سەرەتا دڵنیایان دەکاتەوە لەوەی کە تەفسیری خەونەکەیان بۆ دەکات و خەونەکەیان بۆ لێکئەداتەوە، لەبەر ئەوە خوای پەروەردگار فێری زانستی خەون لێکدانەوە زانستی (لدُن)ی کردووە، ئەمەش هەموو پەیوەندی هەیە بەوەحی پێغەمبەرانەوە تایبەتە بە خودی پێغەمبەران، هەموو ئەمانەش پەیوەندیان هەیە بەو ئاستە بەرزەی لە بەندایەتی یەکتا پەرستی خوای موتەعال لە لایەن پێغەمبەرانەوە.

لە هەمانکاتدا دەیەوێت هاوڕێکانی زیندانی لە شیرک ڕزگار بکات، جا لە چرکەساتی یەکەمەوە حەزرەتی یوسف متمانەیەک لە نێوانی خۆی و هاوڕێکانیدا دروست دەکات لە ڕێگای لێکدانەوەی خەون بۆ کەسایەتی خۆی و پاشان متمانە لە نێوان ئەوان و ئایینی خوایی کە یوسف بانگەوازی بۆ دەکات.

لە ڕێگای زانستی (لەدونی) (لدُن) ئاگاداریان دەکاتەوە کە خەونەکەیان بۆ لێکناداتەوە تا خواردن و خۆراکێکی باشیان بۆ دێت بۆ زیندانەکە، کە ئەمەش جێگای بڕوا نەبوو، هەمیشە خواردنی زیندان خواردنێکی ناخۆش و پەسەند و تەندروست نییە، لە هەمان کاتدا لە ڕێگای نەرم و نیانی کەسایەتی خۆی لەسەر خۆیی سەرسامیان دەکات بە کەسایەتی خۆی، بەم ئاگادار کردنەوەیە کە خواردنی باش دێت بۆ زیندانەکە - جا لە ڕێگای خێرخوازەوە بێت یان لە ڕێگای زولەیخاوە بێت، چونکە مەعشوقەکەی کە یوسف-ە لە زینداندایە و وەکو جاران خواردنی باش ناخوات دڵی بۆی دەسووتێت و هیوا و ئاواتێکیشە لای خێزانی عەزیز کە دڵی یوسف بە لای خۆیدا ڕادەکێشێت، یوسف لە ڕێگای وەحیەوە دەزانێت کە خواردن دێت بۆ زیندانەکەیان، سەرەتا هیچ کام لە زیندانییەکان بڕوا ناکان چونکە ئەوە ڕووی نەداوە، پێدەچێت پاسەوانەکانیش گوێیان لە وتەکەی یوسف بووبێت، بەڵام زەردەخەنە ئەوانیشی گرتبێت کە شتی وا ڕوو نادات، بەهەر حاڵ ئەوەی یوسف وتی ڕوویدا، قسەکەی ڕاست دەرچوو کە هەمووشیان خوارد و زیاتر یوسف لە ناو زینداندا جێگای متمانە و خۆشەویستی تر بوو، ئیتر ئەوەش کاتی ئەوەیە کە بانگەواز دەست پێبکات و لە بارە بۆ بانگەواز، لە دوای ڕوودانی ئەم ڕووداوە خستیە دڵیان کە زانینی ئەم کارە لە لایەن خوای پەروەردگار بووە، زانینی هەواڵەکە وەحی بووە، پاشان خۆی ناساند کە پێغەمبەرە سەلامی خوا لە هەموو پێغەمبەران بێت.

ئینجا دڵنیاکردنەوەی دوو هاوڕێکەیەتی کە لێکدانەوەی خەونەکەشیان لە خۆیەوە نییە، بەڵکو هەر بە زانستێک لێکی ئەداتەوە کە (العلم اللدني)ە ئەم زانستەش ڕێک پەیوەستە بە وەحی خواییەوە.

پاشان ئاماژە بە شتێک دەکات کە دوو خوێندنەوە هەڵدەگرێت، یەکەم ناساندنی خۆیەتی لەگەڵ دینەکەی، دووەمیش ڕوونکردنەوەی ئەو واقیعەی تێدا دەژین، حەزرەتی یوسف دەفەرموێت: من لە ناو میلەت و خێزان و هۆزێک بووم کە مەبەستی بنەماڵەی عەزیز و زولەیخا-یە، کە بڕوایان بە تەوحید و هەروەها ڕۆژی دوایی نییە!

چونکە ئەو دوو کەسە و ئەوانەی تریش کە لەگەڵیدا بوون یان تەنها ئەو دوو کەسە بووە ئەوەش نازانین دیار نییە، بەڵام بەهەر حاڵ کە کافر بوونی بنەماڵەی عەزیز و زولەیخا ئاشکرا دەکات و بڕوایان بە خوا و ڕۆژی دوایی نییە، مەبەستەکە زیاتر بۆ ئەوەیە کە دوو کەسەکە و کەسانی تریش لەسەر ئایینی ئەوانن، بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی توخمێکی سەرەکی بیروباوەڕە لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەران، لێرەدا دەیەوێت ئەوانەی کە زیندانن لەگەڵیدا ڕزگاریان بکات لە بیروباوەڕی هاوبەش دانان و خوار و خێچ و ئەوانەشی لەگەڵیدا لە دەست و پێوەندی پیاوانی باڵەخانەی پاشان.

لێرەدا یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ ڕووبەڕویان نابێتەوە ڕاستەوخۆ بڵێت ئێوە کافرن، بەڵکو لە ڕێگای میللەت و قەومەکەیانەوە بیروباوەڕی خراپیان دەردەخات، بۆ ئەوەی هەر لە سەرەتاوە ڕق و کینە نەیانگرێت، بەڵکو بە شێوەیەکی جوان و باش پەیامەکەی خۆی دەگەیەنێت، پاشان دوای ڕوونکردنەوە و بەیان کردنی میللەتی کوفر و ناساندنی، ئینجا نۆبەی ڕوونکردنەوەی ئیمان و خواناسی و یەکتاپەرستییە، خۆی دەناسێنێت لە ڕێگای پەیامی باوک و باپیرانی ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب، کە ئەمانە هەموو زنجیرەیەک لە پێغەمبەران بوون و منیش لەو بەرەباب و خانەوادەم و منیش وەکو ئەوان پێغەمبەرم و هەموو بڕوامان بە خوای گەورە بووە هاوبەشمان بۆ ئەنجام نەداوە لەسەر بیروباوەڕی یەکتاپەرستی بووین.

ئەم میللەتە بە تەوحید ناسراون و کە هاوبەش بۆ خوا ئەنجام نادەن، خەڵکی هیدایەت ئەدەن بۆ ڕێگای یەکتاپەرستی، ئەمەش کاری ئەم پێغەمبەرانە بووە بە گشتی بەڵام زۆرینەی خەڵکی وا ئەزانن تووشی هاوبەشدانان و خراپەکاری دەبن، سوپاسگوزاری خوای موتەعال نابن.

ئەم پێشەکییەی یوسف بۆ ڕۆشنکردنەوەی واقیعەکە و ناساندنی خۆی زۆر گرنگە ئینجا دوای ئەوە ڕاستەوخۆ بانگەوازەکە ڕوون دەکاتەوە کە خوای پەروەردگار داوای چیمان لێ دەکات.

﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ۝٣٩ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ۝٤٠﴾ يُوسُف

واتە: پاشان یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ ڕووی کردە ئەو دوو گەنجەو بانگی کردن بۆ یەکخواپەرستی و فەرمووی: ئەی هەردوو هاوەڵەکەی بەندیخانەم ئایا کۆمەڵێک پەروەردگاری لێک جیاواز باشترە کە ئێوە ئەیانپەرستن یاخود تەنها خوایەک کە (الله) یە و تاک و تەنها و باڵادەست و بەتوانایە ۝٣٩ ئێوە هیچ شتێک ناپەرستن لە غەیری خوای گەورە تەنها کۆمەڵێک ناو نەبێت کە ئێوە خۆتان و باوک و باپیرانتان ناوتان ناوە، خوای گەورە هیچ بەڵگەی لەسەر ئەو ناوانە و پەرستنی ئەو شتانە نەناردۆتە خوارەوە،حوکم و بڕیاردان تەنها بۆ خوای گەورەیە. خوای گەورە فەرمانی کردووە کە هیچ کەسێک نەپەرستن تەنها خوای گەورە نەبێ بەتاک و تەنهاو شەریکی بۆ دانەنێن ئا ئەمە ئایینی ڕاست و دامەزراوە کە خوای گەورە بەڵگەی لەسەر ناردۆتە خوارەوەو فەرمانی پێکردووە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم شتە نازانن ۝٤٠.

بۆ ڕاکێشانی سەرنج و پاشان یەک ئاست لە نێوانیاندا بۆ بانگەواز یوسف وشەی هاوڕێ بەکار دەهێنێت، ئەمەش جۆرێکە لە هونەری بانگەواز و ڕاکێشانی دڵی بەرانبەر، ڕاستەوخۆ دەڕواتە ناو قووڵایی بانگەواز و بیر و باوەڕ کە جەستەی بنەڕەتی ئایینی پیرۆزی هەموو پێغەمبەرانە ئەویش ئیسلامە، بە شێوەیەکی ئەقڵانی پوخت سەرنجیان

ڕادەکێشێت بۆ ئەوەی کە ئایا فرە خوایی چاکە یان خوایەک خاوەنی دەسەڵات،هێز و قودرەت بێت و ئاگادار و چاودێرە بەسەر بەندەکانیەوە؟ بانگەوازێکی بابەتیانە و دوور لە هەڵگرتنی دەمە دەمێ و ڕوو بە ڕوو بوونەوەی وتە و باس، چونکە بانگەوازەکەت لە شێوەی پرسیار وایە و پاشان ئاخافتە لەگەڵ سرووشت و ناخی مرۆڤ، پرسیارێکی فیطرییە چونکە هەموو کەسێک بە فیطرەتی دەزانێت، تەنها یەک خوا بوونی هەیە ئەویش تاک و تەنهایە، فرە خوایی خەڵکی خاوەن ئەقڵ و هۆش و بیر و هزر دەزانێت، پرسیار گەلێکی زۆر بە دوای خۆیدا دەهێنێت و کۆتایەکی بە ئەقڵانیەت و کۆتایی نایەت، بەڵکو یان دەمارگیریە، یاخود دەبەنگی، ئەوەی کە پێویستە و حەقە پەرستنی بۆ بکرێت خوایەکە تاک و تەنها بێت، خاوەنی شەریعەت بێت بۆ مرۆڤەکان، ناشگونجێت خەڵکی بزانێت خوای موتەعال تاک و قەهارە، ئیتر بۆ چرکە ساتێکیش پەرستن بۆ خواکانی تر ناکات کە بوونەتە هاوبەش و شەریک لەگەڵ خوای تاک و کردگاری ئەم بوونە.

لەگەڵ ئەوەی سیفاتی قەهاری هەیە دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو دروست کراوەکانی، چاکترە گەردنکەچ بێت بۆ ئەو یان بۆ فرە خوایەک توانای پاراستنی خۆشی نییە؟!

ناردنی ئەم پێغەمبەرانە بە شەریعەت واتای تەنها دروشمەکان نییە، بەڵکو ئازار و بانگەواز و جیهاد و خوێن ڕشتن لە پێناوی ئەم دینە بۆ بەندایەتی هەموو لایەنەکانی ژیانە لە ڕووی یەکتا پەرستییەوە، کاتێک باسی یەکتاپەرستی دەکەین، مانای وا نییە تەنها لە ناسینی یەک خوایە. ڕاستە ئەوە بنەڕەتە، بەڵام یەکتاپەرستی لە پەروەردگاریەتی بە واتای ئیدارەی ئەم کەونە و بە هەموو شتێکی لە ورد و درشتی تا دەگاتە هەر شتێک ناوی مەخلوقە خوای گەورە یاسا و ڕێسای بۆ داناوە، ناکرێت بڵێین خوای گەورە یاسای سرووشتی داناوە بۆ گەردوون و یاساکانی فیزیا و کیمیا...هتد، یاسا بۆ مرۆڤ دانەنێت و بڵێین ئێمە خۆمان یاسا داڕێژەر دەبین!

یەکتاپەرستی لە خواپەرستی بەواتای هەرچی دروشمی و بەندایەتی و قوربانی و قوربانیدان هەمووی بۆ زاتی بەرزیەتی.

یەکتاپەرستی لە شەریعەت، بە واتای بێجگە شەریعەتی خوای گەورە هیچ شەریعەتێک نییە جێگای بڕوا و پیادەکردن بێت.

یەکتاپەرستی لە شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوادا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ کۆتا پەیامهێنەرە و لە جەنابیان زیاتر نابێت و ناگونجا و کوفرە شوێن هەر کەسولایەک و سەرکردە و تاغوتێک بکەوین...هتد.

ئینجا حەزرەتی یوسف وێنا و کار و کرداری جاهیلی دەخاتە پێش چاویان و واقیعەکان بۆ ڕوون دەکاتەوە پێیان دەڵێت: لەوەی کە ناوتان لێناوە خوا یاخود خواکان ئەمە تەنها نازناوە و خۆتان و باوباپیرانتان بۆتان داتاشیوە، جا هەر ناوێکە لە مرۆڤی پادشا و طاغوطەکان یان فریشتە و جنۆکە، یان هەر بت و دارێک ئەمانە هەموو هیچیان پێ نییە لە ڕووی پەروەردگاریەوە، تەنها خوای مەتەعال خاوەنی پەروەردگارێتییە.

ئەم پەروەردگارێتییەش حوکم و دەسەڵات لە خۆ دەگرێت، ئیتر دەسەڵاتدارانی سەر زەوی و لە طاغوت و پادشا و سەرۆک و سیستەمەکان، تەنها بە ئەندازەیەکی بچووک لە چوارچێوەی سنووری وڵاتێک یاخود زۆر جار شارێک خاوەنی دەسەڵاتە، خوای گەورە خاوەنی ئەم گەردوونەیە، ئەوانەی ئێوە ناوتان ناون بە پەروەردگار هەموو قسەی خۆتانە و لە چوارچێوەی بیر و بۆچوونی کورتی خۆتان و باوباپیرانتان ناوتان ناون خوا، خوای گەورە خاوەنی سوڵطە و حوکم و دەسەڵاتە، کە دەبێت لە ڕێگای شەریعەتەکەیەوە پیادە بکرێت.

ئینجا حەزرەتی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ لێرەدا بزماری لە تابوتی جاهیلی ئەو سەردەمە و هاوبەشدانان لە یاسا و ڕێسا و دەسەڵات ئەدات و ئەچەقێنێت و دەفەرموێت: هەموو ئەمانەی باسمان کرد لە بەندایەتی دروشم و خواپەرستی کە وشەی عیبادەت دەگرێتەوە هەمووی، حوکم و فەرمانڕەوایش هەردەچێتەوە ناو بەندایەتی و خواناسی بۆیە حوکم و دەسەڵات تەنها هەر بۆ خوایە، جا هەر ئەوەشە کە وای کردووە پێمان بڵێت کە ئەو زاتە خاوەنی دەسەڵاتە، دەبێت خاوەنی پەرستش بێت، بە پێچەوانەوە ئەگەر زاتی پاکی بپەرستین دەبێت توانای حوکمڕانیشی هەبێت، کەواتە هاوکێشەکە تەواو نابێت لە بەندایەتی ئەگەر خۆت بە تەواوەتی ڕادەستی خوای پەروەردگار نەکەیت.

هەر بۆیە حەزرەتی یوسف دەفەرمووێت: فەرمانی پێکردووین تەنها زاتی پاکی بپەرستین و هەموو پەرستراوێکی تر کوفرە و بەتاڵە.

یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ کۆی باسەکەی لەسەر یەک خاڵی جەوهەری بوو کە ماددەم خوات ناسی بەڕاستی دەبێت حوکم و فەرمانڕەوایش بگەڕێتەوە بۆ زاتی بەرزی.

ئینجا یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ لە ئەنجامی ئەو دوو پرسە گرنگە لە حوکم و بەندایەتییە، ئەو دوو چەمکە دین ڕاوەستاو دەکەن و (قەوامە)ی پێدەبەخشن بۆیە فەرمووی: ئەگەر ئەو دوو پرسە لە دیندا ئەنجام درا ئەوە بە دڵنیاییەوە دینێکی تەواو ڕاوەستاوە و خوا پەرستی ڕاستەقینە و حەقە.

بەڵام هەر حەزرەتی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ لێرەدا بە پێچەوانەی زۆرینەی دیموکراسی کە زۆرینە خاوەنی ڕایە، بەڵام جەنابیان دەفەرموون زۆرینەی خەڵکی بێئاگا و نەزانە لەم پرسانە، کە سەرەکیترینە لە ناو هەموو پرسەکانی بەندایەتیدا.

حەزرەتی یوسف بە کۆمەڵێک وشەی زۆر کەم توانی تەواوی بیروباوەڕی یەکتاپەرستی لە خواناسی و حوکمڕانی بخاتە بەردەمیان، شیرک و هاوبەش دانانیان بۆ ڕوون بکاتەوە، ئایینی ڕاستی و دروستیان پێ بناسێنێت، بنەڕەتی بەندایەتییان فێربکەن کە هەر شتێک بونیادەکەی ڕاست و دروست بوو ئەوکات بینای زۆر شتی لەسەر دەکرێت و خۆڕاگر دەبێت. لێرەدا هەردوو هاوڕێکەی زیندانی گوێیان گرتووە بۆ وانەی یوسف کە دووبارە شتێک ڕوو ئەدات، چونکە ناساندنی حوکم و خواپەرستی ڕاست دابەش دەبێت بەسەر ئەم دوو هاوڕێیەدا، یەکێکیان دەگەڕێتەوە بۆ باڵەخانەکەی پادشا و ئەمیش لەسێدارە ئەدرێت و دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای پەروەردگار، کەواتە کەسێک گرنگە لە قەسری پادشاییدا خاوەنی ئەم بیروباوەڕە بێت کەسێکی تریش کە دەمرێت زۆر پێویست ترە کە خاوەنی ئایینی ڕاست و دروست بێت و بتوانێت لە قیامەت دا پێناسەی ئایینی ڕاستی هەڵگرتبێت.

﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾﴾ يُوسُفَ

واتە: دوای ئەوەی باسی تەوحیدو یەکخواپەرستی بۆ کردن ئینجا لێکدانەوەی خەونەکانیان بۆ دەکات و فەرمووی: ئەی هەردوو هاوەڵەکەی بەندیخانەم یەکێک لە ئێوە ئەگەڕێتەوە سەر ئیشەکەی پێشتری و مەی بۆ پاشا ئەگرێتەوەو پێی ئەبەخشێ، ئەوەی تریشیان کە نانەواکەیە لە خاچ ئەدرێ و ئەکوژرێ. ئەو کاتە باڵندە لەسەری ئەخوات وتراوە خەونیان نەبینیوەو ویستویانە تاقی بکەنەوەو کە بۆی لێکدانەوە وتیان درۆمان کردو خەونمان نەبینیوە، یوسفیش عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەو خەونەی کە ئێوە پرسیارتان لێی کرد بڕیاری لەسەر دراو بەو شێوازە ئەبێت و کۆتایی هات ﴿٤١﴾ بەو کەسەی وت کە گومانی ئەبرد کە ڕزگاری ئەبێ و ئەگەڕێتەوە بۆ لای پاشاو مەی بۆ دروست دەکات، کاتێک گەڕایتەوە بۆ لای پاشا حاڵی منی بۆ باس بکە کە بەبێ تاوان خراومەتە بەندیخانەوە، ئەویش بەربوو گەیشتەوە لای پاشا بەڵام شەیتان لەبیری بردەوە کە باسی یوسف-ی عَلَيْهِ السَّلَامُ بۆ بکات لە ماوەی سێ تا نۆ ساڵ یوسف هەر لە بەندیخانەدا مایەوە بەبێ تاوان ﴿٤٢﴾

کە خەونەکەی بۆ تەفسیر کردن دڵنیاشی کردنەوە لە ڕاستی و دروستی لێکدانەوەکەی، چونکە زانستێکی وەحییە و خوای گەورە پێی بەخشیوە لە خۆیەوە قسە ناکات، خەونی هاوڕێی یەکەمی بریتی بوو لەوەی کە دەگەڕێتەوە بۆ کۆشکی پادشا و خەونی هاوڕێی دووەمی لە سێدارە دەدرێت و چارەنووسی مردنە، ئەوەش کە وتی بە دڵنیاییەوە دێتە دی و ڕوو ئەدات.

پاشان یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ باسی حاڵی خۆی کرد بۆ ئەوەی ئەوەیان کە دەچێتەوە کۆشکی پادشا کە بە هۆکاری چی گیراوە چۆن لە لایەن خێزانی عەزیزەوە زوڵمی لێ کراوە، جارێکی تر یوسف ویستی (کەیسەکەی) یان کێشەکەی پادشا چاوی پێدا بخشێنێت و پشکنینی بۆ بکات بۆیە ئەم داوایەی لە هاوڕێ زیندانییەکەی کرد، بەڵام شەیتان لە بیری بردەوە ماوەیەکی زۆر لە زینداندا مایەوە کە پێ دەچێت ماوەکەی لە ٧ ساڵ بۆ نۆ ساڵ بووبێت.

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، جیاوازی نێوان حوکم بردنە لای طاغوت و زوڵم کردن لە کەسێک لە وڵاتێک کە داوای دادپەروەری دەکات دوو شتی زۆر لەیەک جیاوازن، یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ بە هەموو یاسا و پێوەرێکی سەر زەوی زوڵمی لێکراوە و تاکە هەڵبژاردەیشی ئەوەیە کە کێشەکەی جارێکی تر چاوی پێدابخشێنرێت و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت، چونکە بەڵگەکان شێوێنراوە و ڕاستی شاراوەتەوە، ئەمە پێی ناوترێت حوکم بردنە لای طاغوت، بەڵکو حوکم بردنە

لای طاغوت ئەوەیە مرۆڤ دوو هەڵبژادەی هەیە، هەڵبژاردەی حوکمی خوا و حوکمی طاغوت، بەڵام بە حوکمی خوا ڕازی نییە و کێشەکەی دەباتە لای طاغوت و خوانەناس.

لە کۆتاییدا خوای موتەعال ویستی چۆن بێت دەبێت ڕوویدات، ئەویش دیارە زیاتر بۆ پێگەیاندنی حەزرەتی یوسف بووە لە ناو زینداندا و بەرزکردنەوەی پلە و پایەی بووە، بەش بە حاڵی خۆم لەوە دڵنیا بووەتەوە، هەر کەس بە ناحەق بخرێتە زیندان لە کۆتاییدا خوای گەورە پاداشتی ئەداتەوە جا لە دنیا بێت و یاخود لە قیامەت، بەڵام ئەوەی زیاتر بۆم دەرکەوتووە خوای گەورە پاداشتی ئەداتەوە سەرەتا لەم دنیادا و پاشان پاداشتی قیامەتیش هەر وەردەگرێت.

با بزانین خوای گەورە چۆن قەدەری یوسف عَلَيهِ السَّلَام ڕێکدەخات بۆ بەرزکردنەوەی لە دنیادا و پاداشتی ئەو چەند ساڵەی بۆ قەرەبوو دەکاتەوە کە بە ناحەق لە زیندان خزێنراوە، خوای گەورە وا ڕێکی دەخات کە هۆکارێک دروست ببێت تەنها یوسف تایبەتمەند بێت لەو بوارەدا و هەموو دەستەنەخواری ئەو بن، بێ ئەو کارەکە چارەسەر نەکرێت، ئەویش خەو بینینی پادشایە[٥].

﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ۝٤٣ قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ۝٤٤ وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ فَأَرۡسِلُونِ ۝٤٥ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَعۡلَمُونَ ۝٤٦ قَالَ تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ ۝٤٧ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ سَبۡعٞ شِدَادٞ يَأۡكُلۡنَ مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ ۝٤٨ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ ۝٤٩﴾ يُوسُفَ.

واتە: پاشای گەورە خەونی بینی وتی: من لە خەوندا حەوت مانگای قەڵەو ئەبینم حەوت مانگای لەڕ ئەو حەوت مانگا قەڵەوانە ئەخۆن، حەوت گوڵەگەنمی سەوز و حەوت گوڵەگەنمی وشکیش ئەبینم، فاڵچی و خەونلێکدەرانی کۆکردەوەو وتی: ئەی پیاوماقووڵان و دەسەڵاتداران هەواڵی ئەم خەونەم پێ بدەن ئەگەر ئێوە لێکدانەوەی خەون ئەکەن ۝٤٣ وتیان: ئەمە خەونێکی تێکەڵ و پێکەڵە و هیچ حەقیقەتێکی نییە، ئێمەش هیچ لێکدانەوەی خەون نازانین و لە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥] لە کۆی گشتی باسی یوسف (علیه السلام) بە پشتیوانی خوا باسێکی خەوبینین و لێکدانەوەی ئەو زانستە بە شێوەیەکی قووڵ باس دەکەین لە لایەن زانایانی ئەو بوارەوە.

لێکدانەوەیدا زانا نین ﴿٤٤﴾ ئەوەی کە لە بەندیخانە ڕزگاری بوو لە پاش ماوەیەک یوسفی بیر کەوتەوەو بە پاشاکەی وت من هەواڵی ئەم خەونەتان بۆ دێنمەوە بمنێرن بۆ لای یوسف ئەو لێکدانەوەی خەون ئەزانێ، ڕۆیشت بۆ لای یوسف و پێی وت: ﴿٤٥﴾ ئەی یوسفی هاوڕێی بەندیخانەم، یان زۆر ڕاستگۆ، لێکدانەوەی ئەو خەونەمان بۆ بکە کە حەوت مانگای لەڕ حەوت مانگای قەڵەو ئەخوات حەوت گوڵە گەنمی سەوزو حەوتی وشک، بەڵکو بگەڕێمەوە بۆ لای خەڵکی (پاشا) بەڵکو لێکدانەوەی خەونەکە بزانن ﴿٤٦﴾ یوسف سەرزەنشتی نەکرد کە بۆچی منت لە یاد کرد، بەڵکو خەونەکەی بۆ لێکدایەوەو فەرمووی: حەوت ساڵی یەک لە دوای یەک ئێوە کشتوکاڵ ئەکەن ئەوەی کە بەرهەمی دێنن ئەوە لەناو گوڵە گەنمەکاندا بیهێڵنەوەو لێکی جیا مەکەنەوە بۆ ئەوەی تێکنەچێت، تەنها کەمێک نەبێ لەوەی کە ئەیخۆن، واتە: لێکدانەوەی خەوەکەی بەوە بۆیان کرد حەوت مانگا قەڵەوەکە بە حەوت ساڵ کە پیت و بەرەکەت ئەبێ، حەوت مانگا لاوازەکە بە حەوت ساڵ کە وشکەساڵی و نەبوونی ئەبێت ﴿٤٧﴾ لە دوای ئەوە حەوت ساڵ دێت کە سەخت و بێبارانی و وشکە ساڵی ئەبێت، ئەوەی کە هەڵتان گرتووە ئەوە ئەخۆن، تەنها کەمێک نەبێ کە هەڵی ئەگرن ﴿٤٨﴾ دوای ئەوە ساڵێک دێت ژیان خۆش ئەبێت و باران دەبارێت و ئاوی نیل دێت، ترێ و میوە ئەگوشن و هەڵیئەگرن، یاخود ئاژەڵەکانتان شیریان زۆر دەبێت و دەیاندۆشن﴿٤٩﴾.

ئێستا با بڕۆین بۆ کۆشکی پادشا و زیندان جێ بهێڵین، لە کۆشکی پادشا و ناو مەجلیس باسێک دەکات دەڵێت، من خەونم بینیوە، دیارە خەونەکەی خەونێکی سادە نییە، بۆیە لای گرنگە لێکدانەوەی جددی بۆ بکرێت، پادشا خۆی کەسێکی بە توانا و زیرەک بووە، هەروەها نەیانتوانیوە بە دوو باس و خواس لە لایەن دار و دەستە و کاهین و ئەوانە کە خەویان لێکداوەتەوە هەڵیبخەڵەتێنن، بۆیە ئەوەی زانیویانە وتویانە ئەوەشی نەیانزانیوە لێی بێدەنگ بوون، پادشا ناوی (ڕەیانی کوڕی مالیک) بووە لە خانەوادەی هیکسۆس بووە.

خەونەکەی باس دەکات، لە کۆتایی دەڵێت ئادەی ئەوانەی کە شارەزان بۆ قسە ناکەن؟!

سەید قوطب دەڵێت: لەوانەیە زانیبێتیان کە ئاماژەیە بۆ کارەساتێک لە وڵاتدا بەڵام نەیانوێراوە لای پادشا بیدرکێنن بۆیە وتیان: خەونەکەی بینیوتە تێکەڵ و پێکەڵە هەموو جەمسەرەکانی دەرنەکەوتووە، کە ماددەم خەونەکەش تێکەڵ و پێکەڵە ئەوا هیچ تەفسیرێک هەڵناگرێت.

چەندین کەس دێت تاکو خەونەکەی پادشا لێکبدەنەوە، هەموو دەگەڕێنەوە هیچ ئەنجامێک نادەنە پادشا، پادشاش هەر داوا دەکات و جەخت لەسەر تەفسیرکردنی دەکاتەوە، لەو کاتەشا

کەسێک بە ناوی (نەبوا) لە مەجلیسی پادشایە و مەیی گێڕە بۆ پادشا، واتە شەربەتی ترێ دەگوشێت و دەیکاتە شەراب، جا ئەو کەسەش هاوڕێکەی یوسفە لە زینداندا کە خەونی بینی و بۆی لێکدایەوە لەگەڵ هاوڕێیەکەی تری بە ناوی (مەجلەس) کە ئەویان لە سێدارە درا، بەهەر حاڵ بیری دەکەوێتەوە و خۆی بە هۆکاری خەون بینین گەڕاوەتەوە بۆ کۆشک، بۆیە ڕاستەوخۆ بە پادشا دەڵێت: لە بیرم چووە کە کەسێک هەیە لە زینداندا توانای لێکدانەوەی خەونی هەیە، دیارە هەموو باسەکە بۆ پادشا باس دەکات و پادشاش خەونەکەی بە مەی گێڕەکەیدا دەنێرێت بۆ یوسف، دیارە هۆکاری لە بیر چوونەوەی (نەبوا) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەمیشە لە ناو شەراب درووستکردنی مەی دا بووە بۆیە یوسفی لەبیر کردووە، سەرقاڵە بە پادشا و دار و دەستەکەی بیری یوسفی نەماوە، نەبوا چووە لای یوسف و خەونی پادشای بۆ گێڕایەوە.

حەزرەتی یوسف-یش خەونەکەی لێکدایەوە، بە شێوەیەکی زانستی و پڕ وەحی و دڵنیاییەوە کە دەبێت چی بکرێت و پاشان لە شێوەی پرۆژەی ئابووریدا بوو کە حەوت ساڵ زۆر تەڕ و بەخێر دەبێت و کە ڕەمزی مانگا قەڵەوەکانە هەروەهادروێنە و هەڵگرتنی دانەوێڵە کە بە لاسکەکەیەوە بێت بۆ ئەوەی تووشی هیچ کاریگەریەکی کەش و هەوا و ژینگەکە نەبێت وەکو خۆی بمێنێتەوە.

پاشان عەمبار کردن و هەڵگرتنی بە شێوەیەکی ئەکادیمی و زانستی، ئەمەش بۆ ئەو کاتەی کە گرانی و قات و قڕی دەست پێدەکات، کە ڕەمزی مانگا لەڕ و لاوازەکانە و قەڵەوەکان دەخۆن، ئەمەش حەوت ساڵ ژیان لەو پەڕی نەهامەتی و ناخۆشی و وشکە ساڵیدا دەبێت، خەڵکی لەوپەڕی دەست کورتی و هەژاری و نەداریدا دەبن و دەبێت فریایان بکەون، لێرەدا یوسف عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ لە شێوەی مژدە ئەیدات بە نوێنەری پادشا و پاشان کە ٧ ساڵ خۆشی و شادی و پڕخێر و بەرەکەت دەبێت.

هەموو ئەم پرۆژەیە لە گەنم و جۆ و دانەوێڵەدا خۆی نابینێتەوە، بەڵکو لە زەیتووندا وەکو نموونەیەک، ڕۆنەکەی دەگرن و ناوکەکەی دەکرێت بە ئارد و خودی زەیتونەکەش بۆ خواردن بەکار دێتەوە، واتا پرۆژەکە گشت گیرە پێویستی بە چاودێری خەڵکی لێزان و خاوەن تایبەتمەندی هەیە، پرۆژەیەکە کە وەزارەتێک دەبێت لە خزمەتی دابێت، سەرەتا پێشنیارێک (پڕوپۆزەڵێک) ئەنێرێتەوە بۆ پادشا، بەڵام هەروا سادە و ساکار نییە، بۆیە کە (نەبوا) دەگەڕێتەوە هەواڵەکە ئەداتە مەلیک ڕەیان، خێر لە دیمەنی زیندانەوە لە پرۆژەیەکی گرنگ کە باسەکەی قووڵ و جێگای تێڕامانە و دەڕواتە ناو مەجلیسی پادشا لە کۆشکەکەیدا و هەموو سەرسام دەبن بە وتەی ئەم زیندانە، ئەگەر پادشایەک خەم خۆر بێت، گوێ بۆ هەموو پرۆژەیەک دەگرێت، پاشان بە دڵنیاییەوە مەی گێڕەکەی باسی یوسف-ی بۆ گێڕاوەتەوە و هەڵسەنگاندنی تەواوی

کردووە بۆ پادشا لە کەسایەتی ئەم کوڕە گەنجە، پادشا خۆی پێناگیرێت و داوای ئەو زیندانییە دەکات بۆی بهێنن!

﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسْـَٔلْهُ مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّٰتِى قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ۚ إِنَّ رَبِّى بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ ۝ قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ قُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ ۚ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْـَٰٔنَ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ۝ ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّى لَمْ أَخُنْهُ بِٱلْغَيْبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى كَيْدَ ٱلْخَآئِنِينَ ۝ * وَمَآ أُبَرِّئُ نَفْسِىٓ ۚ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّىٓ ۚ إِنَّ رَبِّى غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝﴾ يُوسُف

واتە: کاتێک پاشا لێکدانەوەی خەونەکەی بیست سەرسام بوو، پێی وتن: بڕۆن یوسفم بۆ بێنن کاتێک نێردراوی پاشا هات بۆ لای یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ، یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ نەهاتە دەرەوە لە بەندیخانەکە و فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆ لای پاشاکەت پرسیاری لێ بکە ڕووداو و بەسەرهاتی ئەو ئافرەتانەی کە دەستی خۆیان بڕی چی بوو؟ بە دڵنیایەوە پەروەردگارم زۆر زانایە بەنەخشە و فڕوفێڵ و پیلانی ئەوان ۝ پاشا هەموو ئافرەتەکانی کۆکردەوەو پێی وتن: ڕووداو و بەسەرهاتی ئێوە چی بوو کاتێک کە داواتان لە یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ کرد کە خراپەتان لەگەڵدا بکات وتیان: پاک و مونەززەهی بۆ خوای گەورە هیچ خراپەیەکمان لە یوسف نەبینیوە، خێزانەکەی عەزیز وتی: ئێستا حەق دەرکەوت و ئاشکرا بوو من بووم کە داوام لێکرد کاری خراپەم لەگەڵدا بکات، یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ لە ڕاستگۆیانە لەو قسانەی کە کردوویەتی ۝ یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی یان ئافرەتەکە وتی: تا عەزیزی میصر بزانێ کە من خیانەتم لێ نەکردووە بە زینا کردن کاتێک کە خۆی لە ماڵ نەبووە، بەڵکو تەنها ویستێک بوو خوای گەورەش هیدایەتی نەخشەو پیلانی ناپاکان و خائینان نادات ۝ من نەفسی خۆم پاک ناکەمەوە چونکە نەفسی هەموو کەسێک فەرمانی پێ دەکات بە خراپەو نەفس زۆر فەرمانکارە بە خراپە، تەنها ئەوەی کە خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات لەو نەفسانە وەکو نەفسی پێغەمبەران بەڕاستی پەروەردگارم زۆر لێخۆشبوو و بەبەزەییە۝

لەدوای ناردنی پڕۆژەکەی بۆ پادشا و خەونەکەی بۆ لێکدایەوە، کە دەڵێین: پڕۆژە بە واتای ئەوەی کە تەنها لێکدانەوەی خەون نەبوو، بەڵکو دەیتوانی بەوەندە واز بهێنیت کە گرانی دەکەوێتە ناو خەڵکی، بەڵام یوسف واقیعەکەی باس کردووە چارەسەریشی لەگەڵیدا نارد بۆیە ناومان ناوە پڕۆژە، کە قەیرانێک ڕوو ئەدات چارەسەری بۆ دانرا ئەوە پێی دەوترێت پڕۆژە.

پادشا سەرسامە، ئەم جارەش نوێنەری دەنێرێت، کێیە؟ نازانین کەسی ڕابردووە یان کەسێکی ترە، بە هەر حاڵ کە دەچنە خزمەتی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ داوا دەکەن کە پادشا بانگت دەکات، لێرەدا

ئازایی و خۆڕاگری یوسف دەردەکەوێت پەروەردەیەکی نایاب بووە لە زیندان لە لایەن پەروەردگاریەوە، بۆیە بێ ڕاچڵەکان و ترسان، وەڵام ئەداتەوە کە نایەوێت پادشا ببینێت، چونکە زوڵمی لێ کراوە، پێویستە ڕەد ئیعتیباری بۆ بگەڕێتەوە، بۆیە زۆر بە سادەیی نوێنەرەکە دەنێرێتەوە بەڵام بەدەست بە تاڵی نا، بەڵکو بە هەواڵێکی تری سەرسامکەر کە پادشا تووشی حاڵەتێکی لاواز دەکات و دەسەڵاتەکەی دەخاتە ژێر پرسیار و وای لێ دەکات کە خۆی هەڵبسێت بە لێکۆڵینەوە لە کێشەکەی ئەویش بەو سەرقەڵەمەی کە دەشێت بۆ پادشا و حەزرەتی یوسف دەفەرموێت: بزانە لە ناو دەسەڵاتەکەدا کۆمەڵێک لە ئافرەتان بۆ دەستی خۆیان بڕیوە؟ لێرە وشەی کەم، بەڵام لای پادشا دیار نییە داخۆ دەبێت چی بێت کە ئەم کۆمەڵە ئافرەتە دەستیان بڕاوە، ئاماژەشە بۆ ئەوەی خۆیان کارەکەیان ئەنجام داوە، حەزرەتی یوسف نەکەوتە گێڕانەوەی باسەکە لە سەرەتاوە، چونکە کاتی نییە و پادشا کە گوێی بۆ ئەو کێشەیە بگرێت لە نوکەوە بۆ کۆتایی، بەڵکو سەرنجی ڕادەکێشێت و سەرسامی دەکات لە هەمووی گرنگ تر ئازایەتی خۆی بووە کە داواکردنی پادشا و کەسێک لە ناو زینداندا بێت ماوەی چەندین ساڵ، بەڕاستی خۆ ڕاگرییە کە یوسف دەڵێت: نایەم تا چاو بە کێشەکەمدا نەخشێنن و ئازادی وەرناگرێت ئەگەر بەرائەتم دەرنەچێت، نەک هەروا بمبەن و دوای بڵێن بە بڕیاری پادشا ئازاد بوو، جەنابیان ئەوەیان ناوێت بەڵکو ئازادی بە بەرائەتەوە دەوێت.

هەر چەندە ئەو پێغەمبەرە دڵنیا و یەقینی هەبووە بەوەی کە زوڵمی زاڵم تا سەر نییە و حەق ون نابێت و ناشاردرێتەوە و هەر ئاشکرا دەبێت.

ئینجا لێرەوە قۆناغی تەحقیق و لێپێچینەوە دەست پێدەکات کە خودی پادشا ئەنجامی ئەدات، چونکە پادشا باش لە پەیامەکەی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ تێگەیشتووە.

لە کاتێک پادشا بانگیان دەکات سەرچاوەکانی هەواڵ بۆیان ئاشکرا کردووە کە چیان دەرحەق بە یوسف کردووە بۆیە لە شێوەی تاوانبار و لێپێچینەوەیان لەگەڵدا دەکات، بە ئوسلوبێکی توڕە، هەروەها کارەکە بە گەورە تەماشا دەکات بە ترسناکی لە قەڵەم داوە، چونکە دەسەڵات بەکار هاتووە بۆ زوڵم کردن، پاشان لە لایەن ئافرەتانەوە، خۆشی بە دڵنیاییەوە کۆمەڵگەکەی خۆی باش ناسیوە و خوێندنەوەی تەواوی بۆ ئەو ئافرەتە (بۆرجوازانە) کردووە، دەزانێت هەموو خانەوادەی مەخمەڵی و ئەرستۆکراتن.

هیچ بوارێکی سەرکەشی و نکۆڵی کردن و دەمەدەمێ نییە، پادشا خۆی پشکنین دەکات، بۆیە زۆر زوو خۆیان دا بە دەستەوە، بەو پەڕی ڕاستی و هەر لە سەرەتای وتەیانەوە وتیان: حاشا کە یوسف هیچ کار و کردەوەیەکی ناشایستە و خراپەمان لێ نەبینیوە، کەواتە پادشا لە ئاسایشی وڵاتەکەی دەپرسێتەوە کە بۆچی یوسف لە زینداندایە، هۆکاری چیە کە مادام ئافرەتان

هەموو شاهیدی پاکی و جوان ڕەفتار و ڕەوشتی بەرزی یوسف ئەوەن، پێویستە هۆکاری زیندانی کردنی ڕوون بێتەوە؟!

چار نەما هەموو جەمسەری تاوانەکان دەرکەوت، یوسف عَلَيهِالسَّلَامُ بە زوڵم لە زینداندایە، ئەوەی کە کارەکەی کردووە دەبێت دان بە هەموو تاوانەکەیدا بنێت، ڕێگای تری نییە، هەندێک وا لێکیان داوەتەوە کە گوایە لەبەر خۆشەویستی یوسف ئیعترافی کردووە بەڵام ڕووکەش وا نییە، بگرە پێچەوانەیە چەندین ساڵە لە زیندانی کردووە هیچ گرنگی پێ نەداوە، لە ئێستادا هەموو شتێک ئاشکرایە ئەو دان بە تاوانەکەشیدا نەنێت هەر تاوانبارە، شاهیدی زۆری لەسەرە، پێدەچێت هۆکاری لاوازی عەزیز بەرانبەر بە خێزانەکەی کارەکەی بەو هۆکارە لەدەست دابێت، چونکە عەزیزیش کە گەورەی وەزیرەکان بووە بەشدارە لە تاوانەکە، هیچ بەدەم یوسف-ەوە نەڕۆشتوە بۆیە، لە کۆتاییدا ئەو پۆستەی (فوطیفار) ئەدرێت بە یوسف[٦]!

ئەویش چونکە بە زوڵم لە زیندان کرابوو، خوای گەورە ئەو زوڵمە لەسەر ئێمەش هەڵبگرێت کە لە وڵاتانی بە ناو ئازادی و مافی مرۆڤ کرا لێمان، بە تایبەت لە جەنابی مامۆستا کرێکار و هەموو برایانی تر، خوایە تۆ شاهیدی لەسەر دینەکەت گیراوین.

بگەڕێینەوە بۆ لای زولەیخا دیارە کاریگەری یوسف لەسەری بووە، بۆیە هەست بە بوونی خوای ئاسمان دەکات و نەفسی خۆی بە خراپەکار دادەنێت و ڕاستەوخۆ داوای لێخۆش بوون دەکات، جا ئەم لێخۆشبوونە لە خوای پەروەردگارە یان لە پادشایە، چونکە بۆ هەردوو حاڵەتەکە دەشێت و دەتوانین خوێندنەوەی بۆ بکەین، لەبەر ئەوەی، وشەی ڕەب (رَبّ) بۆ پادشا و خاوەن موڵک و دەسەڵاتدار بەکار هاتووە لەم ڕووداوانەدا، سەید قوطب دەڵێت: پادشا خاوەنی دەسەڵات بووە هەموویان بۆی گەردەن کەچ بوون، یوسفیش خاوەنی خوا بووە بۆ ئەو گەردەن کەچ بووە (ڕەب)ی یوسف لەگەڵ (ڕەب)ی ئەوان جیاواز بووە.

قۆناغی دەرچوونی بەڕائەتی یوسف وەها سادە و ساکار بە ئازاد بوونی کۆتایی نەهات، بەڵکو خودی پادشا حەز بە بینین و دانیشتن دەکات لەگەڵیدا، بەڵام یوسف سەرەتا نەسازا و ڕازی نەبوو، بەڵکو لە دوای دەرچوونی بەرائەتی، پادشا قەرەبووی بۆ دەکاتەوە، پاشان ڕەد ئیعتیباری بۆ دەگەڕێنێتەوە، لە سەرووی هەموویەوە ئیرادەی خوای موتەعالە و قەدەری یوسفە کە پەیوەندی هەیە بە خەونەکەی منداڵیەوە کە بینیوویەتی بۆ هێنانە دی ئەو خەونە قەدەری یوسف لە لایەن خوای پەروەردگارەوە وا دەخوازێت کە ببێتە سەرۆک وەزیرێک کە بتوانێت

---

[٦] (لێرەدا ڕووداوی نێلسۆن ماندێلام بیردەکەوێتەوە کە لە زیندان بوو هەموو ڕۆژێک پێڵاوەکانی بۆیاخ دەکرد و پاکی دەکردەوە و خۆی دەگۆڕی، پاسەوانەکە ڕۆژێکیان لێی پرسی بۆ وا دەکەیت تۆ زیندانی ئەویش لە وەڵامدا وتی لەوانەیە بەم جل و پێڵاوانەوە بڕۆم بۆ کۆشکی دەسەڵات!).

هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بخاتە ژێر ڕکێفی حوکمڕانی خۆی و خۆراک دابەش بکات بەسەریاندا.

﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ۝ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ۝ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ۝﴾ يُوسُف

واتە: پاشاکە دیسان وتی: بڕۆن یوسفم بۆ بێنن تایبەتی ئەکەم بە خۆم و ئەیکەم بەڕاوێژکاری خۆم، کاتێک پاشا قسەی لەگەڵدا کردو فەزڵ و لێهاتوویی بۆ دەرکەوت وتی: ئەی یوسف ئەمڕۆ تۆ لەلای ئێمە جێگیریت و خاوەن پلە و پایەیت، ئەمینی لەلای ئێمە۝ یوسف عَلَيۡهِ السَّلَامُ وتی: بمکە بە سەرپەرشتیاری خەزێنەکانی زەوی میصر لەوەی کە خواردن و سەروەت و سامانی تیایە بۆ ئەوەی دادپەروەری بڵاو بکاتەوەو زوڵم و ستەم نەهێڵێ و خەڵکەکە بانگ بکات بۆ عیبادەتی خوای گەورە، بەدڵنیایی من زۆر پارێزەرم و هەمووی ئەپارێزم، زۆر زانام لەم بوارەدا۝ خوای گەورە ئەفەرمووێ: بەم شێوازە پلەو پایەو دەسەڵاتمان بە یوسف دا لەسەر زەوی لە میصر، لە هەر شوێنێک دانیشێت وەکو ماڵی خۆی هەڵسوکەوت و مامەڵە دەکات، دوای ئەوەی لە بەندیخانەی تەنگدا بوو ڕەحمەتی خۆمان بەهەر کەسێک ئەبەخشین کە ویستمان لێ بێت ئەجرو پاداشتی چاکەکاران نافەوتێنین۝ بەڵام پاداشتی قیامەت باشترە بۆ باوەڕداران کە تەقوای خوای گەورەیان کردووە۝.

زنجیرەکانی ژیانی حەزرەتی یوسف بە ناخۆشی بەڕێ کرا، بەڵام لە مەولا قۆناغێکی تر دەست پێدەکات، زۆر جیاواز ترە لە زنجیرە ڕووداوەکانی ڕابردوو!

دیمەنەکانی ڕابردوو بریتی بوون لە لێپێچینەوە لە ئافرەتەکان بە گشتی و زولەیخا بە تایبەتی و ونبوونی خانەوادەی (فوطیفار) لە ڕووداوەکاندا بە گشتی، هێنانەدی ڕەغبەتی یوسف و دەرچوون و ئاشکرا کردنی بەرائەتی، چونکە دەبوو ئەو کارە ئەنجام بدات، یوسف پێغەمبەرە کاری پێغەمبەرایەتیش بانگەوازە، ناکرێت پێغەمبەرێک دەست بە بانگەواز بکات و تۆمەتی داوێن پیسی درابێتە پاڵ، چونکە بۆ خەڵکی زۆر ئاسان دەبێت کە ڕووبەڕووی ببنەوە بەو هۆکاری تۆمەت و تاوانەی کە دراوەتە پاڵی، بۆیە جەختی لەسەر پاکێتی و بەرائەتی خۆی دەکردەوە، چونکە لەمەولا دەبێتە پیاوی دەوڵەت واتا لە سێکتەری دەسەڵات کار دەکات و لە هەمانکاتدا بانگەوازیش دەکات، ئەم دوو کارە پێویستی بە متمانەی کەسایەتی خودی مرۆڤەکە

هەیە، بۆیە یوسف باشترین و جوانترین پەروەردەکراو بووە لە ناو بنەماڵەی پێغەمبەرانەوە هاتبوو، پاشان خوای پەروەردگاریش بە وەحی ئاراستەی دەکرد و ڕەوشتی بەرزی فێردەکرد و بە جوانترین شێوە پەروەردە بوو.

وا ئێستا پادشا بانگی کردووە خەونەکەی بۆ لێکداوەتەوە، پڕۆژەیەکی ئابووری زۆر زەبەلاحی خستۆتە بەردەم کۆشکی پادشایی، کارەکانی ڕابردووشی هەمووی جێگای ڕێز بووە، بە چاوێکی زۆر گەورە تەماشای یوسف دەکرێت، پادشا هەروا ئازادی ناکات، بەڵکو ئازادی دەکات بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرێت دەیکاتە ڕاوێژکاری خۆی چونکە پیاوێکی ڕاستگۆ و سەر ڕاستە و ئامانجی خزمەتی خەڵکییە. جا بە هەردوو پڕۆژەکەی کەوا پڕۆژەی پێغەمبەرایەتی خەڵکی لە ئاگر ڕزگار دەکات بۆ بەهەشت، هەروەها پڕۆژەی خزمەتگوزاری کە خەڵکی لە برسێتی و نەهامەتی ڕزگار دەکات.

سەید قوطب ڕەحمەتی خوای لێبێت دەڵێت: خۆزگە ئەوانەی کە دەسەڵاتدارن یان هەڵبژێراون بۆ جومگەکانی دەسەڵات ژیانی پێغەمبەر یوسفیان دەخوێندەوە و تێدەگەیشتن لەوەی کە سەربەرزی و شکۆ و عیزەت و ڕاستگۆیی زۆر گرنگترو هەزار جار بەهێز ترە لە ماددە و ماڵ و سەروەت.

یوسف لەگەڵ پادشا دایە هەموو دیمەنەکان کۆتایی دێت، بەوەی چیتر یوسف عەبدێکی عیبری نییە، بەڵکو (مکین) واتا خاوەنی خۆیەتی و کەسێکی دیاری وڵاتە، تۆمەتبار نییە بە کارێکی تاوان و زیندانی بکرێت بەڵکو کەسێکی (أمین)ە، ئەمەش وتەی پادشایە، یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ ئیتر کەسێکی ئاسایی نییە، بەڵکو خاوەن دەسەڵاتە و فەرمان ڕەوایی دەکات.

داخۆ وەڵامی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ چی بێت؟!

یوسف دەستی نەکرد بە هەڵدان بە شان و شەوکەتی پادشا و هیچ ستایشی نەکرد، بەڵکو مافی خۆی بۆ گەڕاندۆتەوە، ماستاو چی نەبوو وەکو خەڵکی ئەم ڕۆژگارە، بکەوێتە دەعوەت و دەعوەتکاری و هاوار بکات بڵێت خوا پایەدارت بکات جەنابی سەرۆک، لەمانە هەمووی دوور بووە، ئەوەی ئەوەندەی تر کەسایەتی بەرز کردەوە، دوای پڕۆژەکەی خۆی کەوت کە لە خەونی پادشاوە لێکیدایەوە، بڕوای تەواوی بە کارەکەی خۆی هەبوو، پاشان پاراستنی کەرامەتی بنەماڵەی پێغەمبەران کە خۆی لە ناو ئەوانەوە هاتووە بۆ بڵاوکردنەوەی دینەکەی.

زۆر بە سادەیی فەرمووی: بمکە لێپرسراوی عەمبار و سایلۆ و بواری کشتوکاڵ و ئاو و ئاوەڕۆ، تا بتوانم ئەم چەند ساڵەی کە خۆشی و شادی و ئاوەدانیە سوودی لێ وەربگرم بۆ ساڵانی نەهامەتی و ناخۆشی و ناڕەحەتی.

ئیتر پێویستە هەڵسێت بە کارە سەختەکەی، بەرپرسیارەتی قووتی هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر، ئەمەش نابێتە غەنیمەت بۆ یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ بەڵکو تێرکردنی گەلە بۆ ماوەی ٧ ساڵ هەر وەکو ئاماژەمان پێدا پرۆژەیەکی زۆر زەبەلاحە، خۆ ئەم پرۆژە پارەی تێدا دەست ناکەوێت هەرچی کەسە خۆی لێ دەشارێتەوە چونکە بەرپرسیاریەتییەکی زۆر گەورەیە، پیاوی خاوەن توانا و تایبەتمەند دەرەقەتی نایەت، بەڵام کاری پێغەمبەران هەر وا ئاسان نییە، ئەمەش برسێتیە، برسێتیش شێتی و کافر بوونی لە دوایە!

لێرەدا ئەم داوایەی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ ناچێتە ئەو بنەما ئیسلامییەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کە دەفەرموێت: هەرکەس داوای دەسەڵاتی کرد پێینادرێت، پاشان خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: خۆتان بۆ خۆتان تەزکیە مەکەن و بە پاکی خۆتان نیشان بدەن (فَلَا تُزَكوا أنفُسَكمْ)، دەقی فەرمودەکەش دەفەرموێت: إنَّا وَاللَّهِ لا نُوَلِّي علَى هذا العَمَلِ أحَدًا سَأَلَهُ، وَلَا أحَدًا حَرَصَ عليه. (متفق عليه)

لەسەر دەمی ڕەسولی ئەکرەم محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ حکومەت و دەسەڵات ١٠٠٪ ئیسلامییە، بۆیە ئەم هاوکێشەیە دەیگرێتەوە.

بۆ حەزرەتی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ دەسەڵاتێکی ئیطلاقیە دەبێت داوای دەسەڵات بکات بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە لە هەموویان باشترە.

ئەم پرۆژەیەی یوسف زیاتر بۆ ئەم سەردەمە گونجاوە کە حیزب و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان دەبێت بیسەلمێنن لە ناو سیستەمی دیموکراسیدا کە ئەوان زۆر باشتر و شیاوترن لە حیزبە عەلمانیەکان، ئەم باشترینەش بە وتە نابێت دەبێت خاوەنی پرۆژە بن، وەکو حیزبی ڕەفاهی تورکیا تا سەردەمی ئۆردۆغان و لە ڕۆژهەڵاتیش نموونەی مالیزیا.

ئایینی ئیسلام کە ئایینی هەموو پێغەمبەرانە، زۆر واقیعیە و لەگەڵ هەموو ژینگەکاندا خاوەنی فیقهی تایبەتی خۆیەتی، بەو شێوە کارکردنە چەقیوەتە کە زۆرێک لە حیزب و کۆمەڵە کلاسیکییەکان بیری لێ دەکەنەوە، یان خیلافەت یان نەمان، لە نێوانی ئەم ڕەش و سپییەدا ڕەنگی تر زۆرە بۆ گەیشتن بە ئامانجی سیستەمی ئیسلامی کە خیلافەتە، جا وەکو حەزرەتی یوسف دەسەڵاتی ئیطلاقیە، یان وەکو مووسا ئۆپۆزسیۆنە، یان وەکو داوود و سولەیمان پادشاییە، یان وەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئیمپراتۆرییە...هتد.

گەڕانەوە بۆ ناو مێژووی ژیانی ئەم پێغەمبەرە عەزیزە، دیارە پادشا ڕاستەوخۆ داواکەی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ جێبەجێ دەکات و لە داهاتووودایەو پلە و پۆستی عەزیز وەردەگرێتەوە، ئەمەش ماوەیەکی زۆر یوسف دەستبەکار دەبێت و ماوەی ٧ ساڵ خۆشی و شادی ناو گەلان و بە تایبەت

میسر بەردەوام دەبێت، لەم ماوەیەشدا یوسف کاری بانگەواز و پڕۆژەی خزمەتگوزاریەکانی جۆش و خرۆش داوە، خەریکی بونیاد نانە.

ئەوەی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ داوای کرد لەوە زیاتری پێ بەخشرا، چونکە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: (يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ)، ئەمەش مانای وایە ئەوەی ئەیەوێت و ویستی لەسەریەتی پێی بەخشرا، ئەمەشَ لە بەرانبەر فێڵی براکانی و خستنە ناو بیر و فرۆشتنی و ئازاردانی و لە زیندانەوە بۆ ئازاد بوون، لە نارەحەتی و کۆیلایەتی بۆ عەزیز بوون و وەزیر بوون و دەسەڵات، ئەم مەقام و پلە و پایەیە لە لایەن خوای موتەعالەوەیە چونکە پاداشتی چاکە کاران ون ناکات.

هەڵبەت لە دنیادا هەر پاداشت ئەدرێتەوە ئەوانە کە خاوەن ئیمانی بەهێز و خاوەن تەوەکول و هەرگیز ڕوو لە خوای خۆیان وەرناگێڕن، خاوەنی ئاکار و ڕەوشتی جوان و پەسندن، لە کۆتایشدا لە قیامەت پاداشتی گەورەتر و باشتر و خێرتر ئەدرێت بە ئیمانداران و ئەوانەی خۆ پارێزن.

لە کۆتاییدا یوسف هەموو نارەحەتییەکانی بۆ گۆڕا بە جێنشینکردن لەسەر زەوی بووە خاوەن دەسەڵاتی گەورە و بەرز - چۆن حوکمرانی کرد و چی کرد لەو ئایەتەدا هەمووی دەردەکەوێت کە خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ)، پارێزەر و دەست پاکە و پاشان خاوەن زانستە بە کارەکەی.

ڕووداوەکان لە قورئاندا باس نەکراوە خەڵکی چۆن ڕووبەڕووی ٧ ساڵ نارەحەتی بوونەوە و خاک چۆن وشکی کرد و ئاسمان بارانی نەباراند و ئازار و نارەحەتی لە مێژووەکاندا باسکراوە، قورئان تەنها ئاماژە بە خەونەکە و پاشان واقیعەکە ئەدات کە ڕوو ئەدات درێژەی باس و ڕووداوەکان لە دیمەنەکەدا یاخود لە ناوەخنی ئایەتەکەدا دەردەکەوێت و منیش ئەم بەشە بەوە کۆتایی پێ دەهێنم کە یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ بووە خاوەنی دەسەڵات و ئەوەی بیەوێت دەیکات لە وڵاتی میسر و ناوچەکان بە گشتی، ئەم نارەحەتیە و وشکە ساڵی و قات و قڕییە کەوتە ناو بنەماڵەی یوسف لە قودس، زانیان لە وڵاتی میسر خواردن و خۆراک دەفرۆشرێت.

بۆ ئەم مەبەستە بنەماڵەی یوسف و براکانی و خزم و کەسوکاری بۆ کڕینی خۆراک و پێداویستی ڕوویان کردە وڵاتی میسر، لە کاتێکدا نزیکترین جێگا بوو لەوانەوە بۆ هاتوچۆ تا وڵاتی میزۆپۆتامیا، براکانی یوسف بەرەو وڵاتی میسر کەوتنە ڕێ...

﴿وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ۝٥٨ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ قَالَ ٱئْتُونِي بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ ۚ أَلَا تَرَوْنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ۝٥٩ فَإِن لَّمْ تَأْتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيْلَ

لَكُمْ عِندِي وَلَا تَقْرَبُونِ ۝٦٠ قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ۝٦١ وَقَالَ لِفِتْيَٰنِهِ ٱجْعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمْ فِي رِحَالِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ۝٦٢﴾ يُوسُف.

واتە: براکانی یوسف لە زەوی کەنعان لە شامەوە هاتن بۆ میصر بۆ ئەوەی کە خواردن بەرنەوە چونکە گرانی و نەبوونی بوو، یوسف ساڵی باری وشترێکی بە خەڵکی شوێنانی تر دەدا بەنرخی ئاسایی خۆی پێش گرانییەکە هاتنە ژوورەوە بۆ لای یوسفعَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ ، ئەم ئەوانی ناسییەوە لەبەر ئەوەی کاتێ بەجێی هێشتن ئەوان هەر گەورە بوون بەڵام ئەوان یوسفیان نەناسی لەبەر ئەوەی کاتێک خستیانە ناو بیرەکەوە ئەو بچووک بوو ئێستا گەورە بووە، نەیانزانی چی بەسەرهاتووەو گومانیان نەبرد گەیشتبێتە ئەم پلەیە۝٥٨ کاتێک ئەوەی کە داوایان کرد لە خواردن و پێویستی سەفەرەکەیان بۆی ئامادە کردن و پێی بەخشین، دوای ئەوەی کە ڕووداو و بەسەرهاتی خۆیان بۆ یوسف گێڕایەوە کە برایەکیان لە ماڵ بەجێ هێشتووە، یوسف داوای لێ کردن کە ئەمجارە هاتنەوە ئەو برایەی ترتان کە لە باوکتانەو لە دایکتان نییە کە بنیامینی برای یوسف خۆی بوو وتی: لەگەڵ خۆتاندا بیهێنن، ئایا نابینن کە من چەند بەتەواوی شتم پێتان داوە کە لە لای من دابەزیون چەندێ چاکەم لەگەڵدا کردوون و ڕێزی میوانداریم لێ گرتوون۝٥٩ بەڵام ئەگەر ئەمجارە هاتنەوە ئەو برایەتان نەهێنا، ئەوا هیچ شتێکتان پێ نافرۆشم و جارێکی تر نزیک من مەکەونەوە۝٦٠ وتیان: هەوڵ ئەدەین و کۆشش ئەکەین تا باوکی ڕێگەمان بدات لەگەڵ خۆماندا بیهێنین، یاخود فێڵێکی بۆ ئەدۆزینەوە تا ڕازی بکەین لەگەڵ خۆماندا بیهێنین، ئێمەش هەوڵ ئەدەین و کەمتەرخەمی ناکەین تا لەگەڵ خۆماندا بیهێنین۝٦١ یوسف بە گەنجە خزمەتکارەکانی وت: ئەو خواردن و شتانەی کە هێناویانە بیخەنەوە ناو بارەکەیان و پێیان بدەنەوە، بەڵکو بیناسنەوە کاتێک گەڕانەوە بۆ لای کەسوکاریان، بەڵکو جارێکی تر بێنەوە کە بزانن خواردنەکەیان بەبێ بەرامبەر پێ دراوە، ئەوەی کە خۆیان هێنابوو یان پێیان دراوەتەوەو گەڕێندراوەتەوە بۆیان۝٦٢.

لە خاکی کەنعان قات و قڕی دەستی پێکرد ناچار خەڵکی ئەو جێگایە ڕوویان کردە میسر بۆ کڕینی کەرەستە و خۆراک، براکانی یوسف لەو خەڵکانە بوون کە چوون بەرەو ئەو وڵاتە و برسێتی تەنگی پێ هەڵچنی بوون، خۆیان کرد بە عەمبار و جێگای کڕینی خۆراک، یوسف ئەوانی ناسییەوە، یوسف گۆڕاوە ساڵانێکە لەبەر چاوی ئەواندا نەبووە، بەڵام یوسف ئەوان دەناسێتەوە، زۆر گۆڕانکاری بەسەریاندا نەهاتووە شکڵیان وای لێ نەهاتووە کە نەناسرێنەوە.

پاشان ئەوان هەرگیز بڕوایان وا نەبووە یوسف عەزیزی میسر بێت و بگاتە ئەو پلە و پۆستە، لە کوێ بیریان دەچێت کۆیلەیەکی عیبرانی منداڵ خراوەتە ناو بیرێک ئێستا خاوەنی دەسەڵاتێکی ئاوا بەهێز و توانایە!

یوسفیش خاوەنی هەیبەت و دار و دەستە و حەشەم و خەدەم بووە، بۆیە هەرگیز بیریان بۆ یوسف نەچووە، بەڵکو هەر لە بیریشیاندا نەماوە کە خاوەنی برایەک بوون بە ناوی یوسف لە ئێستادا، چونکە ناڕەحەتی برسێتی تەنگی پێ هەڵچنیون یوسف کە ناسینەوە، بەڵام خۆشی لێ ئاشکرا نەکردن دیارە پێویستە وانەیەکیان فێر بکات و سەر لە نوێ کەسایەتی و ئاکار و ڕەوشتیان دابڕێژێتەوە، یوسف پێغەمبەرە و ئەوانیش براین، کەواتە بانگەوازی یوسف بۆ هەموو کەسە، ئەی چۆن خۆی تەرخان ناکات بۆ برا و کەسوکارەکەی باشترین ڕەوشتیان فێر بکات.

پێناسەی پێغەمبەرایەتیش ئەوەیە کە لووتبەرز نین و هەمیشە لە ناو کۆمەڵایەتی خەڵکیدان، بۆیە پێدەچێ، یوسف خۆی پێشوازی لە میوانەکانی وڵاتانی دراوسێ بکات، چونکە لە ئایەتدا دەردەکەوێت کە خۆی پێشوازی لە براکانی کردووە، دیارە پێشوازییەکەش لایەقە بە شان و شەوکەتی حەزرەتی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ، تەعاروفی لەگەڵ کردوون و دیارە ئەوانیش خۆشحاڵ بوون و باسی باوکیان کردووە کە پیاوێکی بەتەمەن و حەتمەن لە بنەماڵەی پێغەمبەرانە و پرسیاری چەند برای کردووە لێیان کە چەند بران ئەوانیش وتویانە برایەکی ترمان هەیە لە باوکمان بەڵام لای باوکمان بەجێمان هێشتوە و باوکم حەز ناکات لێی دوور بکەوێتەوە.

لە دوای ئەوەی کە باریان کڕی و کاروانیان ئامادە کرد بۆ گەڕانەوە بۆ خاکی کەنعان و شاری قودس، پێش چوونیان یوسف داوای کرد، ئەگەر هاتنەوە برا بچووکیشتان لەگەڵ خۆتان بهێنن، زیاتر خزمەتتان دەکەم و پەیمان و وەعدی زیاترتان ئەدەمێ لە خۆراک و کەرەستەکان کە پێداویستیتانە، ئەوانیش وتیان هەوڵێکی جددی ئەدەین، بەڵام پێدەچێت ئەو کارە زۆر سەخت بێت وشەی (سَنُرَاوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَاعِلُونَ) ئەمەش بە واتای هەوڵ و کۆششی زۆری دەوێت، دیارە لە دوای یوسف، هیچ متمانەی بە کوڕەکانی نەماوە، بۆ برا بچووکەکەیان کە برای دایک و باوکی یوسف-ە.

پێش ناچێت یوسف مەبەستی تەنها بینینی براکەی بووبێت، چونکە باوکی لە پێشترە لەگەڵ دایکی بۆ بینین، یوسف وا پەی دەبرد کە بە هیچ شێوەیەک باوکیان متمانەیان پێ ناکات جارێکی تر منداڵەکانی ڕاحیل لەگەڵ منداڵەکانی خێزانەکانی تر بنێرێت، چونکە ناکرێت و ناگونجێت موشتاقی باوکی نەبێت و موشتاقی برایەکی بچووکی بێت، یاخود ئەیەوێت دڵنیا بێتەوە کە ئەو تاکە برایەی دایک و باوکی هەیەتی برا باوکییەکانی نەیان کوشتووە یوسف دەیویست باوکی ببینێت، لە ڕێگای برا بچووکەکەی کە ڕادەستی براکانی ناکات، بەڵکو بڵێت خۆشم دێم لەگەڵتاندا.

هەر بۆیە سەرنجیان ڕادەکێشێت، بەهەر شێوەیەکە جارێ تر بگەڕێنەوە بۆیە بە دار و دەستە و ئەوانەی فەرمانبەر و هاوکاری بوون دەڵێت پارەکانیان بۆ بگەڕێننەوە، بیخەنە ناو بار و کاروانەکەیان کە چوونەوە دەزانن کە بە خۆڕایی پێم بەخشیوون، سەرنجیان ڕادەکێشێت بۆ زوو گەڕانەوەیان بۆ وڵاتی میسر، پاشان لە گەڕانەوەدا تەماشایان کرد پارەکەیان بۆ گەڕاوەتەوە، ئەوەش وای کردووە بگەڕێنەوە بۆ جارێکی تر.

بەڵام لە ڕاستیدا ئایەتەکە وا نییە، ئەیەتەکە دەفەرموێت: لە دوای باس و خواس پێدەچێت باسی باوکیان کردووە کە پێغەمبەرە و برایەکی تریان لای باوکی ماوەتەوە یوسفیش میوانداری کردن، تێشووی ڕێگای دانێ و پارەکەی بۆ گەڕاندنەوە و ناچاری کردن بە هاتنی براکەیان ئینجا خۆراک و شتوومەکیان پێبدات، دەشێت بۆ پەروەردەکردنیان بووبێت کە داوای براکەیان دەکات، بۆ ئەوەی فێری پارێزگاری و ڕاستگۆیی بن (والله أعلم) ئایەتەکان زیاتر لە چەندین واتا هەڵدەگرێت، بەهەر حاڵ خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا نَكۡتَلۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿٦٣﴾ قَالَ هَلۡ ءَامَنُكُمۡ عَلَيۡهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمۡ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبۡلُ فَٱللَّهُ خَيۡرٌ حَـٰفِظًاۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَمَّا فَتَحُواْ مَتَـٰعَهُمۡ وَجَدُواْ بِضَـٰعَتَهُمۡ رُدَّتۡ إِلَيۡهِمۡۖ قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا مَا نَبۡغِيۖ هَـٰذِهِۦ بِضَـٰعَتُنَا رُدَّتۡ إِلَيۡنَاۖ وَنَمِيرُ أَهۡلَنَا وَنَحۡفَظُ أَخَانَا وَنَزۡدَادُ كَيۡلَ بَعِيرٖۖ ذَٰلِكَ كَيۡلٞ يَسِيرٞ ﴿٦٥﴾ قَالَ لَنۡ أُرۡسِلَهُۥ مَعَكُمۡ حَتَّىٰ تُؤۡتُونِ مَوۡثِقٗا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأۡتُنَّنِي بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمۡۖ فَلَمَّآ ءَاتَوۡهُ مَوۡثِقَهُمۡ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ يَـٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍۖ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ وَلَمَّا دَخَلُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَهُمۡ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغۡنِي عَنۡهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍ إِلَّا حَاجَةٗ فِي نَفۡسِ يَعۡقُوبَ قَضَىٰهَاۚ وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلۡمٖ لِّمَا عَلَّمۡنَـٰهُ وَلَـٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٦٨﴾﴾ يُوسُف

کاتێک گەڕانەوە بۆ لای باوکیان وتیان: ئەی باوکە لەمەودوا هیچ خواردنێکی ترمان پێ نادەن تا تۆ بنیامینی برامان لەگەڵماندا نەنێریت، بۆیە لەگەڵماندا بینێرە بەهۆی ناردنی ئەوەوە بارێکی زیاتر خواردن دێنین، ئێمەش بە دڵنیایی براکەمان ئەپارێزین و نایەڵین تووشی هیچ زەرەرو زیانێک بێت ﴿٦٣﴾ یەعقوب فەرمووی: ئایا ئەمین بم لە ئێوە کە ئەیپارێزن، هەروەکو چۆن پێشتریش ئەمین بووم لە ئێوە لەسەر یوسفی برای، بەڵام لەناوتان برد، خوای گەورە باشترین پارێزەرە، لە هەموو بەڕەحم و سۆزەکان بەڕەحم و سۆزو بەزەییترەو بەزەیی بە لاوازی و پیریمدا دێتەوە ﴿٦٤﴾ دواتر کە شتومەکەکانیان کردەوە بینیان ئەو شتانەی کە لەگەڵ خۆیان بردوویانە بۆ

ئەوێ خواردنی پێ بکڕن هەمووی گەڕێندراوەتەوە بۆیان وتیان: ئەی باوکە ئێمە چیمان لەم وەزیرە دەوێت ئەوەتا شتومەکی خۆمانی بۆ گەڕاندوینەتەوە، ئەگەر براکەمان لەگەڵمان بنێری خواردنی زیاتر دێنین، براکەشمان ئەپارێزین باری حوشترێک خواردن زیاتر لەگەڵ خۆماندا ئەهێنین، ئەم زیادەیەیش بۆ پاشاکە یان بۆ یوسف سووک و ئاسانە بەلایەوە کە بماندات و لای قورس نییە ﴿٦٥﴾ یەعقوب فەرمووی: کوڕەکەم لەگەڵتاندا نانێرم تا بەڵێنێکم نەدەنێ لەلایەن خوای گەورەوە، واتە: سوێند نەخۆن بە خوای گەورە کە ئەیپارێزن، کە بردتان لەگەڵ خۆتاندا کوڕەکەم بۆ بگەڕێننەوە ئیلا ئەگەر هاتوو تووشی بەڵایەک بوون و هەمووتان تیاچوون ئەو کاتە ئەویش لەگەڵتاندا تیا بچێ دەسەڵاتتان نەبێ ئەوە ئەبێتە عوزر بۆتان کاتێک کە سوێندیان خوارد بە خوای گەورە کە ئەیپارێزن و ئەهێننەوە وتی: ئەوەی کە ئێمە ئەیڵێین خوای گەورە چاودێرە بەسەرمانەوە هیچ شتێکی لێ ناشاردرێتەوە ﴿٦٦﴾ پاشان کە ڕۆیشتن وتی: ئەی کوڕی خۆم لە یەک ڕێگایەکەوە مەچنە ناو میصرەوە، ئەگەر تووشی بەڵا و موسیبەت بوون تا هەمووتان بەیەکەوە تووش نەبن، یاخود لە چاو ترساوە لەبەر ئەوەی کوڕەکانی یەکجار جوان بوونە نەوەکو ببن بە چاوەوە، بەڵکو لە چەند ڕێگایەکی جیاوازەوە بچنە ژوورەوە کە ڕێگاتان بۆ ئەکێشم ناتوانم هیچ زەرەرو زیانێکتان لێ بگەڕێنمەوە یان هیچ سوودێکتان پێ بگەیەنم و قەدەرو بڕیاری خوای گەورە بگەڕێنمەوە حوکم و بڕیارو هەڵسوکەوت لەم کەونەدا هەر هەمووی تەنها بەدەست خوای گەورەیە، منیش تەنها پشتم بە خوای گەورە بەستووەو متمانەم بە خوای گەورە هەیە، ئەوانەیشی تەوەکول دەکەن با تەنها تەوەکول بکەنە سەر خوای گەورەو کارەکانیان تەنها بە خوای گەورە بسپێرن﴿٦٧﴾ کاتێک چوونە ناو میصرەوە بەو شێوازەی کە باوکیان فەرمانی پێ کردن لە چەند ڕێگاو دەرگایەکی جیاوازەوە چوونە ژوورەوە ئەمە نەیپاراستن و هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندن لەوەی کە خوای گەورە بۆی دانا بوون، ئەمە تەنها ڕەحم و سۆزو خۆشەویستی بوو لە دڵی یەعقوبدا بۆ منداڵەکانی دەریبڕی، یەعقوبیش عَلَيْهِ السَّلَامُ خاوەنی زانیاری بووە کە خۆمان فێرمان کردووە بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەوەی کە یەعقوب ئەیزانێ نایزانن﴿٦٨﴾

ڕای گشتی زانایان لەسەر ئەوەیە کە خۆراک و شتومەکیان بردووە، پاشان ڕێگایان لێ گیراوە، کە جارێکی تر نەیان درێتی، گوایە یوسف پێی وتوون کە ئێوە جاسوسن، ئەوانیش ئەوەیان بەرپەرچ داوەتەوە کە کوڕی پێغەمبەرن و ناسراون بە ١٢ سبطەکەی یەعقوب، یوسف دەڵێت: ئەی کوا دوو کەسەکەی ترتان، دەڵێن یەکیان لەناو چووە و ئەوی تریان لای باوکمانە، بۆ بینینی براکەی داوای کردووە لەگەڵ خۆیان بیهێنن و پارەکەشی بۆ گەڕاندونەتەوە، بەڵام براکانی نازانن کە پارە و کەرستەکانیان بۆ گەڕاوەتەوە مەرج نییە پارە بووبێت، دەشێت پێستە و زیو و ئاڵتون ...هتد بووبێت.

ڕاستەوخۆ چوونە لای باوکیان و ڕایانگەیاند کە هەموو خۆراک و دانەوێڵەیەکیان لێ قەدەغە کراوە، تاوەکو براکەمان لەگەڵدا نەیەت ئەو گەمارۆیەمان لەسەر لا ناچێت، لێرەدا خودی پەیامەکەی یوسف بۆ باوکێتی، چونکە هەردوو لا پێغەمبەرن، بە دڵنیاییەوە خوای گەورە ئەگەر بە ڕەمزیش بووە یەعقوبی ئاگادار کردۆتەوە کە یوسف ماوە، چونکە خەونەکەی نەهاتۆتە دی، خودی ئەم پەیام و هاتوچۆی ئەم برایانە بۆ فێرکردنی یەعقوب و یوسف-ە، چونکە لە داهاتوودا گەلێک لەمانە دروست دەبن، ئەگەر ئەمانە هەر خوار بن ئێ بە دڵنیاییەوە گەلەکەش ناو دەبرێت بە بەنی ئیسرائیل، هەر هەمان جیناتیان هەڵگرتووە، بێجگە پێغەمبەران و پیاو چاکانیان بەهەر حاڵ حەزرەتی یوسف ڕازی نابێت، چۆن یوسف پلانەکەیان بیر دەخاتەوە، باوکی تەواوکەری پلانەکەیە دەڵێت: چۆن بڕواتان پێ بکەم چیتان کرد لە یوسف، وەکو ئەوەی کە کرا هەمبەر بە یوسف، بەتەمان بۆ ئەمیش وا بکەن، بە ناڕاستەوخۆیی سەر لە نوێ بوخچەی ٢٢ ساڵ دەکەنەوە، ئیبن عەباس دەفەرموێت: ٢٢ساڵی تێچووە کە چوونەتەوە لای یوسف عَلَيهِ السَّلَامُ.

هیچ شتێکیان لە یەعقوب پێغەمبەر دەست نەکەوت، فەرمووی بڕۆن وازی لێ بهێنن و هیچ متمانەم پێتان نییە، خۆتان و پەیمان و وەعدتان لای من نرخی(ئەرزشی) نییە.

پاشان کوڕەکان ڕۆیشتن تا پشوو بدەن و ماندوێتی ڕێگایان دەربچێت دواتر زانییان لە هەرچی خەرجی و پارە و سەروەتەکەیانە بۆیان گەڕاوەتەوە، بە پەلە هاتنەوە بۆ لای باوکیان و وتیان: تەماشا بکە باوکە، هیچ پلانێک نییە لە ئارادا ئەوەتا پارەکەمان بۆ گەڕاوەتەوە و براکەمان دەبەین و کاروانەکەمان زیاتر دەبێت لە وشترێک و ئاگاداری براکەشمان دەبین، خۆشیان وا پەییان دەبرد کە یوسف بیەوێت شتێک لە براکەیان بکات، بەڵام کە پارە و ئاڵتون و زێڕەکانیان بینی دڵنیا بوون، کە تەنها داواکاری هاوڕێیانە بووە زیاتر تەعاروف و ڕاستگۆیی دەرخستنی ئەوان بووە.

ئینجا کوڕەکان هەموو باسێکی بەرژەوەندی دەخەنە بەر چاوی باوکیان کە زیاتر و زیاتر خۆراک و شتومەک دەهێنن، ئەگەر براکەیان لەگەڵدا بێت.

باوکیان ڕازی بوو بەڵام بە مەرجی ئەوەی کە سوێندی بۆ بخۆن دەیپارێزن خوای گەورەیان کرد بە وەکیل، لە سوێند خواردن بەمەش یەک برایان سوێندەکەی نەشکاند و مایەوە لای برا بچووکەکەی کە ناسراوە بە (بنیامین).

حەزرەتی یەعقوب کوڕەکانی ئاگادار کردەوە کە هەر یانزەیان بە جارێک و لە دەرگایەکی شارەوە بڕۆن، بەڵکو دابەش بن، لەبەر دوو هۆکاری چاو پیسی خەڵکی و کاریگەری، پاشان ئەگەر دوژمن لە کەمیندا بوو بۆیان هەموویان نەگیرێن، چونکە دەترسن کە پلان لە ئارادا بێت

چۆنە و چۆن نییە، پلانەکە نازانن و یەعقوب هەموو حوکمێک دەگەڕێنێتەوە بۆ خوا، کە ئەمەش مانای بڕوا بوونی تەواوە بە قەزا و قەدەر بە خێر و شەڕی.

خوای گەورە دوو حوکمی هەیە، حوکمێکیان قەدەریە هیچ کەس توانای دەستکاری و دوا خستن و پێشخستنی نییە، کە ئەفەرموێت ببە دەبێت، حوکمی دووەم حوکمی شەرعییە کە بەیانی دەکات و لە ڕێگای پەیامەوە، کە بە پێغەمبەرێک دەنێرێت، تا خەڵکی پیادەی بکەن، ئەویش بریتیە لە فەرمان و ڕێگری کردن لە کاری خراپە.

هەموو کەوتنە ڕێ و وەسیەتەکەی باوکیان جێ بە جێ کرد و لەبەر ئەوەی گرانی و قات و قڕی بوو، مەبەستی یەعقوب دەشێت بۆ ئەوە بووبێت کە وا نەزانن کاروانن و چەتە و ڕێگرە کاروانییەکان ڕێگایان لێ بگرن.

ئەو تێڕوانینەی یەعقوبیش تەنها ئامۆژگاری و وەسیەتێک بوو بۆ کوڕەکانی کرد بۆ پارێزگاری وەکو هەموو باوکێکی دڵسۆز.

﴿وَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَخَاهُۖ قَالَ إِنِّيٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٦٩﴾ يُوسُف

واتە: کاتێک کە چوونە ژوورەوە بۆ لای یوسف دوو دوو لە شوێنێکدا دانیان، براکەی بەتەنها مایەوە چونکە یانزە کەس بوون، باوەشی بە بنیامینی برایدا کرد خۆی پێ ناساندو وتی: من یوسفی براتم خەفەت مەخۆ و دڵتەنگ مەبە بەو کردەوە خراپانەی کە لە ڕابردوودا بەرامبەر بە من کردوویانە٦٩

خودی یوسف منداڵ بووە کە ئەم برایەی جێهێشتووە، ماوەی ٢٢ ساڵە لە یەک دوورن، یوسف کە بەجێ هێشتووە دەشێت شیرە خۆرە بووبێت، گوایە هەموو براکان دوو دوو دانیشتن بنیامین بە تەنها مایەوە، یوسف وتی: من دەبم بە یەکێک لە براکانت و لەگەڵت دا دەنیشم، دیارە هەر لەو دانیشتنەدا خێرا یوسف ئاشکرای دەکات کە برای دایک و باوکی یەکترن.

پرسیار ئەوەیە بۆچی یوسف هەر لە سەرەتاوە خۆی ئاشکرا نەکرد و ئیتر ئەم هەموو هات و چۆیەی لە چییە؟!

وەڵامی ئەو پرسیارە هەر وا سادە نییە، ئەوان ئامادەە بوون یوسف لە ناو بەرن، خۆ ئەگەر یوسف خۆی ئاشکرا بکردایە، ئەوا زۆر ڕێگای تێدەچوو لە گەڕانەوەشدا باوکیان بکوژن بۆ ئەوەی وەکو یوسف ماوە باوکیان بە کارەکەیان نەزانێت و لە ناویان دەبرد، بۆیە یوسف وانەیەکی وای پێشکەش کردن، کە هەرگیز لە بیری نەکەن، یاخود ئەگەر براکەی لە دەست وەرنەگرتبایە دەشێ

وەکو بارمتە لای خۆیان بیانهێڵایەتەوە بۆ مەرجێکی تر تا یوسف ڕازی بکەن، بەڵام حەزرەتی یوسف هەموو سەرەکانی لێ گرتن تواناى هیچ پلاندانێکی تریان نەبوو.

ئینجا یوسف بۆ تەمێ کردنیان و ئاقڵ کردن و بەرزکردنەوەی ڕەوشتیان پلان دادەڕێژێت، داخۆ پلانی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ چی بێت.

﴿فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِى رَحْلِ أَخِيهِ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا۟ وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴿٧١﴾ قَالُوا۟ نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا۟ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٧٤﴾ قَالُوا۟ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِى رَحْلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِ ۚ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِى دِينِ ٱلْمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴿٧٦﴾ * قَالُوٓا۟ إِن يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ ۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِى نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ ۚ قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ۖ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ ۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٧٨﴾ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّظَٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾﴾ يُوسُف

واتە: کاتێک باری بۆ ئامادە کردن و بەڕێکەوتن بە بێ ئەوەی هەست بکەن ئەو صاعەی کە خواردنەکەیان پێ ئەپێوا، یان خواردنەوەی پێ دەخواردەوە کە لە زیو یان ئاڵتون بوو خستیە ناو باری بنیامینی برایەوە پاشان بانگبێژێک بانگی کرد ئەی خەڵکی کاروانەکە بەدڵنیایی ئێوە دزن﴿٧٠﴾ ئەمانیش ڕوویان تێ کردن و وتیان: ئێوە چیتان ون کردووەو بە دوای چیدا ئەگەڕێن﴿٧١﴾

وتیان: صاعی پاشامان بزر کردووە پێش ئەوەی بگەڕێین هەر کەسێک بماندەتەوەو بۆمان بێنێ باری حوشترێکی تریشی ئەدەینێ و من کەفالەت و زەمانەتی ئەکەم کە باری حوشترێکی ئەدەینێ﴿٧٢﴾ وتیان: سوێند بێ بە خوای گەورە ئێوە خۆیشتان ئەزانن و یوسفیش ئەزانێ کە ئێمە نەهاتووینە ئاشووب لەسەر زەویدا بگێڕین و دزی بکەین ئێمە دز نین و نەبووین﴿٧٣﴾

وتیان: ئەی ئەگەر ئێوە درۆتان کردو دزەکە لەناو ئێوەدا بێت سزای ئەو کەسە چی بێت کە دزیەکەی کردووە؟﴿٧٤﴾ وتیان: سزای ئەو کەسەی کە لەناو بارەکەیدا ئەو صاعە بدۆزرێتەوە ئەوە سزاکەیەتی، واتە ئەدرێ بەو کەسەی دزێکەی لێکراوە بەو شێوازە سزای ستەمکاران ئەدەینەوە﴿٧٥﴾ ئەوانیش یەکەمجار باری براکان گەڕان پێش باری بنیامینی برای یوسف بۆ ئەوەی

کە گومان نەچێتە سەریان، دواتر کە گەڕان لەناو باری بنیامیندا دەریان کرد، خوای گەورە ئەفەرموێت: بەم شێوازە نەخشەمان بۆ یوسف دانا نەخشەیەک کە خوا پێی ڕازیەو پڕە لە حیکمەت و بەرژەوەندی، ئەو سزای براکەی خۆی نەدا بە گوێرەی شەریعەتی پاشاکە بەوەی کە ئەبوایە لێی بدراباو دوو قات غەرامە بکرایە، بەڵام ئەم بە گوێرەی شەریعەتی یەعقوبی باوکی کردو کردی بە کۆیلەو بۆ ماوەی ساڵێک لای خۆی هێشتیەوە ئیلا ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بێت پلەی هەر کەسێک بەرز ئەکەینەوە کە ویستمان لێ بێت وەکو پلەو پایەی یوسفمان بەرز کردەوە لەسەرووی هەموو خاوەن زانیارییەکەوە زانایەکی تر هەیە تا دەگاتە خوای گەورە﴿٧٦﴾ ئەوانیش وتیان: ئەگەر براکەمان دزیشی کرد بێت ئەوا پێشتریش برایەکی هەبوو کە یوسف بووە دزی کردووە، کە ئەوترێ باپیری بتێکی هەبووە پەرستوویەتی ئەمیش دزیویەتی و شکاندوویەتی، یاخود وتراوە هەر تۆمەتێک بووە داویانەتە پاڵ یوسف و هیچ دزییەکی نەکردووە، یوسف ئەم شتەی لە نەفسی خۆیدا شاردەوەو دەری نەبڕی، خەفەتی خوارد لەو قسەیەی کە کردیان و ئازاری پێ گەیشت، لە دڵی خۆیدا وتی: ئێوە خراپترین شوێن و مەنزیلەتتان هەیە لەبەر ئەوەی دزی کردنیان دایە پاڵ یوسف، خوای گەورە زاناترە کە ئێوە ڕاستگۆ نین لەوەی کە دزی ئەدەنە پاڵ یوسف و بەم شێوازە وەسفی ئەکەن﴿٧٧﴾ وتیان: ئەی عەزیزی میصر باوکێکی پیرەمێردی بەساڵاچووی تەمەن گەورەی هەیە ناتوانێ بەبێ ئەم کوڕە بژێت، یەکێک لە ئێمە لە جێی ئەو دابنێ و لەلای خۆت بەندی بکە ئێمە ئەبینین تۆ کەسێکی چاکەکاری بەرامبەر بە هەموو خەڵک، بەتایبەتی بەرامبەر ئێمەش ئەم چاکەیەشمان لەگەڵدا بکەو ئەو برایەمان بدەرەوە برایەکی ترمان لەلات جێ دێڵین﴿٧٨﴾ وتی: پەنا بە خوای گەورە ئێمە هیچ کەسێک نابەین تەنها ئەوە نەبێت کە شتومەکەکەی خۆمان لەلای بینیوەتەوە، ئەگەر کەسێکی تر لە جیاتی بەرین ئەوە بەدڵنیایی زوڵم و ستەممان لەو کەسە کردووە﴿٧٩﴾

یوسف و بنیامین دیارە دوای بەیەک گەیشتنیان قسە و باسی زۆری تریان کردووە، ژیانی لە ماوەی چەند ڕۆژێک کە بەیەکەوە بوون بۆی گێڕاوەتەوە، یوسفیش هەواڵی تەواوی دایک و باوکی زانیوە و ئینجا کاتی ئەوەیە براکانی هەموو کەرەستە و کاروانەکەیان ڕێک دەخەن و دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ خاکی کەنعان و یوسف پلان دادەڕێژێت و هەڵبەت براکەشی لێ ئاگادار دەکاتەوە، بۆ ئەوەی ئەویش دەور ببینێت لەگەڵیدا.

پلانەکەش بریتیە لە: هەموو بنەوبارگەی بۆ پێچانەوە ماوەی میوانداریان تەواو بوو، یەکێک لە جامی شەراب خواردنی مەلیک وەکو پلانێک بە پاسەوانەکانی وت بیخاتە ناو باری براکەی کە لە دایک و باوکێکن، هەروەها ئەو جامە یاخود کوپە بووە بۆ پێوانەی دانەوێڵە بۆ خەڵکی، پلانەکە وا بوو کە گوایە براکەی دزیویەتی، کاروانی براکانی یوسف بەڕێکەوت بەرەو خاکی

کەنعان، لە پڕ دوور ئەکەوتنەوە لە سنووری شار کەسێک بانگی دا گوایە جام پێوانەی پادشا دزراوە، ئەی ئێوە کاروانچیانی کەنعان ئێوە دزیوتانە.

براکانی یوسفیش ترسان کەوا ئەوان کاری وا ئەنجام نادەن، چونکە لە کەسایەتیان ناوەشێتەوە دزی، ئەوانیش زۆر لە خۆیان دڵنیا بوون کە دزی ناکەن و وتیان جا چیتان ون کردووە، پاسەوانەکانی یوسف ئەوانەی کە هەڵسابوون بە پلانەکە وتیان کوپ و پێوانەکەی پادشا ئاڵتونە و هەروا شتێکی سادە نییە.

پاشان بانگ چیەکە وتی هەر کەس بردوویەتی لەبەر ئەوەی ڕەوشەکە گرانییە و قات و قڕییە، لێیخۆش دەبین و پاداشتی ئەدەینەوە بە وشترێک خۆراک ئەوەش فەرمانی عەزیزە.

براکانی یوسف هەموو لە خۆیان دڵنیا بوون، کە کاری وایان نەکردووە، وتیان فەرموو بگەڕێن، ئێوە دەزانن ئێمە خراپەکاری و بەدی لەسەر زەویدا دروست ناکەین، سوێند بە خوا ئێمەش دزی ناکەین، ئەو کارە لە ئێمە ناوەشێتەوە، پاشان یوسف وتی لە شەریعەتی باوباپیرانتاندا ئەگەر کەسێک دزی بکات چی لێ دەکەن، ئەوانیش هەموو وتیان: یان دەبێتە کۆیلە، یاخود دیل، چونکە لە زوڵمکاران هەژمار دەکرێت.

یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ شەریعەتی پادشای میسری بەکار نەهێنا، بەڵکو شەریعەتی پێغەمبەرانی بەکارهێنا! خۆ ئەگەر بە شەریعەتی پادشا ڕازی بوونایە نەی دەتوانی براکەی لای خۆی بهێڵێتەوە.

لە دوای پشکنین، جامە ئاڵتونەکەیان لە بارەکەی بنیامین دەرهێنا و هەموو براکانی تووشی شۆک بوون، براکانیشی حوکمیان کردووە بە شەریعەتی باوباپیرانیان بڕیاریانداوە کە شەریعەتی ئەوانیش لە لایەن خوای پەروەردگارەوەیە.

یوسف وانەیەکی وای دانێ کە زۆر ئیحراج بن لای باوکیان، چونکە پاش کەمێکی تر دیسانەوە نیەتی خراپیان دەردەکەوێت کە تووشی پەرچەکردار دەبن، لێرەدا ئەگەر تەماشای ڕەوشەکە بکەین خوای گەورە وشەی ئایینی بەکار هێناوە بۆ یاسا و ڕێسای پادشا، کەواتە هەر کەس دانەری تەشریع بوو با هەر یاسا و ڕێسایەک بێت، ئەوە دەچێتە خانەی ئایین، بۆیە یوسف و براکانی پابەند بوون بە شەریعەتی خواییەوە نەک شەریعەتی پادشای میسر.

کەواتە دین واتا سیستەم و یاسا و ڕێسا دەگرێتەوە...

بگەڕێینەوە بۆ ناو قووڵایی ڕووداوەکان، براکانی یوسف لەو پەڕی ئیحراجیدان لە دوو سەرەوە سەرێکیان جارێکی تر ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ کڕینی خۆراک، پاشان سوێندیان خواردووە

لای باوکیان کە ئاگایان لە براکەیان بێت، پاشان لە ڕەت دانەوەی ئەو کارەی براکەیان وتیان: برایەکی تریشی هەبووە دز بووە! خێرا تانە و تەشەریان دا لەو خێزانەی کە یوسف تێدا هاتووە یاخود لە بەشی یوسف و خێزانەکەی تا ئەم سەردەمەش هەر خاوەنی بوغز و ڕقن دەرحەق بە یوسف بۆیە خێرا دزیشیان دایە پاڵ یوسفی برایان.

یوسف لە ڕووی دا دەرنەکەوت کە پێیناخۆشە، بەڵکو شاردیەوە تەنها فەرمووی ئەمەی دەیڵێن تەنها وەکو جنێوێک نییە، بەڵکو تۆمەتە و خوای گەورەش ئەم تۆمەتە ئەگەر نا ڕاست بێت ئەوا تۆڵەی لەسەر دەکاتەوە، بە دڵنیاییەوە سزاکەی وەردەگرن، زۆر نەکەوتە موناقەشە و باس و خواس پاشان فەرمووی: ئەم وەسفەی یوسف کە دەیکەن خوای گەورە ئاگادارە لەسەری زۆر بابەتیانە لەگەڵیاندا ڕەفتاری کردووە، براکەی لێ وەرگرتن.

پاشان کەوتنە بوارێکی زۆر ئیحراج و سەرشۆڕی، بیریان لەو پەیمان و سوێند خواردنە کردەوە کە بۆ باوکیان وتبوو، هاتن داوای ڕەجا و سۆز و میهرەبانی یوسفیان کرد کە واز لە براکەیان بهێنێت، چونکە باوکی زۆر پیرە و دڵی بەو کوڕەی خۆشە و جیابوونەوەی لێی نییە با یەکێک لە براکانی تری بخاتە جێگای؟

یوسف-یش فەرمووی: پەنا بە خوا ئەوە لە من ناوەشێتەوە کە کەسێکی بێ تاوان بخەمە جێگای کەسێک کە دزی کردووە، ئەمەش وانەیەکی تر بوو پێشکەشی ئەوانی کرد، تا جارێکی تر فێر نەبن لە خۆیانەوە خەڵکی تاوانبار بکەن، هەرچەندە براکانی یوسف بە زمانی عیبری ئاخافتنیان دەکرد یوسف عیبری دەزانی بەڵام بە زمانی میسری کۆن قسەی لەگەڵ کردوون کە پێی وتراوە زمانی (وسطه)، دیارە وەرگێڕ لە نێوانیاندا هەبووە.

جا یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ فێریان دەکات، هەرکەس کەسێکی بێتاوان تاوانبار بکات زوڵمی کردووە لە زاڵمەکان هەژمار دەکرێت.

هیچ چارەیەکیان نەما زانیان یوسف لەسەر هەڵوێستی خۆی بەردەوامە بنیامین ڕادەستی ئەوان ناکات.

﴿فَلَمَّا ٱسْتَيْـَٔسُوا۟ مِنْهُ خَلَصُوا۟ نَجِيًّا ۖ قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِى يُوسُفَ ۖ فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِىٓ أَبِىٓ أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِى ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨٠﴾ ٱرْجِعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ فَقُولُوا۟ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَٰفِظِينَ ﴿٨١﴾ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا ۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾﴾ يوسف

واتە: کاتێک بێ ئومێد بوون لە یوسف ڕۆیشتن لە خەڵکی جیا بوونەوەو بە چپە چپ و نهێنی بەیەکەوە قسەیان کرد، گەورەکەیان پێی وتن: ئایا نازانن کە باوکتان عەهدو بەڵێنی لێ وەرگرتوون بە خوای گەورە کە سوێندتان بۆ خوارد بە خوای گەورە کە ئەبێ کوڕەکەی بپارێزن و بۆی بگەڕێننەوە، پێشتریش کە کەمتەرخەمیتان کرد لە حەقی یوسفدا من ئەم زەوی میصرە بەجێ ناهێڵم و لێی ئەمێنمەوە تا مەگەر باوکم ئیزنم بدات و بڵێ: وەرەوە ئەو کاتە دێمەوە یان خوای گەورە بڕیارێکی تر بدات بەوەی کە بتوانم براکەم ڕزگار بکەم و بیهێنمەوە خوای گەورە باشترین بڕیاردەرە ﴿٨٠﴾ ئێوەش بگەڕێنەوە بۆ لای باوکتان بڵێن: ئەی باوکە ئەم کوڕەی تۆ دزی کردووە، بەچاوی خۆمان نەمان بینیوە دزی بکات تەنها کاتێک زانیمان کە صاعەکەیان لەناو بارەکەیدا دەرکرد، ئێمەیش شتێک کە غەیب و نادیار بێت ئاگاداری نین تا بۆمان دەرکەوێ، واتە: کاتێک کە ئەم دزی کردبێت مەگەر ئێمە خەوتبێتین ئاگامان لێ نەبووە ﴿٨١﴾ پرسیار بکە لە خەڵکی میصر کە ئێمە لەوێ بووین، ئەو کاروانەیشی کە لەگەڵیاندا هاتین پرسیار لەوانیش بکە کە ئێمە ڕاستگۆین لەو قسانەی کە ئەیکەین کە دزی کردووەو بردوویانە ﴿٨٢﴾.

بە تەواوەتی دڵنیا بوونەوە کە یوسف هیچ هاوکاریان ناکات بۆ براکەی ئینجا کەوتنە بیرکردنەوە چی بکەن، ئینجا برا گەورەکەیان کەوتە باسی ئەو عەهد و پەیمانەی کە داویانەتە باوکیان، ئەمجارەش هەروەکو چۆن یوسفیان سەرگەردان کرد، بیریان دەخاتەوە کە زیادەڕۆیان کرد لە بەرانبەر یوسفی براشیان ئینجا ئەگەڕێنەوە ڕوشدی برا گەورەکەیان و دەڵێت: من میصر جێ ناهێڵم و ناگەڕێمەوە بە چ چاو و ڕوویەک ڕووبەڕووی باوکم ببمەوە، یان خوای گەورە حوکم و فەرمانم لەسەر دەکات، دیارە مەبەستی وەحی بووە لە ڕێگای باوکیەوە.

داوا دەکات لە براکانی تر کە هەموو بگەڕێنەوە، بە باوکتان بە ڕاشکاوانە ڕابگەیەنن کە کوڕەکەت دزی کردووە، ئەوەیشی بینیومانە و ڕووداوەکەیە بۆی بگێڕنەوە، پاشان دەتوانێت بپرسێت لەو قافڵانەی کە لە وڵاتی میصرەوە دەگەڕێنەوە، مەبەست (قرية) ئەو جێگایەی کە ڕووداوەکە تێدا ڕووی داوە، بڵێن بە باوکمان خەڵکێکی زۆر شاهیدی و ئاگاداری ئەو ڕەوشە بووە، تەنها نەبووین و کارەکە لە نێوانی ئێمەدا ڕوویدابێت کەسانێکی زۆر ئاگادار بوون بەو ڕەوشە و ڕووداوە.

داخۆ لە دوای قات و قڕی و گرانی، بۆ باوکی پیریان یەعقوب چ هەواڵێکی تر دەبەنەوە و چۆن باوکیان پێشوازییان لێ دەکات، ئەم زنجیرەیەش لێرەدا کۆتایی دێت بە گەیشتنەوەی یوسف و براکانی و ئیحراج و سەرشۆڕی براکانی و دڵ ناڕەحەتی یەعقوب.

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨٣﴾ وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَـٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٨٤﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ تَفْتَؤُا۟ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوْ تَكُونَ مِنَ ٱلْهَـٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُوا۟ بَثِّى وَحُزْنِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ يَـٰبَنِىَّ ٱذْهَبُوا۟ فَتَحَسَّسُوا۟ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَا۟يْـَٔسُوا۟ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ لَا يَا۟يْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾﴾ يوسف

واتە: کاتێک کە گەڕانەوەو بۆ یەعقوب عَلَيْهِ السَّلَام -یان گێڕایەوە فەرمووی: بەڵکو ئەمە نەفستان ئەم ئیشەی بۆ جوان کردوون و ڕازاندۆتەوە کە ئەڵێن: کوڕەکە دزی کردووە لە حەقیقەتدا ئەو دزی نەکردووە، فەرمووی: صەبرو ئارامگرتنێکی جوان ئارام ئەگرم کە هیچ گلەیی و گازندەیەکی تیا نەبێت لە خوای گەورە، بەڵکو خوای گەورە هەموویانم بۆ بگەڕێنێتەوە بەدڵنیایی هەر خوای گەورە زۆر زاناو کاربەجێیە ﴿٨٣﴾ پشتی تێ کردن و قسەی لەگەڵدا بڕین و دیسانەوە خەفەتی بۆ یوسف عَلَيْهِ السَّلَام خواردچاوی سپی بوو لە غەم و خەفەتداو ڕەشایی لە چاویدا نەما، ئەو غەم و خەفەتی خۆی ئەشاردەوەو بۆ کەسی دەرنەئەبڕی ﴿٨٤﴾ وتیان: سوێند بە خوای گەورە تۆ بەردەوام بیری یوسف ئەکەیت و خەفەتی لێ ئەخۆی تا لەش و عەقڵت بێهێز دەبێت و لەناو دەچێت یان هەر ئەمریت و تیا ئەچی ئەوەندە خەفەت ئەخۆیت و ئەوەندە بۆی ئەگری ﴿٨٥﴾ واتە: ئەوپەڕی غەم و خەفەت و سەختترینی، یەعقوب عَلَيْهِ السَّلَام فەرمووی: شەکواو گلەیی و ئەوپەڕی غەم و خەفەتی خۆم بۆ لای خوای گەورە دەرئەبڕم ئەوەی کە لەلایەن خوای گەورەوە من ئەیزانم ئێوە نایزانن، لە ڕەحم و بەزەیی خوای گەورە، یان پاداشت وەرگرتن لەسەر موسیبەت، یاخود خوای گەورە پێی وتووم و ئەزانم یوسف زیندووە، یان یوسف خەونەکەی ڕاست بووەو هەر ئەگەڕێتەوە ﴿٨٦﴾ ئەی کوڕی خۆم بڕۆن بگەڕێن بەدوای یوسف و براکەیدا، [(تەحەسوس) گەڕانە بۆ شتی چاک، (تەجەسوس) گەڕانە بۆ شتی خراپ] بێئومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوای گەورە، بە دڵنیایی هیچ کەسێک بێئومێد نابێت لە ڕەحمەتی خوای گەورە تەنها کەسانێکی کافرو بێباوەڕ نەبێت ﴿٨٧﴾

گەڕانەوە بەردەم باوکیان و ڕووداوەکەیان بۆ گێڕاوە، بەڵام یەعقوب بە دڵ پڕ ئازار و دڵ شکاو بە یوسف وا کوڕێکی تری هەر لە خێزانی ڕاحیل لەدەست دا، بێجگە حاڵی یوسف داخۆ دایکی یوسف لە چ حاڵ و ڕەوشێکدا بێت، لێرەدا خوای گەورە زیاتر خۆشەویستی باوک ئەدات، چونکە خۆشەویستی دایک قسە و باسی ناوێت، دایک خۆشەویستی لە باوک بەهێز ترە بۆ منداڵەکانی، لێرەدا لایەنی باوکایەتی زیاتر نیشان ئەدرێت و دەردەکەوێت چونکە دایکی یوسف و بنیامین لە ناو ڕووداوەکاندایە و حاڵ و گوزەرانی باشتر نییە لە حەزرەتی یەعقوب، چونکە

ڕووداوەکانیش پەیوەندی بە مێژوو و ژیان و پێغەمبەرانەوە هەیە، میحوەرە سەرەکییەکان دەردەکەون، نەک هەموو لاکانی تریش، یەعقوب لە باسی گورگ خواردنی یوسف وەسفەکەی بە ڕاست نەزانی، بەڵام لێرەدا ڕووداوەکەی بە ڕاست زانی، لێرەوە هیوا دەردەکەوێت، ئەگەر چی دڵی پڕ ئازار و شکستەیە، دەڵێت خوای گەورە بەڵکو هەردووکیانم بۆ بگەڕێنێتەوە، هەموو ئەمانە پەیوەندی بە جوانی ئارام گرتنەوەیە، ئارام گرتن بە واتای ئەوەی هەرگیز ناشوکری و دەنگ بەرزکردنەوە ڕوو نادات لە ئەنجامی فەرمانی خوایی، هەروەکو هیوای بۆ گەڕایەوە بۆ هاتنەوەی هەردووکیان، بەڵام سیفاتی خوای گەورەی خستە ڕوو (العليم الحكيم)، واتا خوای گەورە زانایە چی ڕوو ئەدات لە ڕووداوەکان و حەکیمە، بە ڕێکخستنی هۆکارەکان، خوای گەورە بەزانستی و حیکمەتی ستراتیژی قەزا و قەدەر ڕێک دەخات و فەرمانی پێدەکات.

ئەم هێزە ئیمانییە بەهێزە لە ناو دڵی ئەم پیاوە بە ساڵاچووە، هیوا و ئاوات و ڕەجایە لە خوای پەروەردگارەوە، هەست کردنە بە ڕەحمەتی خوای موتەعال، ئەم شعورە تەنها لە دڵی ئەو کۆمەڵە خەڵکە هەڵبژاردە دەردەکەوێت کە هەموو ژیان و کار و فەرمانیان گرێ داوە بە خوای موتەعالەوە، ئەو هەست و شعورە قووڵەش هەرگیز هەڵەیان لەگەڵدا ناکات بەرامبەر بە خوای پەروەردگاریان.

پاشان دیمەنێکی تری ئەم باوکە دڵ پڕ ناسۆرە بۆ دوو کوڕەکەی چووە خەڵوەتگەکەی خۆی، ئەوەندە بە تەنها گریا بوو چاوەکانی لەدەست دا بوو بۆ کوڕە خۆشەویستەکەی یوسف، وا ئێستا بنیامینیش هاتە سەر خەم و خەفەتی، باشترین چارەش ئارام گرتنە، هۆکاری لەدەستدانی ئەم کوڕەشی خەم و ناسۆری یوسفی بۆ نوێ کردەوە، هەر بۆیە فەرمووی حەزرەتی یەعقوب بە داخەوەم بۆ یوسف، خەم و خەفەت و گریان چاوی ڕەشایی تێدا نەبوو لە دوای ناسۆر و ئازاری لە دووری یوسف.

تەنانەت منداڵ و خێزانەکانی ئەوەندە بەزەییان پێیادا دەهاتەوە، بۆ ئەو هەموو ناڕەحەتییەی دەیچەشت، سەرزەنشتیان دەکرد، دەیانوت خۆت لە ناو دەبەیت بە هۆکاری بیرکردنەوەت لە یوسف، یوسف تەواو بوو جارێکی تر ناگەڕێتەوە و بە تەمای مەبە!

هەموو خەم و غەمبارییەکانی واز لێ دەهێنا بۆ خوای موتەعال، یەعقوب هەرگیز سکاڵای نەبردۆتە لای هیچ کەس، هەمیشە پەیوەندی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بوو، پەیوەندیەکی زۆر توند و تۆڵ و خوای گەورە زۆر شتی فێر دەکرد، هەر بۆیە هەست بە خوا پەرستییەکی زۆر تۆکمە دەکەیت کە دەڵێت هەموو خەم و موصیبەتەکانم دەگەڕێنمەوە بۆ لای خوای موتەعال، ئەمەش مۆخی بەندایەتی و ئولوهیەتە، هەر لە ڕێگای ئەو پەیوەندییە خوای گەورە فێری کرد کە مەئیوس نەبێت لە کوڕەکانی و بە تایبەت یوسف، هەر بۆیە ئەو ماوە دوور و درێژە گوێی بۆ کوڕەکانی نەگرت، چاوەڕوانی یوسفی دەکرد، ڕووبەڕوی ئەو واقیعە سەخت و گرانە

دەبووەوە، هیچ گۆڕانکارییەکی لە هەست و نەستی یەعقوب دا نەکرد، چونکە زۆر متمانەی بە پەروەردگاری هەبوو، ئەمەش ئەو ئیمانە بەرز و کامڵەیە کە خوای موتەعال دەیبەخشێتە پیاو چاکان و پێغەمبەرانی، هەر بۆیە یەعقوب جارێکی تر بە باسی یوسف کوڕەکانی ئاگادار دەکاتەوە دەڵێت کوڕەکانم بێ هیوا مەبن لە ڕەحمی خوای گەورە هەڵسن بڕۆن بگەڕێن بە دوای یوسف و براکەیدا، دەیزانی پەیوەندییەک لە نێوان هەردوو کوڕەکەیدا لە ئارادایە، بۆیە دیسان یوسفی لەگەڵ بنیامیندا باس کردووە، خۆ نەوتراوە کوڕەکەی تری کوژراوە یان مردووە بەڵکو لە جێگایەک دەست بەسەرە، بەڵام یەعقوب باسی یوسفیش دەکات، ئەمەش ئەو زانستەیە کە خوای موتەعال بەخشیویەتییە یەعقوب خەڵکی تر نایزانێت.

جا قورئان وشەی (فتحسسوا) بەکار دەهێنێت، چونکە دەبێت بە ئیحساس و هەست و درک پێکردن یوسف بدۆزنەوە، چونکە یوسف لە چاویان ون بووە ناتوانن بە شێوە و شکڵ بیناسنەوە.

ئینجا وانەیەک فێری منداڵەکانی دەکات ئەویش بێ هیوا نەبوونە، خۆ ئەگەر مرۆڤ بێ هیوا بوو ئەوا کاری بۆ ناکرێت، هەموو ژیانی لەسەر بونیادی ماددی بونیات دەنێت، بەڵام مرۆڤی ئیماندار بونیادی هەموو ژیانی و کردار و بیرکردنەوەی پەیوەستە بە خوای پەروەردگارەوە، خوای گەورەش لە هەموو تواناداراەکان بە توانا ترە و بە دەسەڵاترە، ئەوەی ویستی لەسەر بێت دەبێت ئەوەشی نەیەوێت بەدڵنیاییەوە نابێت، بۆیە دەرچوون لە هەموو ناڕەحەتی ئازار و دڵە ڕاوکێیەک زۆر ئاسانە لای پەروەردگارت، بۆت بگۆڕێت بە ئارامی و ئاسایش و خۆشحاڵی و ڕەحمەت بەڵام بەو مەرجەی متمانەت بە خوای خۆت هەبێت و دڵ و مێشک و هەموو کردارت بەوە پەیوەست کردبێت.

﴿فَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ قَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهْلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئْنَا بِبِضَـٰعَةٍ مُّزْجَىٰةٍ فَأَوْفِ لَنَا ٱلْكَيْلَ وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَآ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَجْزِى ٱلْمُتَصَدِّقِينَ ﴿٨٨﴾ قَالَ هَلْ عَلِمْتُم مَّا فَعَلْتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذْ أَنتُمْ جَـٰهِلُونَ﴿٨٩﴾ قَالُوٓا۟ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُ ۖ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَـٰذَآ أَخِى ۖ قَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَآ ۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَإِن كُنَّا لَخَـٰطِـِٔينَ﴿٩١﴾ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ ۖ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ ۖ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾ ٱذْهَبُوا۟ بِقَمِيصِى هَـٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِى يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِى بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ﴿٩٣﴾﴾ يوسف

واتە: کاتێک گەڕانەوە بۆ میصر چوونە ژوورەوە بۆ لای یوسف وتیان: ئەی عەزیزی میصر خۆمان و کەسوکارمان تووشی زەرەرو زیانێکی زۆر بووینە، لە بێ بارانی و وشکەساڵی و نەبوونی شتومەکێکی خراپمان هێناوە کەس لێمانی وەرناگرێ و لێمانی ناکڕێ، تۆ خواردنمان پێ بدە لەبەرامبەریدا بە باشی و بەتەواوی وەکو پێشتر چاکەشمان لەگەڵدا بکەو زیاترمان بدەرێ،

یاخود براکەمان بۆ بگەڕێنەوە بەدڵنیایی خوای گەورە پاداشتی ئەو کەسانە ئەداتەوە کە چاکەکارن و ئەبەخشن ﴿٨٨﴾ کە یوسف براکانی باسی نەبوونی و حاڵی خراپی خۆیان کردو ئەمیش بیری باوکی کەوتەوەو بەزەیی پێیاندا هاتەوەو خۆی ئاشکرا کردو فەرمووی: ئایا ئەزانن ئێوە پێشتر چیتان بە یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ و براکەی کرد؟ کاتێک کە ئێوە نەزان بوون﴿٨٩﴾ وتیان: بە دڵنیایی تۆ یوسفی، هەر ئەوەندە کە ناوی یوسفی برد زانیان کە ئەمە خۆی یوسفە و سەریان سوڕما فەرمووی: بەڵێ؛ من یوسفم و ئەمیش بنیامینی برامە، بە دڵنیایی خوای گەورە نیعمەتی خۆی ڕژاند بەسەرمانداو ڕزگاری کردین، هەر کەسێک تەقوای خوای گەورە بکات و ئارام بگرێ ئەوا بەدڵنیایی خوای گەورە پاداشتی چاکەکاران نافەوتێنێت﴿٩٠﴾ وتیان: سوێند بە خوای گەورە، خوای گەورە تۆی هەڵبژاردو فەزڵی دایت بەسەر ئێمەدا، ئێمە بەڕاستی هەڵەو تاوانمان کرد﴿٩١﴾ فەرمووی: ئەمڕۆ هیچ سەرزەنشت و لۆمە ناکرێن بەڵکو لێتان ئەبوورم، خوای گەورە لێتان خۆش بێت، هەر خوای گەورە زۆر بەڕەحم و بەزەییەو لە هەموو کەس بەڕەحم و سۆزو بەزەییترە﴿٩٢﴾ ئەم قەمیسەم بەرن هەڵیبدەنە سەر ڕووی باوکم یەکسەر خوای گەورە چاوی چاک ئەکاتەوە لە نابیناوە ئەبێتە بینا، هەموو کەسوکارتان بێنن بە ژن و خێزان و منداڵەوە ﴿٩٣﴾

بۆ جاری سێیەم براکانی یوسف چوونەوە بۆ لای عەزیزی میسر، کە ئێستا یوسف دەوری ئەو دەبینێت، وا برسێتی تەنگی پێ هەڵچنیون، پارەیان کەم بووە سەرەوەت گۆڕینەوەی کەرەستەیان زۆر کەمە ئەوەی هەیان بوو زۆربەی زۆری دراوە بە خۆراک، دەچنەوە بۆ لای یوسف بۆ کڕینی خۆراک بەڵام بە شکاوی و زەلیلی، چوونە لای یوسف وتیان: ئەی جەنابی وەزیر یاخود جەنابی عەزیز خۆمان و کەس و کارمان لە قەیرانێکی زۆر ئاڵۆز و دژوار داین برسێتی تەنگی پێ هەڵچنیوین، بەو کەرەستەی پێمانە خۆراکمان پێبفرۆشە و هاوکاری چاکە و خێرمان لەگەڵدا بکە.

یوسف کە بەو حاڵە بینینی چیتر خۆی پێنەگیرا کە لە بەرگی عەزیزی میصردا لەگەڵیاندا مامەڵە بکات، ئیتر کاتی وانەی چاکسازی نەماوە چونکە ئەوان لە بار و زروفێکی زۆر دژواردان، کاتی ئەوەیە کە تووشی شۆکیان بکات و ڕاستی و دروستی خۆی ئاشکرا بکات، هەر بۆیە باوکیان فەرمووی: بڕۆن بە دوای هەست کردن بە یوسف و براکەی بن، یوسف دەیان گەڕێنێتەوە بۆ ڕابردوویان ئینجا لە شێوەی تەحقیق، باسی هیچکام لە باروزروفی ئێستا ناکات دەیانگەڕێنێتەوە بۆ ٢٤ - ٢٥ ساڵی ڕابردوو، کە هیچ کەس ئاگای لەو حاڵ و گوزەرانەی یوسف نەبووە بێجگە خوای پەروەردگار، بە دەنگێکی پڕ سۆز و قوڕگ پڕ لە گریان و تووڕەیی پێوە دیارە لە ئەنجامی ڕەفتارەکەیان، یوسف دەڵێت: ئایا دەزانن چیتان کرد بە یوسف و پاشان براکەشی؟! کاتێک نەزان و جاهیل بوو؟!

بە تەواوەتی دەنگی عەزیزی میصر هەموویانی تووشی شۆک کرد، ئیتر ڕاستەوخۆ هەست و شعوریان جولا و شکڵ و شێوەی یوسفیان کەوتەوە بەر چاو لە بەرگی عەزیزی میسردا !

ڕاستەوخۆ وتیان: ناشێت تۆ یوسف نەبیت، یان لە شێوەی دڵنیایی وتیان دەی تۆ یوسفی، مەگەر وا نییە؟! ئیتر دڵنیان هەموو هەستیان پێکرد کە ئەوە یوسفی برایانە، ویستیان یوسف لەبەر چاوی باوکیان ون بکەن، باوکی بۆی کوێر بوو، فرۆشتیان لە ماڵی عەزیزی میصر سەری هێنایە دەر، خستیانە ناو بیر وا هەموو لە بەردەمیدا زەلیلن و خۆی بۆتە عەزیزی میصر، هەموو ئەمانە لە ناخ و هەستیاندا وەکو فیلمێکی سینەمایی خێرا خۆی نمایش دەکات.

یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: بەڵێ؛ من یوسفم ئەوەش براکەمە کە ئێوە بە چاوی کەم لە کاتی ئەو پلانەی دامانڕشت لای خۆم گلم دابووەوە، نە دزە و نە هیچ بەڵکو منەتێکی پەروەردگارە کە شادی کردینەوە بە یەکتری، ئەوەشتان لە بیر بێت، هەرکەس ئارامگر و خۆ پارێز بوو خوای پەروەردگار پاداشتی ئەداتەوە لە هەردوو دنیا.

وا براکانی زەلیل و سەر شۆڕن لەبەردەم یوسف دا وەستاون، چاوەڕوانی سزای دادپەروەرانەی یوسف دەکەن داخۆ چیان لێ بکات و چۆن تۆڵەیان لێ بکاتەوە، ئەوانیش لە تاو شەرمەندەی خۆیان و زەلیلیان ناچارن کە دان بە تاوانەکەیاندا بنێن، چونکە تاوانلێکراو و تاوانباران ڕووبەڕووی یەکترن، تاوانلێکراویش خاوەن دەسەڵاتە، خۆی دادوەری دەکات، ئەوان ناتوانن نکۆڵی کارەکەیان بکەن، بۆیە ناچار دەستیان کرد بە دانپێدانانی تاوانەکەیان و وتیان، خوای گەورە تۆڵەی لە ئێمە کردەوە بە هۆکاری ئەو تاوانەی ئەنجامماندا، خوای گەورە تۆشی سەرخست و پلە و پایەی پێ بەخشیت، ئێمەش زەلیلین لەبەر دەستدا و بۆ کۆتا جار تۆ سەرکەوتیت و ئێمەش دۆڕاین.

چاوەڕوانی یوسف-ن وەڵامداتەوە، یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ حەقی بوو تۆڵەیان لێ بکاتەوە لە توانایشیدا هەبوو، بەڵام پیاوی ئازا و جوامێر هەرگیز ڕووبەڕووی خەڵکی سەرشۆڕ و زەلیل نابێتەوە، یوسف لە هەموو نارەحەتی و میحنەت و موصیبەت خوای گەورە سەرکەووتوی کرد، یوسف دەستی کرد بە وتەکانی و ئەوانیش تف لە گەروویاندا وشکی کردووە، فەرمووی: ئەمڕۆ ڕۆژی تۆڵە کردنەوە نییە، بەڵکو ئێوە برای منن، خوای گەورە لێتان خۆش بێت چونکە زاتی بەرزی میهرەبان و بەخشندەیە، لە دڵ و دەروونی یوسف دا هیچ ئیرەیی و ڕق و کینەی تێدا نەبوو، بە دڵنیاییەوە پێغەمبەرە هەر دەبێت وابێت، هەموویانی بەخشی و ئەوەندەی تر براکانی ئیحراج کرد، ئەمەش لە هەموو پیاوێک ناوەشێتەوە مەگەر پیاوانی خوا، هەر وەکو چۆن پێغەمبەری ئازیز صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەموو خەڵکی شاری مەکەی بەخشی.

پاشان دیمەنێکی تر بە ڕووماندا دەکرێتەوە، ئەویش داهاتنی ئاو سپیایەتی چاوی باوکیان و چاک بوونەوەی، پاشان موشتاق بوون بۆ دیدەنی باوکی و دایکی و کەسوکاری، خۆشکردنی دڵی باوکی و لە خەم ڕەخساندنی ئیسپاتی وجوودی پێغەمبەرایەتی یوسف لای براکانی بە موعجیزە، هەر بۆیە بە براکانی فەرموو بڕۆن کراسەکەم بەرن بۆ باوکم بابیخاتە سەر چاوی، چاوی دەبینێت و چاک دەبێتەوە، هەموو کەسوکارتان بهێنن بۆ ئەم وڵاتە و لێرە ژیان دەکەین.

﴿وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلۡعِيرُ قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ۝٩٤ قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ ۝٩٥ فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗاۖ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ۝٩٦ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا ٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ۝٩٧ قَالَ سَوۡفَ أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ۝٩٨﴾ يُوسُف.

واتە: کاتێک کاروانەکە لە میصر دەرچوو بەرەو شام باوکیان لەوێوە وتی: من بۆنی یوسف ئەکەم ئەگەر تۆمەتبارم نەکەن بە گێلی و نەزانی و عەقڵ لە دەستدان۝٩٤ ئەوانەی کە لەوێ بوون لە کەسوکاری وتیان سوێند بە خوای گەورە تۆ لە ڕێگای ڕاست لاتداوەو لەسەر ڕێگا کۆنەکەتی کە ئەوەندە یوسفت خۆش ئەوێ ئاگات لە خۆت نەماوە هەر بە ئومێدی بگەڕێتەوە۝٩٥ کاتێک کە موژدەدەرەکە هات قەمیسەکەی یوسفی هەڵدایە سەر رووی یەعقوب یەکسەر بە ئیزنی خوای گەورە چاوی چاک بوو، یەعقوب عَلَيۡهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئایا من پێم نەوتن کە من لەلایەن خوای گەورەوە هەندێک شت ئەزانم کە ئێوە نایزانن۝٩٦ وتیان: ئەی باوکە داوای لێخۆشبوونمان بۆ بکەو لێمان خۆش بە لە تاوانەکانمان، بەڕاستی ئێمە هەڵەو تاوانمان کرد۝٩٧ فەرمووی: لە دواترا لەبەرەبەیاندا داوای لێخۆشبوونتان بۆ ئەکەم لە پەروەردگارم تا لێتان خۆشبێت لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا دوعا قەبووڵە بەراستی خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو و بەبەزەییە۝٩٨

لە ناو ئەم ڕووداوانەدا زۆر ڕووداوی کوت و پڕ و لە ناکاو ڕوویداوە لەبەردەمیدا خۆمان بینیوەتەوە وەکو عەرەب دەڵێت موفاجەئە لە دوای موفاجەئە، بەهەر حاڵ کاتێک یوسف عَلَيۡهِ السَّلَامُ کراسەکەی نارد بە کاروانەکەدا بۆ باوکی تابیخاتە سەر چاوی، چاوی چاک بێتەوە، کاروانەکە کە نزیک بوویەوە باوکی یوسف لە دوورەوە وتی بۆنی یوسف دەکەم، کێ لەو کاتەدا خەیاڵی بۆ لای یوسف دەچوو لە کەسوکار و نزیکەکانی یەعقوب، هەموو وتیان لە پیریدا خەڵەفاوە و ئەقڵیشی لە دەست داوە، هەر چەندە ئەو دڵنیای کردنەوە فەرمووی بۆنی یوسف دەکەم ئەگەرچی دووریش بێت!

هەرچەندە ڕای زۆری لەسەرە کە گوایە هەر لە خاکی میسرەوە بۆنی کردووە یان لە خاکی کەنعان، بەهەر حاڵ گرنگە بۆ ئێمە، کە خۆشەویستی ئەم باوک و کوڕە و پاشان نیشاندانی موعجیزە لە نێوانیاندا و بوون بە پێغەمبەری یوسف و دانان بە پێغەمبەرایەتی دا لە لایەن باوکیەوە.

پاشان خەڵکەکە وتیان چییە لەسەر بای پەڕەی کۆنی، یوسف ٢٥ ساڵە کەس نازانێت لە کوێیە، تازە بە تازە تۆ دەڵێیت بۆنی یوسف دەکەم، بەڕاستی ئەمە پیری و خەڵەفاوییە.

کاروانەکە گەیشتن و هەواڵی یوسفیان هێنا، پاشان بۆنی کراسەکەی گەیشتە لای یەعقوب، خەڵکەکە هەموو بە چاوی خۆیان بینیان کە چاوی چاک بووە و هەموو ئەم کارە لە ناکاو کتوپڕ و موفاجەئانە لە کاتێکی زۆر کەمدا ڕوویاندا، بەڵام یوسف چۆن لە براکانی خۆش بوو، پەیامی نارد بۆ باوکی لێیان خۆش بە، ئەگەر کراسەکەی منیان هێنا بە خوێنی درۆ وا ئێستا کراسەکەی منیان بۆ هێناویت و چاوت وەکو جارانی لێ دێتەوە بە ئیزنی خوای پەروەردگار، پاشان یەعقوب بە هەموویانی ڕاگەیاند کە من دەیزانم ئێوە نایزانن، ئەو زانین و زانستەش لای خوای پەروەردگارەوەیە، ئینجا پێدەچێت گەڕانەوەی بنیامین و کراسەکەی یوسف هاوکات بووبێت بۆ ئەوەی دوو جار مژدەی دڵ خۆشی باوکیان بێت.

پاشان هەر ١٠کوڕە تاوانبارەکەی کۆبونەوە داوای لێبووردن و لێخۆشبوونیان کرد لە باوکیان و دانیان نا بە هەڵە و تاوانی خۆیان، باوکیشیان فەرمووی پێدەچێت لێتان خۆش بم و داوای لێخۆشبوونتان لای خوای گەورە بۆ دەکەم، وشەی (سوف) تەنها لە دڵێکی شکاوی باوکانەوە هات، دەنا باوک بەیەک جار منداڵەکانی خۆش دەوێت حەز بە مەرگی هیچکامیان ناکات، بە دڵنیاییەوە داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەکات لای خوای پەروەردگار و خوای پەروەردگار بەبەزەیی و میهرەبانە.

﴿فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَبَوَيۡهِ وَقَالَ ٱدۡخُلُواْ مِصۡرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ۝٩٩ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ۝١٠٠﴾ يُوسُف

واتە: کاتێک کە ڕۆیشتن بۆ لای یوسف ئەو هاتە پێشوازییان لە ڕێگاو باوەشی کرد بە دایک و باوکیدا پێی وتن: فەرموو وەرنە ناو میصرەوە (إن شاء الله) ئەمینن لێرە هیچ کەسێک ستەمتان لێ ناکات ۝٩٩ دایک و باوکی بردە سەر کورسییەکەی خۆی، هەموویان کوڕنوشیان بۆی برد هەر یانزە براکەو دایک و باوکیشی فەرمووی: ئەی باوکە ئەمە لێکدانەوەی خەونەکەمە کە پێشتر

خەونم بینی و بۆم باس کردیت، پەروەردگارم گێڕای بە خەوێکی حەق و ڕوویدا خوای گەورە چاکەی لەگەڵدا کردم کاتێک کە منی لە بەندیخانە دەرکرد، ئێوەشی لە دەشتەوە هێنا لە زەوی کەنعان لە شامدا کە لە دەشتدا ئەژیان و ئاژەڵیان هەبووە، دوای ئەوەی کە شەیتان نێوان من و براکانمی تێکدا بەدڵنیایی پەروەردگارم زۆر بەڕەحم و بەزەیی و نەرمونیانە بۆ هەر کەسێک کە ویستی لێ بێت بەدڵنیایی خوای گەورە زۆر زاناو کاربەجێیە ﴿١٠٠﴾

سەرەتای ئەم باس و ڕووداوانە کە بە باشترین هەواڵ و بەدواداچوونی ژیانی پێغەمبەرانە، بە خەونێک دەست پێدەکات و کۆتاییەکەی بە تەفسیری ئەو خەونە کۆتایی دێت، کۆتاییەکی زۆر ئارام و دڵ خۆشکەر بوو، پاشان لە پڕ جێگا و سەردەم دەکات و زەمەن تەواو دەبێت و دەگەین بە زنجیرەی کۆتایی ڕووداوەکان، باوک و دایکی دێنە لای یوسف و پاشان بەرزیان دەکاتەوە بۆ جێگاکەی خۆی و خۆشی لە لایاندا وەستاوە و هەر ١١ براکەشی سەری ڕێز و حورمەتی بۆ دادەنەوێنن و لە پڕ یوسف دەڵێت: ئەوە تەفسیری خەونەکە بوو کە پێشتر دیبووم، هەر لە ڕێگای قەدەری خەونەکەمەوە بوو کە ئێوەی لە دەشتەکی بوون بەرەو شارنشینی هێنا، واتا کوڕانی یەعقوب کۆچەر بوون، وا ئێستا نیشتەجێ بوون، دوای ناڕەحەتی و دووری و شەیتان کەوتنە نێوان من و براکانم و وا کۆتایی بە موصیبەت و خەم و خەفەت هات، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار بە لوتف و کەرەم بوو بەرانبەر بە یوسف بەرانبەر بەوانەش کە زوڵمیان لێ دەکرێت، سەرەتای باسەکە و کۆتای باسەکە بە (علیم و حکیم) دێت کە خوای گەورە زانایە بەسەر هەموو شتێکەوە و هەموو هۆکار و کارێک بە حیکمەت دەکات، ئەمەش ناوخنی مانا و مەدلولی قەزا و قەدەرە.

﴿۞ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِۖ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ﴿١٠١﴾﴾ يُوسُف.

واتە: یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی پەروەردگارم پێغەمبەرایەتی و موڵکی میصرو خەزێنەکانیت پێ بەخشیم، فێری لێکدانەوەی خەونت کردم، ئەی دروستکەرو داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی هەر تۆ دۆست و پشتیوان و سەرخەرو یارمەتیدەری منی لە دونیاو قیامەتدا بە موسڵمانێتی بمرێنەو بمگەیەنە بە کاروانی پیاوچاکان لە پێغەمبەران﴿١٠١﴾

پاشان کۆتایی و پایانی ڕووداوەکانی ژیانی یوسف لە دوای گەیشتن بە ویصالی کەسوکاری و سوڵطان و سوپاس و ستایشی پەروەردگاری دەکات، هەموو غەم و کۆششێکی و خەونێکی ئەوەیە کە بە موسڵمانی بمرێت و بگات بە چاکەخوازان، خۆی لە پاڕانەوەی کۆتایی ژیانی لە پیربوونیدا دەڵێت: پەروەردگار موڵک و دەسەڵات و سەروەت و سامانت پێ بەخشیوم، ئەمە مانای سوپاس گوزاری و پێزانینە.

پاشان زانستی لێکدانەوەی خەون و زانستی ئابووریت فێرکردووم بە هەمان شێوەش سوپاسگوزارییە، ئینجا ئەی پەروەردگاری ئەم گەردوونە زاتی بەرزت گەورە و سەرخەری منە و هاوکارمە دە بمرێنە و با لەگەڵ پیاو چاکاندا بم.

ئەمەش گەورەترین شەهادە بوو کە بە دەستی هێنا لە تاقیکردنەوەکانی.

لە ناو ئەهلی کیتاب دا هاتووە کە هەموو ماڵ و سەروەت و سامانی خەڵکی بەدەست هێنا و هەمووی لێکڕینەوە بە خۆراک و پاشان هەموویانی ئازاد کردوو سەروەت و سامانەکەی پێدانەوە.

پاشان لە ناو ئەهلی کیتاب دا وا هاتووە کە گوایە یەعقوب ١٧ ساڵ لە وڵاتی میسر ژیاوە و پاشان وەفاتی کردووە و هێناویانەتەوە بۆ ئەو جێگایەی کە باووباپیرانی لێ نێژراون لە خاکی کەنعان لە ناوچەی (حبرون)، ماوەی ٧ ڕۆژ پرسەیان بۆ گرتووە پاشان گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتی میسر، هەروەها یوسفیش کە وەفاتی کرد لە خاکی میسر وەفاتی کرد، بەڵام ئەویش مێژوونووسان و ئەهلی کیتاب دەڵێن گەڕاندوویانەتەوە بۆ خاکی کەنعان و لە تەنیشت باوکی و باپیرانی لە ئەشکەوتی حبرون نێژراون.

ئەو ماوەیە کە نەوەکانی یەعقوب لە وڵاتی میسر مانەوە پادشایەتی لە بنەماڵەی هیکسۆس بوو، وەزیرانیش لە بنەماڵەی یەعقوب، لە دوای وەفاتی یوسف، یەهوزای برای بوو بە عەزیزی میسر.

## شیکارییەک لەسەر خەون و لێکدانەوەی

خەون دیاردەیەکی زۆر سەیرە لە ڕووی زمانی شەرعیەوە دەڵێن خەون مەخلوقێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە، زۆر ئەستەمە مرۆڤ لە ڕووی زانستی و سایکۆلۆجی و زانستی پزیشکییەوە بتوانێت بگاتە هیچ ئەنجامێک، لەم زیندانی کافرستانەدا داوای چەند سەرچاوەیەکی زانستیم کرد، کە بە پارەش بووە بیگەیێنە دەستم کە لە ڕووی زانستی و قسەی پوختی زانست، لە بارەی خەونەوە چی دەڵێت، لە کتێبخانەی زیندانەکە زیاد لە ١٢ بۆ ١٥ کتێبم بۆ هات پشکنینم بۆ کرد هەموو یەک وتەیان هەبوو، دواتر باسی دەکەم بۆتان دەگوازمەوە، لە کۆتاییدا دڵم ئاوی نەخواردەوە هەموو سەرچاوەکان کۆن بوو، واتا لە ساڵی ٢٠٠٠ بۆ ٢٠١٨ بوو، داوام کرد کە نوێترین لێکۆڵینەوەم بەدەست بگات کە باسی دیاردەی خەونبینین بکات، دوو گۆڤاری نوێیان بۆ هێنام بە پارەیەکی یەکجار زۆر، کە خۆی لە ڕاستیدا بۆ زیندان زۆرە دەنا لە دەرەوەی زیندان ئاساییە ئەویش گۆڤاری نەرویجی بە ناوی (VITENSKAP) کە جۆری زۆرە ئەوەی لای من گرنگ بوو بەشی سایکۆلۆجی بێت و ئەو باسە بێت کە باسی خەونبینین دەکات لە لاپەڕە (٧٢

و ٧٣) ناوی (Mentale Funksjoner)، دوو لێکۆڵینەوەی گرنگی لە خۆ گرتبوو بە زمانی نەرویجی، هەرچەندە گۆڤارەکە ١٢٠ لاپەڕەیە، بەڵام ئەو بەشە زیاتر لە ١٠ بۆ ١٥ لاپەڕی تەرخانە بۆ مێشک، گۆڤاری دووەم گۆڤارێکی جیهانی بە ناوی (NATIONAL GEOGRAPHIC) لە لاپەڕە ٨٦ باسی لێکۆڵینەوەی دیاردەی خەون بینینە لێکۆڵینەکە بە ناوی ( The dreaming (brain

من لێرەدا کۆی گشتی هەموو باسەکانم بۆ گوشیون لە پێناسەیەکی زانستی ماددی پوخت دەخەمە بەر دەستتان، بە گشتی زانست پێی وایە کە بیرکردنەوەی مرۆڤ بەدەست خۆی نییە و سەربەخۆیە، هەموو ئەوانەی دەیبینێت تۆماری دەکات و لە میمۆری بچووکی مێشکدا هەڵیدەگرێت و پاشان دەیگوازێتەوە بۆ میمۆری گەورەی مێشک و لە کاتی خەوتندا پێچەوانە دەبێتەوە بێ ئەوەی مرۆڤەکە دەسەڵاتی هەبێت بەسەریدا، خەوبینینی مرۆڤ زۆر کورتە لە چەند چرکەیەک تێپەڕ ناکات، پاشان زانست دانی ناوە بەوەی دەنگی خەونبینین و وێنەی خەونبینین چۆن دێت تا بزانێت هیچ تەفسیرێکی بۆت نییە، تەنها تەفسیری ئەوەیە کە گوایە (ئیفرازاتی) فرێدانی وێنە ڕابردووەکانە لە مێشک و میمۆریدا.

هەڵبەت پێناسەی تری زۆرە ئەمە کۆی گشتییە کە بۆ خوێنەری بەڕێزم هەڵبژاردووە کە هەموو کەس بتوانێت لێی تێبگات.

لەگەڵیدا باسی بواری ترس و نەخۆشی و خۆشی و منداڵی و گەورەیی و جێگا و سەردەم هەمووی باس دەکات لە چوارچێوەی ئەو پێناسەی کە ئاماژەمان پێداوە، زیاتر زانیاری تر دەخەینە ڕوو لە داهاتوودا کە زانست چی دەڵێت.

لە ڕاستیدا زانست زۆر کەم زانیارییە لەسەر ئەم بوارە، بۆیە لە ڕووی ئەمانەتی زانستییەوە سەرەتا باسمان کرد بۆ ئەوەی شیکارییەکە کاڵ و کرچ نەبێت، ئینجا با بزانین زانایانی بواری خەون بینین لە ڕووی ئایینەوە چی دەڵێن؟!

ئەبو محەمەدی دینەوەری دەڵێت: زانستی خەون و ئەوانەی کە لێکدانەوەی بۆ دەکەن، خەونبینین چەندین جۆرە، خەونیش شتێکی نادیار و قووڵ و لەتیفە و بە هێز، زۆر سەختە و لە سەختیش سەخت ترە، جۆرەکانی خەون بینین توخمێکە لە توخمەکانی وەحی، وەحیش پەیوەستە بە پێغەمبەرانەوە.

بینینی خەو پەیوەندی بە ڕۆحی مرۆڤەوە هەیە و زانایان هیچ لە بارەی ڕۆح نازانن، ئیتر چۆن دەتوانن بگەن بە بینینی خەون.

ئیبنو تەیمیە دەڵێت: خوای گەورە دەفەرموێت: ( بەندەکەم بینیت ڕۆحی لای منە و لاشەی لە بەندایەتیدایە) ئەمەش مەبەست لە مرۆڤە کە خەو دەبینێت و لە خەونیدا سوجدە دەبات، شێخی ئەلبانی ئەم فەرموودەیەی بە ڕاست داناوە هەروەها زانایان دەڵێن: ڕۆح لە خەوندا لەگەڵ قەدەردا تێکەڵ دەبێت و زۆرجار داهاتووی خۆی یان خەڵکی تر دەبینێت.

کەواتە چۆنیەتی خەوبینین لای زانایانی ئیسلام و هەروەها زانست شتێکی نا دیارە و نەزانراوە، بەڵام لێکدانەوە بۆ خاوەنی زانستی تایبەتی خۆیەتی سەدان زانا و ڕاڤەکار لەم بوارە کتێبیان نوسیوە.

کەواتە ماددەم لە خودی خەوبینینی و چۆنییەتی زانایان و زانست بە نادیار و سەخت تەفسیریان کردووە، توانای ماددی بەسەریدا ناشکێت، نووسین و قسەکردن لەسەری ئەوەندە زیاتر درێژدادڕییە.

کەواتە ئێستا باشترە لە جۆری لێکدانەوە باسی ئەو زانستە بکەین کە حەوت جۆر لێکدەدرێتەوە و بنەڕەتی ئەو زانستە چۆنە و لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە.

گومانی تێدا نییە بنەڕەتی لێکدانەوەی خەون پێغەمبەرانن و شارەزاترین کەسن بەو پرسە، پاشان ئەبوبەکری سدیق ڕەزامەندی خوای لێبێت و هەندێکی تر لە هاوەڵان و پاشان شوێنکەوتوانی هاوەڵان. لە لێکدانەوەی خەون ئیبنو سیرین و شێخ حەسەنی بەصری...هتد، لێکدانەوەی خەون زانستێکی زۆر موعتەبەرە، بەڵام ئەو کەسەی لێکیدەداتەوە دەبێت شارەزا بێت لە قورئان و تەفسیر و قیاس واتا بە پێوەرکردن و فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ و زانستی شەرعی و شیعرە نایابەکانی عەرەب کە وشەکانی تێدا ڕوون کراوەتەوە، کەواتە ئەو کەسەی کە لێکدانەوەی خەون دەکات، بەلای کەمەوە دەبێت شارەزای زانستە ئیسلامییەکان بێت و لە زانایان بێت.

ئەبو محەمەدی دینەوەری دەڵێت: لێکدانەوەی خەون لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت، لە دینێکەوە بۆ ئایینێکی تر زۆر جیاوازتر دەبێت، کەسایەتییەکان ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لە لێکدانەوەی خەونەکانیان واتا خەونی کەسێکی خواناس و کەسێکی نا پابەند زۆر جیاوازە، یان خەونی دکتۆرێک وەکو قەسابێک لێکنادرێتەوە، خەون بە گوێرەی کات و سەردەم لێکدانەوەکانیشی جیاواز دەبێت، ئەمەش بنەڕەتی ئەو زانستەیە کە دەبێت لێکدەرەوەی خەون ڕەچاوی بکات.

زانایەکی تر بە ناوی (شهاب العابر) کتێبێکی نووسیوە لەسەر زانستی خەون لێکدانەوەیە بە ناوی (البدر المنیر) لە لاپەڕە ١٤٩-١٥٣ دا دەڵێت: لێکدانەوەی خەون بۆ کەسەکە دەبێت ڕەچاوی زمانی قسەکردنی بکات، پاشان پیشەی سەربازێک جیاوازە لەگەڵ کەسێکی بازرگان،

کەسێکی هەژار لێکدانەوەی خەونی جیاوازە وەکو کەسێکی خۆش گوزەران، یاخود جیاوازی ئایین، هەروەها بۆ کەسێکی ئیماندار خواردنی مردوو ماڵی حەرامە ئەگەر پارە داربوو، بۆ کەسی هەژار دەچێتە خانەی باسکردنی خەڵکی نزیک ئیرەیی بردن، بۆ کەسێک کە ئایینی جیاوازە لێکدانەوەی تر هەڵدەگرێت.

ئەگەر وەرزەکانیش جیاواز بوو بەهار و هاوین و زستان و پاییز خەونبینین تێیدا هەر لێکدانەوەی جیاوازی بۆ دەکرێت، ئەگەر لە زستاندا جلی گەرم و ئاوی گەرم هەر شتێکی گەرم بەکار بهێنیت ئەوە خێر و چاکە و خۆشییە، بەڵام لە هاویندا ئەوە واتای نەخۆشی و نەهامەتی و ناڕەحەتی...هتد.

لێکدانەوەی خەون بۆ پیشەوەران جیاوازە، بۆ نموونە ئەگەر کەسێکی سەرباز لە خەونێک جل و بەرگی جەنگی پۆشی و چەکی ئامادە بوو بۆ جەنگ ئەوا نیشانەی سەرکەوتنە، بەڵام ئەم خەونە ئەگەر خواناس و عابیدێک ببینێت واتای بەتاڵی و وەرنەگرتنی بەندایەتیەکانیەتی، بۆ خەڵکی تر واتای فیتنەیە یاخود دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی.

بۆ نموونە وەکو هەیئەت و شێوە و شکڵی ئەو کەسەی کە دابونەریتی جیاوازیان هەیە، لە خەوندا ڕیشتاشین و سەرتاشین واتای لابردنی ناڕەحەتی و ناهەمواریە، بۆ هەندێک ڕێک پێچەوانەکەیەتی، کەواتە ئەو زانایەی کە خەونەکە لێکداتەوە دەبێت ئاگاداری حاڵی ئەو خەڵکە بێت، زۆر نموونەی تر باس دەکات لە کتێبەکەیدا، بەڵام بۆ ئەم باسە ئەوەندە کۆتایی بە وتەی (شهاب العابر) دەچینە لای زانایەکی تر کە زیاتر ئەم باسە ڕوون دەکاتەوە، کەسێکی تر لە زانایانی ئەم بوارە ناسراوە بە (القادري) لە کتێبی (التعبیر) (بەرگی یەکەم، لاپەڕە ١٠٧-١٠٨) خەونی هەموو مرۆڤێک پلە و پایەی دەست نیشان دەکات، چونکە خودی خەونبینین جۆرێکە لە جۆرەکانی زانست، جۆری خەونەکەی بەهای مرۆڤەکە دیاری دەکات، هەموو خەونێکیش ڕازی قەدەری خاوەنەکەی دیاری دەکات یاخود قەدەری خۆی و باوباپیرانی نیشان ئەدات لە کردار و پیشە و خواناسیان، زانایەکی تر بە ناوی (شاهین) لە کتێبی (الإشارات) دا لاپەڕە ٦٣٣ هەموو لێکدانەوەی خەونێک بە گوێرەی حاڵی خاوەنەکەی دەگۆڕێت ئینجا نموونەیەک لە لێکدانەوەی خەونی ئیبن سیرین دێنێت و دەڵێت: کەسێک خەونی بینیووە لەسەر مینبەر وتار ئەدات، ئیبنو سیرین وتی: ئەوە گەیشتنە بە دەسەڵات و پلە و پایە و سوڵطان، بەڵام ئەگەر کەسێک توانای لەو بوارەدا نەبوو، واتا ئەهلی نەبوو ئەوا لە سێدارە ئەدرێت یاخود لە خاچ یان تووشی شکستی حەیا و حورمەت دەبێت.

کەواتە بە گوێرەی حاڵ و سەردەم خەون بینین گۆڕانکاری بەسەردا دێت، لە کتێبی (تعبیر الرؤیا) ئەبو محەمەد دینەوەری دا لاپەڕە ٩٢ دەڵێت: کەسێک خەونی بینی بە بەخشینی ٧٠ گەڵای دار، ئەبوبەکر فەرمانی کرد کە ٧٠ جەڵدی لێبدەن، بۆ ساڵی ئایندە هەمان خەونی بینی

و گێڕایەوە بۆ ئەبوبەکر ٧٠ هەزار درهەمی پێ بەخشی، پاشان کەسەکە پرسی هۆکار چییە ساڵی ڕابردوو ٧٠ قامچیت لێدام و ئەم ساڵیش ٧٠ هەزار درهەمت دامێ؟

لە وەڵامدا ئەبوبەکر فەرمووی: ساڵی ڕابردوو سەردەمی هەڵوەراندنی گەڵا بوو، لەم ساڵەدا دەست پێکی جۆری گەڵایە، جیاوازی لە سەردەمەکاندایە زۆربەی زانایانی ئەو بوارە لە ئەبوبەکری صدیقەوە بنەمای تەعبیری خەونیان کردووە، نموونەی لێکدانەوەی داریان جیاکردۆتەوە جارێک بە گەڵاکەی جارێک بە تەختەکەی جارێک بە سێبەر و بەروبوومەکەی، یان بە جوانی ڕەگی یان بە کۆی گشتی خودی دار و دارستان...هتد.

کەواتە پێشینانمان کە تەفسیر و لێکدانەوەی خەونیان کردووە بە گوێرەی حاڵ و ئەحواڵی خەڵکی سەردەمەکە کردوویانە، کە لێکدانەوەی خەونێکان بۆ کەسێک کردووە بۆ نموونە: فلانە خەون ئەوە تەعبیرەکەیەتی، بۆ هەموان نەبووە، بەڵکو هەمیشە تایبەت کراوە بە کەسەکەوە، ئەمەش ئەصڵ و بنەڕەتی زانستەکەیە کە بەو شێوە دامەزراوە.

(شەهابی عابر) لە تەفسیری کەسێک لە خەونیدا بووە بە فریشتەی ڕوح کێشان چەندین لێکدانەوەی بۆ کردووە، بۆ کەسێک وتوویەتی دەبیتە قەساب، یان قەسابی دەکەیت، بۆ کەسێکی تر بە خوێنڕێژ و ڕێگر لێکدراوەتەوە پاشان تۆبە دەکات، یان بۆ کەسێکی تر کە وڵات دەگرێت و شار و خەڵکی وێران دەکات و دەکوژێت لەگەڵ حاڵی خەڵکەکاندا لێکدانەوەکەش جیاواز بووە.

هەموو ئەم نموونانەی کە باسم کرد بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مرۆڤ ناتوانێت لەمڕۆدا بە هۆکاری ئەو کتێبی خەو نامانانە کە دراوەتە پاڵ ئبن سیرین، ڕاڤەی خەون بکات و خەو لێکبداتەوە، هەندێک لە زانایان بە حەرامیان داناوە، هەندێک بە شیرک و قسەکردن لە غەیبیات و پەنهانی هەژماریان کردووە، بە درێژی بەڵگەکانی دەخەینە ڕوو بە پشتیوانی خوا.

باشترین پێوەر بۆ لێکدانەوەی خەونی چاک و کەسی باش قورئانی پیرۆزە، هەروەها لێکدانەوەی خەون بە جۆرێک لە جۆرەکانی شیعری (عروض) کە (عەلی کوڕی ئەبوطالیبی قەیرەوانی) دایناوە ئەویش پێوەرێکی باشە بە ناوی (عارضة الأحوذي)، بەڵام لەگەڵ ڕەچاوکردنی باسەکانی ڕابردوو بۆ ئەم زانستە هەروەها (إبن شاهين و شێخ عبدالغني النابلسي) دەڵێت: هیچ کات نابێت ئەو کەسەی کە لێکدانەوەی خەون دەکات پەلە بکات لە تەفسیرکردنی خەونی خەڵکیدا، تا بتوانێت هەموو ڕووەکانی بخوێنێتەوە و بیزانێت، (ئەبی سەعیدی واعظ) دەڵێت: باشترین کار ئەوەیە کە ئەو کەسەی خەون لێکئەداتەوە پشکنینی تەواو بکات بە خەونەکە و لە ئوصول شارەزا بێت، واتا لە زانستە بنەڕەتییەکان وەکو قورئان و فەرمووده و شەریعەت و ئوصولی فیقهی ئیسلامی.

هەروەها زانای ئەو بوارە نیل شێخ خالید عەنبەری لە کتێبی (القاموس) لاپەڕە (١٠-١١) دا دەڵێت: هەندێک خەڵکی تانە و تەشەر ئەدەن لە لێکدانەوەی خەون، کە گوایە هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و دروست لەبەر دەست نییە بۆ لێکدانەوەی هیچ پێویست بە لێکدانەوە و تەفسیر و تەعبیر ناکات، چونکە دەچێتە خانەی غەیبیات و بە هیچ شێوەیەک جائیز نییە، لە ڕاستیدا ئەم وتەیە تا ڕادەیەک زیادەڕۆییە، چونکە ناچێتە خانەی غەیبیات ئەگەر کەسەکە خۆی خاوەنی ئەو توانایە بێت بەڵکو دەچێتە خانەی ئیجتیهاد جۆری ئەقڵی لێکدەرەوەکەی بەو پێوەرانەی بەکاری دەهێنێت.

## حوکمی ئەو کەسانەی کە تەفسیری خەون دەکەن

لێرەدا دەبێت ئەوە باش بزانرێت کە لە ڕووی شەرعییەوە کتێبێک یاخود هەر پێوەرێکی گشتی وەکو ئەوانەی ئێستا لە بازاڕدا هەیە بەناوی کتێبی ئیبنو سیرین دەفرۆشرێت و خەونی پێ لێکدەدرێتەوە، ئەوە بەهیچ شێوەیەک جائیز نییە و بەو شێوەیە خەون لێکبدرێتەوە لەو کتێبانەوە یاخود وێب سایتەکانەوە، خەڵکیان پێوە سەرقاڵ کردووە. هەروەها ئەوانەشی لە ڕێگای ئەو کتێبانەوە خەون لێکدەدەنەوە زانایان بە جاهیل و نەزان ناویان بردوون و هیچ شارەزاییان لە لێکدانەوەی خەون نییە، چونکە زۆر ئاسانە نەمرۆڤێک کتێبێک لە بازاڕ بکرێت و لە ڕێگای ئەو کتێبەوە خەون بۆ خەڵکی لێکبداتەوە، ئەمەیە دەچێتە بواری فاڵ گرتنەوە و غەیبیات.

چونکە هیچ لە بواری ئەو زانستەوە نییە لەو جۆرە کتێبانەدا، هەر لە ڕاستیدا کتێبێکی تایبەت نییە بە لێکدانەوەی خەون، خودی ئیبن سیرین و زانایانی تر هیچ کتێبێکیان لەو بارەیەوە نەنووسیوە بێجگە ئەو کتێبانەی کە باسی خودی زانستەکە دەکەن و چۆنیەتی لێکدانەوە و پێوەرەکانی هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا خەون بە گوێرەی خاوەنەکەی گۆڕانکاری ڕیشەیی بەسەردا دێت، بێجگە کات و شوێن و حاڵی کەسەکە کە خەونی بینیوە (إبن شهاب) دەڵێت: ئەگەر بێت و خەڵکی پێوەریان تەنها ئەو کتێبانە بێت، ئەوا زۆر شتیان لەبیرکردووە کە هیچ لە کتێبەکاندا نەنووسراوە، بۆ نموونە لەمڕۆدا زۆر شت هەیە کە گرنگی خۆی هەیە، لە فڕۆکە و کۆمپیوتەر و مۆبایل و چاویلکە و جۆرەکانی ماتۆڕ و پاسکیل و سەیارە، پاشان کارەبا و گەرمی و سپلیت و گڵۆپ فێنکایی و ئامێرە پێشکەوتوەکانی سەردەم بەگشتی، پێوەری ئەم شتانە و کاتەکان بە سەردەمی ئیبنو سیرین و ئەبو محەمەدی دینەوەری...هتد ناکرێت و پێویستی بە زانای لێزان هەیە لەو بوارەدا تا لێکبداتەوە.

(النابلسي) لە کتێبی (تعطير الأنام)دا دەڵێت: بۆ ئەوانەی کە تەفسیری خەون دەکەن ڕێگا زۆرە بۆ دەرکردنی تەئویلی خەون، بەهیچ شێوەیەک خەون لێکدانەوە لە کتێبێکدا یان لای

زانایەک کۆنەبوتەوە، بەڵکو زۆر فراوانە و بواری زۆری تێدایە کە زانایانی ئەو بوارە لێکدانەوەی لێدەربهێنن و دەکەوێتە سەر ئەقڵی کەماڵی زاناکە و خوای گەورەش هیدایەتی کەسێک ئەدات کە بیەوێت بۆ ڕێگای ڕاست، هەروەها دەڵێت: لێکدانەوەی خەون لای ئەو کەسانەی کە لە ڕێگای کتێبەوە خەون لێکئەدەنەوە، ئەو کەسانە جاهیلن بە هونەری خەونلێکدانەوە لەڕووی شەرعییەوە جائیز نییە و دروست نییە ئەو ڕێگایە، هەرکەس ئەو جۆرە تەفسیرانە بکات، بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئاداب و چوارچێوەی ئەو زانستە ئەوا کەوتۆتە بواری فەساد و گەندەڵی، چونکە هیچی لەو زانستە نەزانیوە و شارەزا نییە لە بنەماکانی، ئەمەش بۆی جائیز نییە و حەڵاڵ نییە، ئەوەشی ئەو کارە دەکات لە عامەی خەڵکی، هەڵەیەک کەوتۆتە ناو هەڵەیەکی بیروباوەڕی، ئەمەش دەقی زۆربەی زۆری زانایانە، واتا دەقی کۆی گشتی وتەکانیانە کە لە نابلسی-یەوە گواستویانەتەوە. لە کتێبی (شرح زروق على الرسالة) لەوێدا وتەیەکی مالیکی هێناوە، مەبەستی ئیمامی مالیکە و دەڵێت: ئایا گونجاوە کەسێک شارەزا نەبێت لەو بوارە و تەفسیری خەو بکات و لێکیبداتەوە، ئەویش دەڵێت: دەکرێت بە گاڵتەکردن نبوئەتی پێغەمبەران.

مەبەستی زیاتر لەوانەیە کە لە ڕێگای کتێبەکانەوە تەئویل و تەفسیر و لێکدانەوە دەکەن، ئەبو محەمەدی دینەوەری دەڵێت: ناسراوە بە (إبن قتيبة) زانای ناسراوی ئەو بوارە (شيخ علي الصعيدي) لە کتێبی (حاشية العدوي على شرح الكفاية الطالب الرباني الرسالة إبن أبي زيد القيرواني) لە بەرگی ٢ لاپەڕە ٤٦٥) دا دەڵێت: بەهیچ شێوەیەک جائیز نییە لێکدانەوەی خەون لە ڕێگای کتێبەکان کە لە بازاڕدا دەفرۆشرێن، وەکو ئەوەی کە ئێستا دەکرێت، ئەوە حەرامە! چونکە لێکدانەوەی خەون لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت و جیاوازی دەکات لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر.

هەروەها (أحمد بن غنيم النفراوي) لە کتێبی (الفواكه الدواني) هەمان ڕاوبۆچوونی هەیە، بەحەرامی داناوە ئەو کەسانەی بەناو کتێبی ئیبن سیرین خەون لێکئەدەنەوە.

(شيخ الدردير) لە کتێبی (شرح أقرب المسالك) دەڵێت: زانستی تەفسیری خەو لە کتێبدا نییە، بەڵکو لای زانایانە کە بەگوێرەی حاڵوگوزەران و هەیئەتی خەڵکی و جێگاو شوێن و سەردەمیان تەفسیر و لێکدانەوەی بۆ دەکات، ئەوەی بە کتێبی ئیبن سیرین خەون لێکئەداتەوە ئەوە حەرامە و خودی کتێبەکەش حەرام دەکات، بەکارهێنانی بۆ ئەو بوارە دەڵێت: دەبێت بە تێگەیشتن و لێکدانەوەی زانای ئەو بوارە بێت.

هەروەها زانای گەورە شیخ عوثیمین لە بەشداربووندا لە (فتاوى نور على درب) دا لەبەرگی (٢) لاپەڕە (٤٨٣-٤٨٤)دا پرسیاری لێ دەکەن دەربارەی کتێبی خەونامەی ئیبن سیرین و ئەو خەونامانەی کە دەیبەستنەوە بە ڕزق و ڕۆزی ئەجەل و شەڕو خێر ئایا حوکمی چییە؟

لەوەڵامدا دەڵێت: ئامۆژگاری برایانی موسڵمان دەکەم کە تووشی فیتنە نەبن بەو جۆرە کتێبانە، تەماشای مەکەن و ئیهمال بکرێت، چونکە ئەوە وەحی نییە تا بڵێین ڕاستە، دەشێت هەڵە بێت یان ڕاست بێت، چونکە لێکدانەوەی خەو بە گوێرەی مرۆڤەکە و کەسایەتی دەگۆڕێت، هەروەها بە گوێرەی کات و شوێن و سەردەمیش ئەگەر کەسێک لە خەوندا وێنایەکی بینی یاخود دیمەنێک ئەمەش مانای وانییە کە بگشتێنرێت، بەڵکو بۆ کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاواز دەبێت. هەربۆیە داواتان لێدەکەم کە واز لەو جۆرە کتێبانە بهێن، چونکە هیچ سوودی نییە، ئەگەر زیانی نەبێت.

پاشان شیخ عثیمین دەفەرموێت: ئەگەر خەونتان بینی شوێن سوننەتی پێغەمبەری خوا بکەون، ڕێگاو شوێنی پێغەمبەرەکەمان ون نەکەین، جەنابیان فێرمان دەکەن کە خەونێکی خۆش و خێرمان بینی، حەزی کرد بۆی لێکبدرێتەوە بابڕواتە لای کەسێکی زانا کە خۆشی دەوێت، خۆ ئەگەر خەونێکی ناخۆشی بینی و ترسی لێی هەبوو بابڵێ پەنا دەگرم بە خوای موتەعال لە شەیتانی نەفرەت کراو (أعوذ بالله من الشيطان و من شر ما رأيت)، بۆ هیچ کەسی نەگێڕێتەوە، زانابێت یان نەزان. بەڵکو هەڵگەڕێتەوە سەر لاکەی تر بۆ نووستن یان هەڵسێت لەخەو نوێژ بکات و قورئان بخوێنێت.

ئەگەر مرۆڤ وەکو ئەوەی پێغەمبەرەکەی فەرمانی پێکردووە کردی، ئەوا تووشی هیچ زەرەرو زیانێک نابێت بە پشتیوانی خوای گەورە، هاوەڵان خەونیان دەبینی پێی نەخۆش دەکەوتن، هەتا پێغەمبەر فێری کردن ڕزگاریان بوو لە شەڕی خەونی خراپ و شەیتانی.

هەر هەمان پرسیار لە (مجموع الفتاوى)کەیدا لە شیخ فوزان کرا ئەویش فەرمووی: زانستی تەفسیری خەون، خوای گەورە وەکو دیارییەک دەبەخشێ بە یەکێک لە زانای عابید و خواناسەکان، ئەم وەرگرتنی زانستە هەڵبژاردەی خواییە، مەرج نییە هەموو زانایەکیش پێ بگات، هەروەکو چۆن بەخشیبە پێغەمبەر یوسف عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ، پاشان پرسیار لە شیخ فوزان دەکەن سەبارەت بە کتێبی خەونامە.

جەنابیان لە وەڵامدا دەڵێت: گومان لەوەدا نییە کە خەون بینین حەقە و یەکێکە لە بەڵگە ڕوونەکانی خوای پەروەردگار، لێکدانەوەی خەون و تەفسیرکردنی پێویستی بە فەراسەت و زیرەکی یە، هەروەها جەنابیان ئاماژە بۆ وتەیەکی نایابی ئیبنو قەیمی جەوزییە دەکات لەکتێبی (إعلام الموقعين) بەرگی یەکەم، لاپەڕە ١٦٩-١٧١دا دەڵێت: زۆرێک لە کتێبی خەوننامە نووسراوە، هەندێکیان دراونەتە پاڵ ئیبن سیرین هەندێکیش بۆ خەڵکانێکی تر، هیچ سوود و خێرێکی تێدا نییە کە مرۆڤ خۆی پێوە سەرقاڵ بکات، چونکە مێشک و ئەقڵی مرۆڤ تووشی تەشویشی دەکات، لەوانە تووشی زیاتر خەون بینینی ناخۆش و قەلەقی دەکات، زۆرێک لەو کتێبانەی نووسراوە نووسەرەکانی هیچ زانست و زانیاریان نییە لەو بوارەدا، زۆرجار تەفسیر و

لێکدانەوەکانیان ڕێک پێچەوانەیە و ڕاستی و دروستی نازانن یان لە خۆیانەوە قسە دەکەن، بەبێ زانستی خەون لێکدانەوە. زانایانی خەون لەهەموو کات و سەردەمێکدا هەن و جێگایان دیار دەبێت، بەڵام کەمن کە شارەزا بن لەو بوارەدا زۆر کەمن وەکو خوێی ناو ئاردن بۆ نانکردن لەچاو زانایانی تردا، چونکە ئەم زانستە خوای گەورە دەیبەخشێت بە زاناکانی ئەم ئیسلامە، هەروەکو خوای گەورە لەسەر زمانی یەعقوب دەفەرموێت:

﴿وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦﴾﴾ يُوسُف.

واتە: بەم شێوازە پەروەردگار هەڵت ئەبژێرێ و دەتکات بە پێغەمبەر، فێری لێکدانەوەی خەونت ئەکات نیعمەتی خۆی تەواو ئەڕژێنێ بەسەرتدا بەوەی ئەتکات بە پێغەمبەر، موڵک و خێری دونیاو قیامەتت پێ ئەبەخشێ، نیعمەتی خۆی تەواو دەکات بەسەر ئالی یەعقوبدا وەکو پێشتریش نیعمەتی خۆی تەواو ڕژاند بەسەر ئیبراهیم و ئیسحاق دا بەوەی کە کردیانی بە پێغەمبەر، ئیبراهیمی پاراست لە ئاگرەکە و کردی بە خەلیلی خۆی بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر زاناو کاربەجێیە ﴿٦﴾

﴿قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ ۚ إِنِّى تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾﴾ يُوسُف

واتە: فەرمووی هیچ خواردنێکتان لەلایەن پاشاوە بۆ نایەتە ناو بەندیخانەوە ئیلا من پێتان ئەڵێم کە چ خواردنێکتان بۆ دێت پێش ئەوەی کە پێتان بگات، یاخود لە خەوندا بۆتان نایەت ئیلا من پێتان دەڵێم ئا ئەمە پەروەردگارم فێری کردووم من قەومێکم بەجێ هێشتووە کە ئیمانیان بەخوای گەورە نییە، ئەوان باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نییە ﴿٣٧﴾

* رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِى مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِى مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِىِّۦ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِى مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ يُوسُف

واتە: یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی پەروەردگارم پێغەمبەرایەتی و موڵکی میصرو خەزێنەکانیت پێ بەخشیم فێری لێکدانەوەی خەونت کردم ئەی دروستکەرو داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، هەر تۆ دۆست و پشتیوان و سەرخەرو یارمەتیدەری منی لە دونیاو قیامەتدا بە موسڵمانێتی بمرێنەو بمگەیەنە بە پیاوچاکان لە پێغەمبەران﴿١٠١﴾

ئەو کەسانەی کە شارەزایی تەواویان هەبووە یوسف پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ هەروەها محمد پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، پاشان ئەبوبەکری صدیق و عەلی کوڕی ئەبوطاڵیب و سەعیدی کوڕی موسەییب و ئیبن سیرین ڕەزامەندی خوایان لێ بێت.

## کۆی گشتی باس

﴿قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾﴾ هود

واتە: ئەی گەل و هۆزەکەم و خزمەکانم ئەگەر منتان بینی و بۆتان دەرکەوت کە لەسەر بەرنامەیەکی ڕێک و ڕۆشتم لەلایەن پەروەردگارمەوە، هەر لەلایەن ئەویشەوە ڕزق و ڕۆزیی باش و ماڵ و سامانی زۆرم هەیە، من نامەوێ قەدەغەی شتێکتان لێ بکەم کەچی خۆم وەک ئێوە نەکەم (چی بە ئێوە بگەیەنم خۆم لە پێشا ئەنجامی دەدەم) من تەنها چاکەخوازیم دەوێت، بەگوێرەی توانام، من بەردەوام تەوفیق و یارمەتی و سەرکەوتوییم تەنها لەلایەن خواوەیە، پشت و پەنام تەنها ئەوەو تەنها بۆلای ئەو دەگەڕێمەوە.

ئەم پرۆژەی یوسفییە بەگشتی بۆ کۆمەڵ و لایەنە ئیسلامییەکانە کە هەرکەس ویستی چاکسازی بکات سەرەتا پێویستی بە لایەنی پەروەردە و ڕەوشتە لەسەر ئاکارێکی ڕەسەن، پاشان چاکسازی ئەنجام ئەدرێت.

بەگشتی لایەنە ئیسلامییەکان لە ڕێژەیەکی نەگۆڕدا ماونەتەوەو جەماوەریان زیاد ناکات، هەر لەو خەڵکەی کە لە دەوریاندایە ماونەتەوە، ئەمە یاسایەکی نەگۆڕی خوای بەرزو پیرۆزمانە هەتا ئەوان بەوشێوە بن دڵنیابن هەر وا دەمێننەوە، بەڵکو بچووکتریش دەبنەوە لەوانەیە سوننەتی "ئیستبدالیان" بەسەردا بێت، هۆکارەکەی ئەوەیە کە گۆڕانکارییان پێ ناکرێت و پێویستتان بەوەیە کە لەگەڵ یەک ڕێک بکەون. بە دڵنیاییەوە نابنە یەک، بەس بەرەیەکی ئیسلامی پێک بێنن، بۆ ئەوەی ڕەچاوی ئاکارو ئەدەبیات و شێوەکاری ئیسلامی بکەن دووربن لە بیرو بۆچوونی تر کە نامۆ و نەشیاوە بە بەرنامەی ئێوە کە ئیسلامەکەیە، هۆکاری فەشەلیشیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پارچەپارچییەیان، { وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ }.

کەواتە خاڵی یەکەم یەک بوونیانە، جا (بە لیست بێت یان بە بەرە) یاخود بە هەر ناوێک گرنگە ئەوەیە ڕەچاو بکرێت، ئەمە هەنگاوی یەکەمە بۆ سەرکەوتنیان، ئەگەر ئەمە نەکەن بەدڵنیاییەوە زۆر لەوە بچووکتر دەبنەوە کە ئێستا هەن.

ئەگەر سەیری هەموو مێژووە ئیسلامییەکان بکەین بۆ پرۆژەی چاکسازی گەلان، دەبێت دیدێکی ڕوون هەبێت تا خاوەنی ئەم پرۆژە چاکسازییەی یوسف عَلَيهِالسَّلَامُ بن بۆ کۆمەڵگە کەوا لە بارو ڕەوشێکەوە بیبەن بۆ ناو ڕەوشێکی تر و ئەوەی کە هەیە بەرەو باشتری ببەن. ئێوە بۆخۆتان ئەو دید ڕوونییەتان هەیە، بەڵام وەک پێویست کاری لەسەر ناکەن پشتگوێتان خستوە و بە شتی لاوەکی و ناوەوە خەریکن وەکو (ئەشعەری، سۆفی سەلەفی، موعتەزیلە و خەورایج...هتد).

چۆن؟

بە ئامانج گەیاندنی کۆمەڵگە و سەرخستنی پرۆژەی چاکسازی بە کۆمەڵە ئاکارێکی دەستووری ڕەوشتی دەکرێت!

دەستووری ڕەوشت: واتا ئەو دید ڕوونی و ئاشکراییە کە کۆمەڵگەکەی لەسەر پەروەردە دەکەیت وەک پلان داتناوە، تا بەرهەمەکەی کۆبکەیتەوە، لە مەیداندا پێیدەوترێت پەروەردەی سلوکی کۆمەڵگە، هەرچی پرۆژەی چاکسازییە کە ماونەتەوە لە ناو گەل و هۆزەکانی تری دونیادا و بۆتە خاوەنی شارستانییەت تەنها لە ڕێگای ئاکارە ڕەوشتییەکان بووە، ئەگەر دەوڵەتێک ڕەوشت و ئاکاری نەما بێت شارستانەیەت و دەسەڵاتەکەیشی لەگەڵ ڕەوشەتەکەیدا نەماوەو ڕووخاوە.

بۆ هەنگاوهەڵهێنانەوە و کارکردن لەسەر ئەو پرۆژەیە تا بتوانین بینای کاری خۆمان بونیاد بنێین، دڵنیام سەرکەوتوو دەبین ئەگەر دەستی پێوە بگرین. هاتنە خوارەوەی سورەتی یوسف هەروا بۆ ئەوە نییە کە خەڵک بیکاتە فیلم و زنجیرە دراما و یاخود چیرۆک و ڕۆمان، نا؛ بەڵکو بۆ ئەوەیە کە پەندو ئامۆژگاری لێوەربگرین و لاسایی بکەینەوە چونکە قورئان دەستورە بۆ ئەم ژیانەمان تا ڕۆژی قیامەت، کەواتە بۆ ئەم سەردەمە تەواو گونجاوە و ئەوەی خۆی لێ لا بدات زەرەرمەندی دونیا و قیامەتیشە.

بۆ ئەوەی پەنجە بخەینە سەر سوننەتەکان و یاساکانی خوای گەورەی لێوە فێربین کە چۆن بزووتنەوەی گۆڕانکاری لە ناو کۆمەڵگەدا کراوە و ڕابوونی کۆمەڵگە سەریهەڵداوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ١١١﴾ يُوسُف

واتە: بەڕاستی لە سەرگوزەشتەو بەسەرهاتی پێغەمبەراندا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیرو هۆشمەند، وەنەبێ قسەو باسی هەڵبەستراو بێ، بەڵکو لەلایەن کتێبە پێشووەکانەوە (وەکو تەورات و ئینجیل) پەسەندکراوە، ڕوونکردنەوەی هەموو شتێکی تیا دیاریکراوە، هیدایەت و ڕێنموویی و ڕەحمەتە بۆ کەسانێ کە باوەڕ دەهێنن ﴿١١١﴾.

## وێنایەکی گشتی لەسەر پرۆژە چاکسازییەکەی پێغەمبەر یوسف - عَلَيهِ السَّلَام

داڕشتنی پلان و کۆکردنەوەی توانای یوسف بۆ ئەوە بوو کە بتوانیت خەڵکی لە برسێتی ڕزگار بکات و لەو ناهەمواری و بێکارییە دووریان بخاتەوە.

هەموو ئەو کۆمەڵگەیە و تەنانەت کۆمەڵگەکانی تریش سوودیان لە پرۆژە چاکسازییەکەی وەرگرت، کەواتە ژیانی ئەو پێغەمبەرە ئاماژەیە بۆ واقعێک کە چۆن پلانی چاکسازی تێدا داڕشتوە، پاشان بۆ ئەوەی هەموو لاکان بزانن ئیسلام لەسەر گریمان و قسەی ناو مەجلیس دانامەزرێت و لەسەر بنەمای تێکەڵکردنی دیدو ئەفکاری تر بەرهەم نایەت، بەڵکو- گرنگی زۆر ئەدات بە کاری مەیدانی و هەموو ئەو ئوسلوبانەی کە بە درێژایی مێژوو گیراونەتە بەر و قووڵ بوونەوە لە شێوەی کارکردندا، ئەگەر لە لایەنی ئابووری بێت یاخود سیاسی یان هەر سیستەمێکی تری کۆمەڵگە، ئێستاش هەموو دونیا بە دوای ئەوەدا دەگەڕێت، وڵاتی بەهێز دەکات و لە ژێرخان و سەرخانیدا کە خەڵکەکەی برسی نەبێت و بێکار نەبن، گەلی ئێمەش هەر ئەوەی دەوێت، هەڵبەت بە مانا بەرفراوانەکەی مەبەست پێ سیستەمە کۆمەڵایەتییەکانە.

بۆ نموونە دەقێکی قورئانی پیرۆز خەونی پادشایەک دەگێڕێتەوە: کە لە بنەڕەتدا هیچ خەونێک بێجگە خەونی پێغەمبەران - سەلامی خوایان لێبێت- ئەحکامی لەسەر دانامەزرێت، بەڵام یوسف عَلَيهِ السَّلَام لەبەرئەوەی خاوەنی پرۆژەو دانایی و ژیریە سەرباری هەمووی وەحییە ئەم خەونە دەکاتە ڕەوشی واقع و وادەکات کاری لەسەر بکرێت.

ئێستا زۆربەی جیهانی ئیسلامی لە خەوندا دەژین و تاکەکانیان وا ڕادەهێنن کە هەمیشە خەواڵوو بن، وەک ئەوەی لەڕابردوودا بینیمان.

﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ إِنِّىٓ أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ ۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ أَفْتُونِى فِى رُءْيَٰىَ إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ ﴿٤٣﴾﴾ يُوسُف

واتە: (ڕۆژێک پاشا خەوێکی سەیری بینی و بوو بە مەراقی لە کۆبوونەوەیەکدا) وتی: من (لە خەونمدا) بینیم کە حەوت مانگای قەڵەو لەلایەن حەوت مانگای لەڕو لاوازەوە خوران،

حەوت گوڵە (گەنمی) سەوزو جوانم بینی هەروەها حەوتی تریش کە وشک بوون، ئەی خەڵکینە ئەم خەوەم بۆ لێک بدەنەوە ئەگەر لێکدانەوەی خەو دەزانن.

ئێمە بۆ خۆمان بە هێزو توانایین بە گشتی، بەڵام چی وای لێکردوین کە لەڕو لاوازەکان ئێمە قووت بدەن، هۆکاری ئەو میکانیزمەیە کە ئیسلامی نییە، کەچی ئیسلامیەکان کار لەسەر ئەو پرۆسەیە دەکەن، ئەو خەڵکەی تریش نوێژ و شەونوێژ دەکات و ڕۆژوو دەگرێت و ئیسلامی خۆش دەوێت، کەچی دەنگ نادەن بە ئیسلامییەکان، دەنگ دەدەن بە عەلمانییەکان.

کارە مەیدانییەکەی یوسف - عَلَيْهِ السَّلَامُ - و لێکدانەوەی خەونەکە و دانانی پلانی چاکسازی

﴿قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ﴿٤٧﴾﴾ يُوسُفَ.

واتە: یوسف فەرمووی: حەوت ساڵی بەردەوام کشتوکاڵ دەکەن و دانەوێڵە دەچێنن، ئەوەی کە دروێنەتان کردو (لێتان زیاد بوو) بە گوڵەکەیەوە بیهێڵنەوە، مەگەر ئەو کەمەی کە دەیخۆن (دانەوێڵە بە گوڵەکەیەوە هەڵدەگیرێت لە کرم و ئەسپێ و زایەبوون بەدوور دەبێت).

پلانێکی کردەیی و مەیدانی داڕشت کە هەموو گەل و هۆزی ئەو وڵاتەی گرتەوە و بەشداری پێکردن لە ناو پلانەکدا، پلانەکە لەسەر پایەی گەل دامەزراو گرنگی دا بە خەڵک و هەموو تواناکانی گەلی تێدا بە بەرنامە خستەگەڕ و توانی کاتێکیش دەست نیشان بکات واتا زەمەنی دانا، هەموو توانای تاکی تێدا کۆکردەوە لەو عیبارەتەی بەکار هاتووە لە چاندندا..{تَزْرَعُونَ}، پلانەکە دیارە ئەویش بەهێز کردنی بەرهەمی زۆر و کەمی بەکارهێنان؛ چونکە هەموو کاتێک کە تەنگەژە ڕوودەکاتە هەر جێگایەک، پێویستی بە ڕەوشتێکی جیاوازە بۆ پیادەکردنی ئاکارێک کە کۆمەڵگەی لەسەر بینا بکرێت، چونکە ئاکاری خەڵکی لە کاتی ژیانی سادەیاندا جیاوازە لەگەڵ ئاکاری گەلێک کە تووشی گەندەڵی و لەمپەرو تەنگەژە دەبنەوە وەک کاتەکانی تریان ئاسایی نییە.

ئەو سوودانەی وەردەگیرێن بۆ پرۆژەی کارکردنمان لە پلان دانان

هیچ چاکسازییەک ناکرێت بێ ڕەوشت بەرزی؛ یوسف - عَلَيْهِ السَّلَامُ - بە ڕاڤەکردنی خەونەکەی پادشا هەندێک هێڵی سەرەکی کێشا و ستراتیژییەکی بێ وێنەی دەست نیشان کرد، چاودێری بۆ داهاتوو دانا، پاشان چۆنیەتی ئامانجی دیاری کرد بۆ سەرکەوتنی پلانەکەی و هەموو ئەم کارانەی کردە سێ قۆناغ کە بریتین لە:

قۆناغی یەکەم: حەوت ساڵ بەردەوام خەریکی چاندن و کۆکردنەوەی بەروبووم دەبن

ئەم قۆناغە لە کاری ئیسلامیاندا بەس کۆکردنەوەو پێگەیاندن و پەروەردەیە، واتا یوسف - عَلَيْهِ السَّلَامُ - بەرهەم و پاشەکەوتی بەلاوە گرنگ بوو ، لەگەڵ بەکارهێنانی کەمی بەروبووم.. {إِلاَّ قَلِيلاً مِمَّا تَأْكُلُونَ}

بە بۆچوونی من لە ئێستادا، کاری ئیسلامی بۆ قۆناغی یەکەم پێویستیان بەو کاتە ئیعدادەیە (ئامادەسازییە) کە خۆیان کۆبکەنەوە لەسەر بنەمای ئیعدادی ئیسلامی و بەرەیەکی یەکگرتوو دوور لە تێکەڵکردنی میکانیزمی عەلمانی وەک ئەزموونی میصر بەرەی ئیخوان و سەلەفییەکان، واتا لە هەر جێگایەک یەکگرتن ڕوویدا ئەوا سەرکەوتن و تەمکین بە دەست دێت، جاریَ بەلای کەمەوە هەموو لاکان حەوت ساڵیان پێویستە، ئەگەر بیانەوێت کاریگەری دروست بکەن لە ناو موسڵمانانەدا بەگشتی.

قۆناغی دووەم: دوای ئەو حاڵەتە حەوت ساڵی نارەحەتی دەستپێدکات "سبع شداد"

لەدوای ئەوەی ساڵی بەرهەم کە حەوت ساڵەکەیە کۆتایی هات و بەردەوام ئەم حەوت ساڵە خەریکی چاندن و دروێنە بوون، ئیتر کاتی بەکارهێنانیەتی بەڵام بە سنوورداری، کە ئەمە بۆ خۆی پلانی کارکردنەکەو دەستنیشانی جۆری کارە گەورەکەی یوسفی نیشاندا لە ناو کۆمەڵگەکەدا، نەک جوانی و سەرنج ڕاکێشانی لە سیمایدا، چونکە جوانی و سیما خەڵکی کەم ئەقڵ تەماشای دەکات، بەڵکو ئەوەی کە گرنگە بەلای خەڵکەوە کارکردنی مەیدانییە کە دەتوانێت بەرهەمی ساڵانی دوای خۆی بەرهەم بهێنێت کە ناسراوە بە وشکە ساڵی.

بە عیبارەتێکی تر بڵێین بۆ ئێوەی ئیسلامییەکان لەدوای قۆناغی یەکەم کە قۆناغی پلان و دروستکردنی نوخبەیە لەسەر ڕەوشت و ئاکاری بەرزی ئیسلامی، قۆناغی دووەم جێبەجێکردنی داوای خەڵکییە لە ڕووی پێداویستییەکانیەوە -نەک- بەوەی مووچەیان بۆ بڕیتەوە، بەڵکو زەمینەکەت سازاندوە بە سیستەمێک کە ئیسلام دەیەوێت، خەڵک ئاراستە دەکەین، شێوەی پێداویستییەکانیان دەخەینە بەرچاو دەڵێین کار بۆ ئەمانە دەکەین و خاوەنی ئەو پرۆژەیەین، کە سەرەتای هەموو پرۆژەیەکی چاکسازی ناو گەلان نان و ئەمانە.

دوای ئەم قۆناغە ئیتر قۆناغی ڕاوەدونانەو زیندانەکان پەردەکەن لە خەڵکی موسڵمان و چاویان پیاماندا هەڵنایە، دەبێ ئەو کارە ئەنجام بدەین کە لەدوای هەر ئەندامێکی کاراو چالاک یاخود کادیرێکی وەسەت، دەبێت ئەو زەمەنەی کە باسمان کرد ئەگەر ئەوانە جێگایان چۆڵ کراو دەستگیر یاخود کوژران، پێویستە جێگایان خاڵی نەبێت کەلێنەکان پڕبکرێنەوە بە زووترین کات، چونکە لەناو ئیسلامییەکانی ئێستادا ئەگەر یەک ئەندامی سەرکردایەتی یاخود کادێرێکی وەست نەمێنێت، دەست بەجێ بە ئیسلامییەکانەوە دیارە و بە درەنگ جێگا خاڵیەکەی پڕ دەبێتەوە.

قۆناغی سێیەم: بەدەمەوە چوونی خەڵکییە لەداواکانیان و هاوکاری کردنیانە، ساڵی بەهاناوە چوونە "عام یغاث"

ئەگەر تەماشای کارەکانی یوسف- عَلَيْهِ السَّلَامُ - بکەین هەست بە ڕێخستنێکی زۆر وریایانە و دەقیق دەکەین، چونکە بۆ ساڵانی نارەحەتی زەخیرەی هەڵگرتبوو خەزێنەکانی پڕ بوون لە گوڵەگەنم، زۆر بە دید ڕوونی کاری کرد دەیفەرموو: ﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِمَّا تُحْصِنُونَ﴿٤٨﴾﴾ يُوسُفَ.

واتە: لە دوای ئەوە حەوت ساڵ دێت کە سەخت و بێبارانی و وشکە ساڵی ئەبێت، ئەوەی کە هەڵتان گرتووە ئەوە ئەخۆن تەنها کەمێک نەبێ کە هەڵی ئەگرن.

کەواتە خومرەکەی و تۆوەکەی هەڵگرتبوو بۆ وشکە ساڵییەکە، تا بتوانیت گەلەکەی پێ ڕزگار بکات، واتا بەکار هێنانەوەی هەڵگیراو و پاشەکەوت کراو.

مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە و دەبێت موسڵمانان و ئومەتی ئیسلامی بە گشتی لەم هاوکێشە قورئانییە تێبگەن، ئەگەر بەدەم داواکانی خەڵکەوە چوویت خەڵکی خۆی دەنگت ئەداتێ و هەڵتدەگرن ئەتخەنە سەر قەڵادۆشکانیان و بەدواتەوە چەپڵە لێ ئەدەن، چونکە تۆ ئالآی نان و ئەمان و کەرامەتی ئەوانت هەڵگرتوە و مافەکانت بۆ دەستەبەر کردوون، هەموو خەڵک ناوی ئیسلامییەکانیان لەسەر دەم دەبێت هەوەک چۆن یوسف لە ناودڵ و دەمی خەڵکیدا باس دەکراو خوای گەورە کردیە خێرو بەرەکەت ئاراستەی دەکردن، خۆ ئاراستەکەی خوای موتەعال بەردەوامە کێشەکە لەوەدایە بە گوێرەی پێویست بە دەمیەوە ناچین.

شیکارییەک لە سەر پرۆژەکەی یوسف- عَلَيْهِ السَّلَامُ - دەست نیشان کردنی ڕەهەندەکان تێیدا و بە پارسەنگ ڕاگرتنیان لە کارکردندا

یوسف- عَلَيْهِ السَّلَامُ - پارسنگی ڕاگرتبوو لە نێوان سێ ڕەهەند و پلانەکەی

ڕەهەندی یەکەم: (لایەنی) بەرهەم هێنان

ڕەهەندی دووەم: (لایەنی) بەکارهێنان

ڕەهەندی سێیەم: (لایەنی) پاشکەوت و بەکارهێنانی سەرمایەی تۆوەکە بۆ دیسان بەرهەم هێنان

لێرەدا ئەگەر تەماشای پلانەکەی یوسف- عَلَيْهِ السَّلَامُ - بکەین کە بۆ ڕاڤەی خەونەکەی پادشا دای دەنێت بەکار هێنان و بەگەڕخستنی وزەکانە لە کارو باری ئیداریدا، لە بواری ئیدارەدا پێنج بنەمای سەرەکی هەن کە یوسف هەموویانی کۆکردبوەوە تێیدا.

"پلاندانان ، ڕێکخستن، بەگەڕخستنی وزە، ئاراستە، چاودێری"

هەموو پێکاتەی ئیدارەیەک دەبێت لەم پێنج بنەمایە پێک بێت، ئەگەر وانەبوو ئەوا ئیدارەیەکی چالاک نییە، بەڵکو تووشی ئیفلیجی بووە.

لە ڕاستیدا هەموو پلانێک لەسەربنەمای هاوکاری و پشتیوانی و بوونیەتی باش دادەمەزرێت، هۆکاری زیاتر نەخشە بۆ کێشان و فیکرو تەفکیرە و دەستنیشانکردنی ئامانج و ستراتیژییە، بەڵام بونیەتی باش یاخود (عونسوری) باش بریتییە لە: سیاسەت، پێداویستی و کەرەستە، سەرچاوەی دارایی، سەرچاوەی مرۆیی، لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی کات و بەرنامەی کارکردن، پارسەنگی و هەڵسەنگاندن، دوای ئەوە ئیتر یوسف - عَلَيْهِ السَّلَامُ - داوای کرد کە بەشدار بێت لە حوکمەتەکەداو بەزمانی ئەمڕۆ حوکمەتێکی بنکە فراوان و یاخود ئیتلافی پێکهێنا، لە زیندانەوە داوای کاری کرد لەسەر بنەمای پلانەکەی فەرمووی: ﴿قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾﴾ يُوسُفَ.

واتە: یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ وتی: بمکە بە سەرپەرشتیاری خەزێنەکانی زەوی میصر لەوەی کە خواردن و سەروەت و سامانی تیایە، بۆ ئەوەی دادپەروەری بڵاو بکاتەوەو زوڵم و ستەم نەهێڵێ و خەڵکەکە بانگ بکات بۆ عیبادەتی خوای گەورە، بەدڵنیایی من زۆر پارێزەرم و هەمووی ئەپارێزم، زۆر زانام لەم بوارەدا.

چونکە پلانەکەی مەحکەم بوو توانی چاکسازی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری، پەروەردەی، ڕاگەیاندن و کشتوکاڵی بوو، لەگەڵ ئەو هەموو توانا گرنگەی لە چاودێری و پلانە ستراتیژییەکەی بوو دەیزانی داوای چی دەکات و لە بازنەیەکی بەتاڵدا نەسوڕایەوە، کاریگەی دانا لەسەر چواردەور نەک چواردەوری کاریگەری لەسەری بێت! ئامانجی زیاد کردنی بەرهەم بوو لە هەموو ڕووەکانی کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێداوە. ئەوەی کە یوسف کردی لەسەربنەمای زانستی ئیدارەی سەردەم بوو کە هەموو دەوڵەتێک لە وڵاتە پێشکەوتوەکانی دنیا پیادەی دەکەن لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات.

مەشخەڵی دەستی ئەو بۆ پلانە سیاسی و ئابوورییە کە سەرکەتوو بوو لەسەر بنەمای زانیاری دروست دامەزرا، بۆیە سەرکەوتنی بەدەست هێنا، نەک لەسەر بنەمای سوفستائیەت (وەهم) و شیعر (خەیاڵ) دانەمەزرابوو، بەڵکو بەستیەوە بە واقعەوە و گونجاندی لەگەڵ سەردەمدا،

ئەم گرێبەندە تەنها لە رووی بەرهەم و پاشکەوت نەبوو ، بەڵکو واجیهەبوو کۆمەڵگەی کردە یەکتاپەرست و هەموو توانای خەڵکی خۆی خستە گەڕ بۆ سەرخستنی حکومەتەکەی.

ئەو حەوت ساڵە یوسف – عَلَيْهِ السَّلَامُ – بەخشینی نەبوو بەڵکو وەرگرتن و ئەرک خستنە سەر شان بوو، ئینجا لە گەڵ ئەوەدا هیوا بەخشین و بەرچاوڕوونی بوو، هەر پلانێک هیوای نەدا بە خەڵکی سەرکەوتوو نابێت، خوای گەورە بۆمان باس دەکات لەسەر زمانی یوسف – عَلَيْهِ السَّلَامُ – دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾ يُوسُف

واتە: دوای ئەوە ساڵێک دێت ژیان خۆش ئەبێت و باران دەبارێت و ئاوی نیل دێت، ترێ و ئەوانە ئەگوشن و هەڵیئەگرن، یاخود ئاژەڵەکانتان شیریان زۆر دەبێت و دەیاندۆشن.

پێویستە بۆ هەر نەخشەو پلانێک هیوابەخشینی تێدا بێت، چونکە هیوا مرۆڤ وا لێدەکات کار بکات، نەک هەر کۆمەڵێک لەسەر شانۆکە دیار بن نەهێڵن کەسی تر دەور ببینێت، دەبێت خەڵکی بەگشتی بوونی خۆی لەم ژیانەدا بناسێنێت، تواناکانی بەگەڕ بخریت، هەروەک یوسف – عَلَيْهِ السَّلَامُ – بە ئاگاییەوە کاری کرد، سەردەمی حەوت ساڵی یەکەم بەس بە ناڕەحەتی و ناهەمواری خەڵکی خۆی پەروەردە کرد، دوایی بزووتنەوەکەی وا بار هێنا کە کردنەوەی دەرگا و پەنجەرەکان و هیواکان بوو بەگشتی.

کۆبەندی وتەکان لەسەر ئەم دەرئەنجامە:

یوسف پێغەمبەر– عَلَيْهِ السَّلَامُ – گرنگی دابوو بە توخمی مرۆڤ تێکەڵکردنی لە هەموو کارێکدا، هیچ کارێک ئەنجام نادرێت ئەگەر جێبەجێکارەکانی مرۆڤ نەبن، لەوانەیە پرسیار بکرێت بڵێن ئەی هەموو جێبەجێکارییەک هەر مرۆڤ نییە لە جێبەجێکردندا ئەم بڕگە زیادە چییە نوسیوتانە مرۆڤ توخمی کارکردن بووە لەگەڵ یوسف؟

بێگومان دەڵێین بەڵێ، منیش دەمەوێت ئەوەتان پیبڵێم، کە ماددەم مامەڵە لەگەڵ مرۆڤ دەکەیت بە سرووشتی خۆی ئەگەر مەنهەجێکی نەبێت ئەوا بۆ خۆی گەندەڵ دەبێت، ئەو مەنهەجەی کە یوسف داینا لەسەر سێ بنەمای سەرەکی بوو..

بنەمای یەکەم: گەڕانەوەی بۆ لای یوسف و لە ڕووی سیاسەتی گشتییەوە بۆ ئەوەی بتوانێت کۆنترۆڵی تەواوی ڕەوشەکە بکات و فرە کوێخا دروست نەبێت، واتا مەرجەع دەست نیشان کرا کە وەحدەتی فیکری و عەقیدەتی و سیاسی ببێت، بۆ ئەوەی پڕۆژە چاکسازییەکەی بچێتە پێش، ئەگەر وردبینەوە لەسەرەتای زیندانەکەیەوە ئەم خاڵەی پیادە کردبوو.. فەرمووی: ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجْنِ ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ۝ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ

أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴿٤٠﴾ يُوسُف

پاشان یوسف ڕووی کردە ئەو دوو گەنجەو بانگی کردن بۆ یەکخواپەرستی و فەرمووی: ئەی هەردوو هاوەڵەکەی بەندیخانەم ئایا کۆمەڵێک پەروەردگاری لێک جیاواز باشترە کە ئێوە ئەیانپەرستن یاخود تەنها خوایەک کە الله یەو تاک و تەنهاو باڵادەست و بەتوانایە ﴿٣٩﴾ ئێوە هیچ شتێک ناپەرستن لە غەیری خوای گەورە تەنها کۆمەڵێک ناو نەبێت کە ئێوە خۆتان و باوک و باپیرانتان ناوتان ناوە، خوای گەورە هیچ بەڵگەی لەسەر ئەو ناوانەو پەرستنی ئەو شتانە نەناردۆتە خوارەوە، حوکم و بڕیاردان تەنها بۆ خوای گەورەیە، خوای گەورە فەرمانی کردووە کە هیچ کەسێک نەپەرستن تەنها خوای گەورە نەبێ بەتاک و تەنهاو شەریکی بۆ دانەنێن، ئا ئەمە ئایینی ڕاست و دامەزراوە کە خوای گەورە بەڵگەی لەسەر ناردۆتە خوارەوەو فەرمانی پێکردووە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم شتە نازانن﴿٤٠﴾

بنەمای دووەم: ئەو بەرنامەیە بوو کە ئەوەی خاوەنی توانا شایستەی کارەکەی پێبسپێرێت و تواناکان لە جێگای خۆیدا بە کاربهێنرێت، ئەمەش بنەمای گەوەری ڕەوشت و کارکردنە لەهەموو بوارەکاندا، خۆی فەرمووی بە پادشای میسر: ﴿قَالَ ٱجْعَلْنِى عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِ ۖ إِنِّى حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴿٥٥﴾﴾ يُوسُف

واتە: (یوسف) وتی: (حەزدەکەم) بمکەیت بە لێپرسراوی سامانی سەرزەوی (ئەم وڵاتە) (چونکە من لەخۆم ڕادەبینم) کە شت بپارێزم و زاناشم کە چۆن دەیپارێزم ، دیارە کە ویستویەتی لە ڕێگەی دادپەروەریی و گرنگیدان بە ڕزق و ڕۆزیی جێگەی خۆی بکاتەوە لەدڵی ئەو خەڵکەدا تا بانگیان بکات بۆ خواناسی و سەرفەرازیی هەردوو جیهان.

چونکە کە دەڵێت " إني حفيظ أمين" ئەمە لەخۆوە نەوتراوە بەڵکو بە ئاکاریکی گشتی ڕەوشتی پابەندەوە، لە هەمان کات پەروەردەی پەروەردگاریەتی لەو ڕێگایەوە دەیەوێت پرۆژە چاکسازییەکەی بەرەو پێش بەرێت، ئەستەمە بێ ڕەوشت هیچ بکرێت، ئەم ئوممەتە دەتوانێت لە ڕێگای زاناکانیەوە بینا و بونیادی ڕەوشتی ئەوخەڵکە بکەن کەی عەمەلانی خاوەنی ڕەوشت بووە، واتای چاکە و خراپە.

بنەمای سێیەم و کۆتایی: لە وتەکەیدا دەردەکەوێت کە دەفەرموێت (عَلِيمٌ) واتا ئاگادار بوون بە هونەری ئیدارەو ئەو پلانەی گرتبویە بەر و چۆنیەتی سەرکەوتنی، کۆی گشتی باسەکە لە زانستدا خۆی دەبینێتەوە.

بەم شێوەیە مەنهەجی یوسف - عَلَيْهِ السَّلَامُ - لەوپەڕی جوانی و مرۆییدا خۆی بینییەوە، بووە هۆکاری دروست کردنی شارستانیەت و بنەماکانی دامەزراندنی دەوڵەت و جوڵێنەری ڕابونی کۆمەڵگە و هەموو ئەوانەش کە جێبەجێکار بوون لە بەرنامەکەیدا، دروشمی پرۆژەکەی وەحدەت بوو لە ناو ئەو کۆمەڵگەیەدا، بیروباوەڕێکی کۆبەندو ڕۆشنبیرییەکی باشی پێشکەشی ئەو خەڵکە کرد، فێری حەقیقەتی ئیمان بەخوای کردن، پێی وتن ئەم گەردوون و ژیانە چییە، پاشان هەموویان پڕ چەکی ڕەوشتی جوان و سازگار کرد، لەگەڵ ئەوانەشدا زانستی فێرکردن کە چۆن بە ئیدارەیەکی پێشکەوتوو و سەربەرزانە بتوانن کەرامەتی خۆیان بپارێزن و پاشان بتوانن قیادەی خەڵکانی تریش بکەن.

ئەگەر خەڵکی خاوەن ڕەوشت و دەست پاک نەبوو، باشەی گۆڕانکاری لە ناو دەچێت، ئەو دەستکەوتی گۆڕانکارییە نەپارێزێت، کەسی گۆڕانخواز هەڵگری ئاکارێکی بەرزی دەروونی و پاشان دەیخاتە دەرەوەی ڕووکەشی کاری پێدەکات تا گۆڕانکاری لە دەرەوەی خۆشیدا بکات، بە دڵسۆزی و بە ڕاستگۆیی و بە پاراستنی ئەمانەت.

گۆڕانکاری پێویست دەکات ئەو خەڵکانەی پیادەی دەکەن کۆمەڵگە لە خراپەوە بەرەو باشیان بەرێت، پاشان دەبێتە لاشەیەک لە ناو گۆڕانخوازان تا لە ڕووی دەروونییەوە گۆڕانکاری ئەنجام ئەدەن لە ناوخۆی خۆیان و دەرەوەی خۆشیاندا؛ چونکە باروگوزەرانی خەڵکی کە گەندەڵی تێکەوت لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و...هتد، ناگۆڕێت تاکو مرۆڤەکان خۆیان چاک نەکەن، تاکو وایان لێدێت ڕێگەیان نیشان ئەدەی کام ڕێگا ڕاستەو کامە چەوتە.

ئەیسەپێنیت بەسەریدا کە ئیتر ئەمە خراپەکارییە، نابێت وتەیەک دووبارە بکرێتەوە خەڵکی بێعار بن لە ئاستی وشەکەدا کاریگەری وشەی گەندەڵ لەسەر خەڵکی نەمێنێت بە بچووک وەربیگرێت، ئەگەر بڵێیت گەندەڵی بڵێ جا چییە! خۆ هەموو خەڵکی ئەمڕۆ گەندەڵە، ئەمەش لۆژیکی قورئان و ژیانە؛ کە خەڵکی لەسەر سیستەمێک پەروەردە دەکات کە مرۆڤ پەروەردەکاری ئەو سیستەمە دەبێت و خۆیان لەسەر ئەو تێزو چەمکانە بینا و بونیاد دەنێن.

کەواتە پێویستە ئەم سیستەمی کە چاکسازی تێدا دەکەیت بایی ئەوە مرۆڤت هەبێت کە بتوانیت بیانخەیتە ناو ئەم سیستەمە کە دەتەوێت چاکسازی تێدا بکەیت، تۆ کە توانای دامەزراندن و توانای ئەوەت نییە خەڵکی شیاو بخەیتە جێگای شیاو بۆ پۆست و مەقام و ئیمتیازی حیزبی و ناو نەبێت ئیتر چۆن چاکسازی دەکەیت؟ یان خەڵکەکەت بەکەڵک نایەت یان سیستەمەکە ئەوەندەی تر گەندەڵ دەکەیت، چونکە بۆ خۆی مرۆڤ هەموو کارەکان بەڕێوە دەبات با خەڵکی دیندارت هەبێت، بەڵام جێگا ئیداریەکانت بۆ پڕ نەبێتەوە، چاکسازی هیچ مانایەکی نییە، بەچی دەچێت تۆش هەر بۆ ئەوەی دەسەڵاتت هەبێت خەڵکی تر بخەیتە ئەو جێگاو پۆستانەی کە گرنگ و قووت و نانی خەڵکیان لەبەر دەستدایە یاخود پۆستی سیادین،

چونکە خۆویستی و لە خۆڕازی بوون حەز بە خۆ دەرخستن و خۆشەویستی دەسەڵات ئەمانە لە ناو ناخی هەموو کەسێکدا هەیە، پێویستی بە ڕێکخستن هەیە لە ناو ناخی مرۆڤدا بە ناسینی خوا و خۆشەویستی پەروەردگار بتوانرێت ڕێک بخرێت.

هەر لە سورەتی یوسفدا ئاماژە بەوە کراوە کە چەند ڕەهەندێک هاوکار بوون بۆ سەرخستنی پرۆژەکەی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ پاشان دوو توخمیش هۆکاری سەرەکی سەرکەوتنی بوون پلان و مرۆڤ. کەواتە دەبێت بزانین پلانەکەی چی بووە بۆ سەرکەوتن.

أ- ئامادە باشی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ بۆ سەرپەرشتی پلانەکەی کە دایڕشتوە لە خۆی ڕادەبینی، ئیرادەی بەهێز بوو کە توانای هەیە لەگەڵ پلاندانەرو جێبەجێکاراکاندا بکەوێتە ڕێ و کارەکە ئەنجام بدەن، لە نێوانی ژمارەو ڕەوشت ڕێکەوتن واتا (دەست پاکی و نێوانی ماددەو ئیمانی بۆڕێکخستن، ئایین و ژینی بۆ کردن بەیەک، ئاکارێکی ڕۆحی لە ناو کۆمەڵگەکەدا دروستکرد بە پرۆژە گەورەکەی کە چاکسازی ئابووری بوو)

لەڕاستیدا دەبێت ئومەتی ئیسلامی باش ئەوە بزانن کە چاکسازی ڕەوشتی زۆر گەورەترە لە چاکسازی سیاسی و لە ناو دەسەڵات، چونکە کێشەکەتان لەگەڵ ڕەوشتی خەڵکیدا تووش دەبێتەوە، بۆیە پێویستە خەڵکی ئاراستە بکرێت و خۆشمان ئاراستە بکرێینەوە بە ئاکاری بەرزی ئیسلام تا کۆمەڵگەیەکی پارسەنگی ئەخلاقی دەربچێت، ئەو دەمە هەموو چاکسازییەکانی تر ئاستەم نابێت وەک ئاو لە سوراحی بۆ ناو پەرداخ چەند ئاسانە ئاوا چاکسازی بەدەست گۆڕانخوازنەوە دێت. ئەمەش خۆی پێویستی بە پلانە، بۆ نموونە دەبێت پرۆژەی چاکسازی سەرەتاکەی بە قورئان و سوننەت بێت؛ بۆ ئەوەی لە ڕەوشتی و ناخ و ڕۆح و پەروەردەی ئیسلامییەوە سەرچاوە بگرێت. دەبێت بتوانرێت بڕواتە ناو هەموو چین و توێژەکانی ناوکۆمەڵگە هەر لە ئەندازیارو ئیدارییەکان و ئابووریناس و ڕاگەیاندنکارو سیاسییەکان...هتد.

ب- لایەنی دووەمی پلانەکەی داواکاری بوو لە یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ چونکە توانای هەبوو وەک ئێستا دەڵێت پسپۆڕ بوو، ئینجا خۆی ئیختیاری دەکرد کێی لەگەڵدا بێت، بۆ ئەوەی زۆر بە ئارام و هێمنی بتوانن پلانەکە جێبەجێ بکەن.

سەرمایەی ڕەوشتی و ئاکاری بەرزی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ خۆی بوو بۆ بەرەو پێشچوونی پرۆژە چاکسازییەکەی، چونکە خۆی خاوەنی هەموو ئاکارە بەرزەکان بوو ڕەنگدانەوەی هەبوو لە ژیان و لە هەڵسوکەتیدا، کەواتە لایەنی دووەم چاو لەو بکرێت سەرکەوتوو دەبین.

ڕەوشتی یەکەم : بڕوا بوون بە تواناو هێزی خۆی و گەڕانەوە بۆ لای خوا و هەمیشە خوای لەبیر بووە، ﴿قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ﴾ يُوسُف.

واتە: (یوسف) وتی: (حەزدەکەم) بمکەیت بە لێپرسراوی سامانی سەرزەوی (ئەم وڵاتە) (چونکە من لەخۆم ڕادەبینم) کە شت بپارێزم و زاناشم کە چۆن دەیپارێزم ، دیارە کە ویستویەتی لە ڕێگەی دادپەروەریی و گرنگیدان بە ڕزق و ڕۆزیی جێگەی خۆی بکاتەوە لەدڵی ئەو خەڵکەدا تا بانگیان بکات بۆ خواناسی و سەرفەرازیی هەردوو جیهان.

ڕەوشتی دووەم: سەرەتایەکی ناسک و کۆتاییەکی زبر، پێویستە خەڵکی بە ڕەحمی موسڵمان بزانێت بە تۆڵە سەندنەوەی خوایش ئاشنا بکرێت بۆ ئەوەی ڕەوشتێکی پارسەنگی هەبێت و مرۆڤێکی لاسەنگ دەرنەچێت.

﴿وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ قَالَ ٱئْتُونِى بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ ۚ أَلَا تَرَوْنَ أَنِّىٓ أُوفِى ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٥٩﴾ فَإِن لَّمْ تَأْتُونِى بِهِۦ فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِندِى وَلَا تَقْرَبُونِ ﴿٦٠﴾﴾ يُوسُف

واتە: (ئەویش ڕێزی گرتن و دواندنی و پێی دەرخستن کە برایەکی باوکیان هەیەو نەیانهێناوە لەبەرئەوە) کاتێ بارگەو بنەیانی بۆ پێچانەوە وتی: من حەز دەکەم ئەو برا باوکیشتانم بۆ بێنن، مەگەر نابینن من چۆن کێشانەو پێوانەم تێرو تەواوە و چۆن ڕێز لە (میوان) دەگرم﴿٥٩﴾ ئەگەر (ئەو کوڕم) بۆ نەهێنن، ئەوە ئیتر موعامەلەو کێشانەو پێوانەی ئێوە لای من نییە، هەر نزیکیشم نەکەون و نەیەن بەم ناوەدا﴿٦٠﴾

ڕەوشتی سێیەم: لە کاتی توڕەبووندا یاخود لە کاتی توڕەکردندا بتوانیت خۆت هێمن بکەیتەوە و کارەکانت لێتێک نەدات، ﴿۞ قَالُوٓا۟ إِن يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ ۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِى نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ ۚ قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ۖ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ﴿٧٧﴾﴾ يُوسُف

واتە: (براکانی) وتیان: ئەگەر ئەم دزیی کردبێت، براکەشی کاتی خۆی دزیی کردووە، یوسف ئەو (قسە ناڕەواو تۆمەتە ناقۆڵایەی لە دڵی خۆیدا هێشتەوەو لێی دەرنەکەوت و پێیان نەزانی کە سەغڵەتە)، ئەوسا پێی وتن: بەڕاستیی ئێوە (بەم ڕەفتارەتان) شوێنی خراپ بۆ خۆتان مسۆگەر دەکەن، خوا خۆی لە هەموو کەس زاناترە بەوەی کە دەیڵێن و باسی دەکەن.

ڕەوشتی چوارەم: خۆپاراستن لە شەهوات بەتایبەت لە شەهەوەتی ئافرەت و دنیاو قسەکردن تا بتوانی خۆت ڕابێنیت بۆ قیامەت، ﴿وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ ۖ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ ۚ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ۚ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾﴾ يُوسُف

واتە: ئافرەتەکە ویستی خراپە لەگەڵ یوسفدا بکات ئەگەر بەڵگەی خوای گەورەی نەبینیایە ئەوە یوسفیش بە دڵ دڵی بەلای ئافرەتەکەدا دەچوو، بەڵام بەڵگەی خوای گەورەی بینی، واتە:

بیری کردەوە لە تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە ئەو کاتە ئەسڵەن هیچ هەمم و ختورەیش بەدڵیدا نەهاتووە، ئەگەر هاتبێتیش ئەوەی دڵ بە تاوان نانووسرێ، و زۆر شتی ئیسرائیلیات لە کتێبی تەفسیرەکاندا باسکراوە کە شایان نییە بە یوسف پێغەمبەر، بەم شێوازە بۆ ئەوەی کە خراپەکاری و زینا لە یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ دوور بخەینەوە، بەڕاستی ئەو یەکێک بوو لە بەندە هەڵبژێراو و دڵسۆزو چاک و پاکەکانی خوای گەورە.

ئەگەر بەڵگەی ئیمانی لە دڵ و دەروونی خۆیدا هەست پێ نەکردایەو سزای دۆزەخ نەهاتایەتە بەرچاوی، بەو شێوەیە (بەهۆی ئیمانی دامەزراوەوە) هەرچی گوناهو تاوان و خراپەیە لێی بەدوور دەگرین، بەڕاستی ئەو لە بەندە هەڵبژاردەو پاکەکانی ئێمەیە.

ڕەوشتی پێنجەم: هێزو توانای بیر تیژی بزانرێت کێ کارەکانی ناپوخت بووە کێ کاری جوانی ئەنجام داوە، ﴿وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ۝٥٨﴾ يُوسُفَ

واتە: (ساڵانی گرانی هاتە پێشەوە) براکانی یوسف (هاتن بۆ میسر) چوونە دیوانی، ئەو ئەوانی ناسیەوە، بەڵام ئەوان ئەمیان نەناسییەوە.

ڕەوشتی شەشەم: خۆ ئامادە کردن بۆ وەرگرتنی زانست هەمیشەو خۆشەویستی بۆ زانست گەڕان بەشوێنیدا، ﴿۞ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِۖ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ۝١٠١﴾ يُوسُفَ

واتە: (ئینجا یوسف پێغەمبەر چووە کەنارەوەو دەستەکانی هەڵبڕێ ونزای کردو وتی:) پەروەردگارا تۆ پاشایەتیت پێ بەخشیم و لە لێکدانەوەی خەو شارەزات کردم، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، تۆ پشت و پەناو یارو یاوەری منی لە دنیاو قیامەتدا، داواکارم کە بەموسڵمانی بم مرێنی و بمخەیتە ڕیزی پاکانەوە و بمگەیەنیت بە سەرفەرازان.

ڕەوشتی حەوتەم: بەزەیی هاتنەوە بە سەر ئەو کەسانەی کە خاوەنی تەوحید نین و یەکتاپەرست نین، خۆ بەکەم زان لەئاستی خەڵکیدا بە گشتی فێرکردنیان بۆ خواناسی هەروەک چۆن لە دوو گەنجەکە بانگی یوسفیان - عَلَيْهِ السَّلَامُ - کرد، ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجْنِ ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ۝٣٩﴾ يُوسُفَ.

واتە: ئەوسا ڕووی کردەوە هاوەڵانی بەندیخانە: ئایا (باوەڕمان) بە کۆمەڵێک خوای هەمەجۆرو جیاواز (هەبێت چاکترە یاخود تەنها و بەدەسەڵات و بەتواناو بەهێز هەبێت.

﴿قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ ۚ إِنِّى تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾﴾ يُوسُفَ

واتە: یوسف وتی: (جگە لەوەش) هیچ خواردنێکتان بۆ نایەت و هیچ ڕۆزییەکتان پێ ناگات کە من نەزانم چییەو چۆنە پێش ئەوەی بگاتە لاتان (ئەمەش ئازایەتی خۆم نییە)، بەڵکو ئەو شتانە پەروەردگارم فێری کردووم، (بزانن) کە من بەرنامەی قەومێکم واز لێهێناوە کە باوەڕیان بە خوا نییە، هەروەها بڕوایان بە قیامەتیش نییە.

ڕەوشتی هەشتەم: خاوەنی لێخۆشبووی دڵ گەورەی بەرانبەر بە خەڵکی، ﴿قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ ۖ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ ۖ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾﴾ يُوسُفَ

واتە: (یوسف) وتی: خەمتان نەبێ ئەمڕۆ ئیتر هیچ سەرزەنشتێکتان ناکەم، خوا لێتان خۆش بێ، بێگومان ئەو زاتە لە هەموو میهرەبانان میهرەبانترە.

ڕەوشتی نۆیەم : ڕێز گرتن لە موسڵمانان و پاراستنی ستراتیژی ئومەتی ئیسلامی و هەوڵدان بۆ سەرخستنی، ﴿ٱذْهَبُوا۟ بِقَمِيصِى هَٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِى يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِى بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٣﴾﴾ يُوسُفَ

واتە: (یوسف هەواڵی باوکی پرسی، کە زانی نابینا بووە، پێی وتن) بچن و ئەم کراسەم بەرن و بیدەن بە سەرو ڕووی باوکمدا بینای بۆ دەگەڕێتەوە و چاوی چاک دەبێتەوە، پاشان هەموو کەسوکارتانم بۆ بێنن.

دەیەم ڕەوشت : تواناو هێزی تێگەیاندن، هەروەک چۆن یوسف توانی بە خێرایی پادشا تێبگەیەنێت لە خەونەکەی وای لێبکات کە سەرنجی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، بتوانن بە پڕۆژەکانتان سەرنجی گەل بۆ خۆتان ڕابکێشن، ﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦٓ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِى ۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴿٥٤﴾﴾ يُوسُفَ

واتە: کاتێ کە (هات و) قسەیان پێکەوە کرد، پاشا وتی: ئەمڕۆ ئیتر تۆ لەلای ئێمە دەسەڵاتت هەیە، بەتەواویی لێت دڵنیاین و (جێگەی ڕازی ئێمەیت).

# مەملەکەتی دوانزەیەم:
# ڕووداوەکانی ژیانی حەزرەتی شوعەیب، ئەیوب و ذولکیفل

پێش چوونە ناو باس و قووڵبوونەوە لە ژیانی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە پێویستە هەندێک ڕوونکردنەوەی مێژووی بخەینە بەردەم خوێنەری ئەم کتێبە، ڕاستە ئەم کتێبە لە ژیانی پێغەمبەران ئەدوێت، بەڵام بە گوێرەی قۆناغەکانی مێژوو ویستوومانە لەم کتێبەدا ڕیزیان بکەین، پاشان واقیعیانە بۆ خوێنەری بگوازینەوە، ئیبراهیم پێغەمبەر عَلَيۡهِ السَّلَامُ باوکی پێغەمبەرانە، تەنها خاوەنی ئیسحاق و ئیسماعیلەوە نییە، بەڵکو خاوەنی کوڕی تریش بووە.

وەکو لە باسی ژیاننامەکەیدا ئاماژەمان پێداوە.

ئەم پێغەمبەرە ئازیزە کە لە فەرموودەیەکی ئیبنو عەباس دا هاتووە کە هەرکات ئەو پێغەمبەرە بە وتاربێژی پێغەمبەران ناسراوە[٧].

هەروەها لە قورئان دا ١١ جار ناوی هاتووە.

شوعەیب خەڵکی ناوچەی مەدیەنە، یاخود مەدیەن شار بووە لە ناوچەی موعان کە دەکەوێتە ناوچەی شام، لەسەر ڕێگای حیجاز و نزیک دەریاچەی لوط-ە، ڕەچەڵەکی ئەم پێغەمبەرە عەرەب بووە یاخود لەناو عەرەبدا ژیاوە وەکو ئیسماعیل بە (مستعرب) واتا لە ڕێگای زمانەوە بۆتە عەرەب.

مەدیەن یەکێک بووە لە کوڕەکانی ئیبراهیم، سەرەتا هۆز دروست بووە، بێگومان لە ڕێگای خێزان و ژن و ژنخوازییەوە پاشان هۆزەکە گەورەتر بوون، توانیویانە ناوچە و شار بۆ خۆیان دروست بکەن. پێدەچێت ئەمەش لە ڕێگای چەند ساڵێک ئەم هۆز و شارە چڕ بوونەتەوە.

هەروەها دەڵێن: مەدیەن کوڕی مەدیانی کوڕی ئیبراهیم بووە، باوکی پێغەمبەر نەبووە بەڵکو کوڕەکەی یەکێک بووە لە پێغەمبەران، شوعەیب کوڕی میکیل-ی کوڕی یەشحنە لەناو سریانییەکاندا، واتا لە دەوڵەتی سریانی یاخود ئاشووری کە زمانیان سریانی بووە و ناسراوە بە (یترون)، ئەمەش هیچ بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا لە بەردەست نییە و تەنها وتەی مێژوونووسانە گواستومەتەوە.

---

[٧] ذاك خطيب الأنبياء/رواه الحاكم في المستدرك.

وتەو باسێکی زۆر هەیە لەسەر باوباپیرانی لەناو مێژوونووسان بە هاوڕێی ئیبراهیم و لوط ناوی بردووە، هەیە لەسەردەمی مووسا ناویان بردووە لە ڕێگای فەرموودەیەکی پێغەمبەر کە کەسێک بەناوی سەلەمەی کوڕی سەعد موسڵمان دەبێت و خەڵکی ناوچەی (عەنزە)یە، گوایە پێغەمبەر فەرموویەتی کە جێگای شوعەیبە خەزووری مووسا.

هەرچەندە لە ژیاننامەی (سلمة بن سعد بن مريم العنزي)دا هاتووە هیچ سەنەدێکی لەو بارەیەوە نەدیووە، دەشێت بە هۆکاری ناوچەکەو ئەو شێخە کە لە بنەماڵەی شوعەیب بووبێت، ئەو وتەیە لەمەڕ ئەو هاوەڵە نووسرابێت (والله اعلم).

شوعەیب لەسەردەمی دوای یوسف دا بووە، هەندێک دەڵێن شوعەیب کوڕی شیخری کوڕی لاوی کوڕی یەعقوب-ە، ئەمەش هیچ سەنەدی نییە، بەتایبەت لە ئەهلی کتێبەوە نەهاتووە.

کۆتا نەسەب باسکراوە ئەویش شوعەیب کوڕی ضیفوری کوڕی عەبقا کوڕی ثابت کوڕی مەدیەن کوڕی ئیبراهیمە.

زۆری تر لەو بارەیەوە وتراوە، نووسین هیچ سوودی نییە، بەڵام زانراوە کە لە کوڕانی حەزرەتی ئیبراهیمە سەلامی خوای گەورە لەهەموویان بێت.

لەڕووی مێژووییەوە دەچینە سەر ڕای ئەو مێژوونووسانەی کە دەڵێن دوای یوسف بووە، هۆکاری هەڵبژاردنی ئەم ڕایەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێک:

هۆکاری یەکەم: لەدوای وەفاتی حەزرەتی یوسف زۆربەی مێژوونووسان و ئەهلی کیتاب نێوانی یوشەعی کوڕی نون و حەزرەتی مووسا باس دەکەن لەگەڵ هاروونی برایدا، ئەمەش لە ڕووی مێژوویەوە هەروەها لۆژیک و لێکۆڵینەوەی مێژووی ڕاست نییە و ناگونجێت، چونکە سەردەمی مووسا گەلێک هەبوون بەناوی کوڕانی ئیسرائیل، ئەمەش لە ماوەی چەند ساڵدا ڕوونادات. بەڵکو دروستبوونی گەلی ئیسرائیل کە لە نەوەکانی یەعقوب-ە لایەنی کەم ٢٠٠-٣٠٠ ساڵی دەوێت، ئەم گریمانەش هەرچەندە لاوازە چونکە دروست بوونی گەل زۆر زیاتری دەوێت، بەڵام ئەگەر بە هۆز وەریبگرین وەکو قورئان بە (قەوم) ناوی بردووە کە پێم وایە وشەی قورئان زۆر دەقیق ترە تا وشەی تەورات، تەورات بەگەل ناوی بردوون.




کەواتە لە هەردوو حاڵەتەکەدا لانی کەم چەند سەد ساڵێکی دەوێت بۆیە نێوانی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ لەگەڵ مووسادا لانی کەم ۳۰۰ ساڵیان نێوانە، دواتر زیاتر ئەم باسە ڕوون دەکەینەوە لە باسی ژیانی حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ.

کەواتە هۆکاری یەکەم لە ڕووی سەردەمەوە گونجاوترین کاتی پێغەمبەرە کە تێیدا ژیاوە، درێژەدەری بانگەوازی باوباپیرانی بووە لە (هیلالی میزۆپۆتامیا)دا، لەگەڵ میزۆپۆتامیادا فیرعەون و ئیمپراتۆریەتی ئەوانیش دروست دەبێت.

هۆکاری دووەم: شوعەیب لەناو گەلێک دا ژیاوە ناسراو بوون بەگەلی (الأیکة) و (مدین) کە دوو هۆزی جیاواز بوون، لە ئیبراهیم، ئیسحاق، یەعقوب، یوسف سەلامی خوا لەهەموویان بێت، ئەم چوار پێغەمبەرە و پاشان حەزرەتی ئیسماعیل کە هەموو زۆر نزیک بوون سەردەمەکانیان لە یەکتری، هەروا بەئاسانی دەست بەردار نەدەبوون کە خەڵکی لەو ناوچەیەدا بە بتپەرستی بمێننەوە، ئەزموونی لوط-یش زۆر دیار و نزیک بووە، هەر بۆیە ڕاو بۆچوونی نووسەر وایە کە بەلای کەمەوە سێ بۆ چوار سەدە دوور بووە لەسەردەمی یوسف سەلامی خوا لەهەموو پێغەمبەران بێت.

هۆکاری سێیەم: دروست بوونی ئیمپراتۆریەتی فیرعەون زۆری پێچووە لەدوای حەزرەتی یوسف، پاشان خودی میزۆپۆتامیاش جیاکاری دەوڵەتی تری بەخۆیەوە بینی وەکو ئاشووری و

بابلی و ئەکەدی و عیلامی، ئەمانەش هەموو لەسەردەمی دوای یوسف و یەعقوبی باوکی ڕوویانداوە.

هۆکاری چوارەم: لەباسی شوعەیب دا و کاتی بانگەوازەکەی و هیچ پێغەمبەرێکی بەنو ئیسرائیل ناوی نەهاتووە لەگەڵیدا یان کتێبە ئاسمانییەکان و مێژووییەکانی تەنانەت ناوی ئەو کەسەی کە مووسا دەچێتە مەدیەن و ئاوی مەڕەکانی بۆ ئەدات بەناوی (وائیل) کە خاوەنی دوو کچ و دوایی دەبێتە خێزانی مووسا کچێکیانی بەناوی (صفورة) کە مووسا کوڕێکی لێ دەبێت بەناوی (جرشووم)، بێجگە قورئان ناوی بانگەواز و پێغەمبەرایەتی نەهاتووە، قورئانیش ئاماژەیەکی بۆ ئەم سەردەمە کردووە کە ئێستا لە باسکردنیداین (والله اعلم).

خوای گەورە لە قورئان دا دەفەرموێت:

﴿وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ قَدۡ جَآءَتۡكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡۖ فَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٨٥ وَلَا تَقۡعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٖ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبۡغُونَهَا عِوَجٗاۚ وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ كُنتُمۡ قَلِيلٗا فَكَثَّرَكُمۡۖ وَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٨٦ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٞ مِّنكُمۡ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٞ لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ فَٱصۡبِرُواْ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ بَيۡنَنَاۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ٨٧ ۞ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ قَالَ أَوَلَوۡ كُنَّا كَٰرِهِينَ ٨٨ قَدِ ٱفۡتَرَيۡنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنۡ عُدۡنَا فِي مِلَّتِكُم بَعۡدَ إِذۡ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنۡهَاۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَاۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَاۚ رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ ٨٩ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعۡتُمۡ شُعَيۡبًا إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ٩٠ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ٩١ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَاۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَانُواْ هُمُ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٩٢ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡۖ فَكَيۡفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ ٩٣﴾ الأعراف

واتە: بۆ لای مەدیەن کە شارو هۆزێک بوونە لە نزیک (مەعان) لە ڕێگای (حیجاز)، هەر لە نەوەی ئیبراهیم پێغەمبەر بوون، پێغەمبەرێکی بۆ ناردن لە خۆیان کە شوعەیب بووە، یاخود شوعەیب لەنەوەی ئیبراهیم پێغەمبەر بووە و پێی وتراوە (وتاربێژی پێغەمبەران) چونکە زۆر زمانپاراو و ڕەوانبێژ بووەو ئامۆژگارییەکانی گەورە بووە، ئەمیش فەرمووی: ئەی قەومەکەی خۆم بەتاک و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن و شەریک بۆ خوای گەورە بڕیار مەدەن، چونکە

جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی ترتان نییە بەحەق کە شایەنی پەرستن بێ ئێوە بەڵگەی ڕوون و ئاشکراتان لەلایەن خوای گەورەوە بۆ هاتووە، ئێوە کێشانەو پێوانەتان بەدادپەروەری بێت و فێڵی تیا مەکەن کاتێک کە شتومەک بەخەڵکی ئەفرۆشن کەمیان مەدەنێ، یاخود کەموکوڕی تێ مەکەن، یان فێڵ لە خەڵکی مەکەن لەسەر ڕووی زەویشدا ئاشووب و ئاژاوە مەنێنەوە بەخراپەکاری لە دوای ئەوەی کە خوای گەورە چاکسازی تیا کردووە لە ڕێی ناردنی پێغەمبەران و دابەزینی کتێبەکانەوە، ئەمە بۆ ئێوە باشترە ئەگەر ئێوە ئیماندارن﴿٨٥﴾ دامەنیشن لەسەر هەموو ڕێگاکان و ڕێگری و هەڕەشە لە خەڵکی مەکەن کە ئیمان بێنن، کە دادەنیشتن لەسەر ئەو ڕێگایانەی کە بۆ ماڵی شوعەیب ئەڕۆیی و هەڕەشەیان لە خەڵکی ئەکرد بۆ ئەوەی ئیمان نەهێنن، یان هەڕەشەی کوشتنیان لە خەڵکی دەکرد ئەگەر پارەیان نەدەنێ، ڕێگری ئەکەن لە ئایینی خوای گەورەو نەیانئەهێشت خەڵکی موسڵمان بێت و ئیمانی پێ بهێنێت، ئەتانەوێ ڕێگە و ئایینی خوای گەورە چەوت و گێڕ بکەن و بەئارەزووی خۆتان بێ یادی ئەو نیعمەتەی خوای گەورە بکەنەوە کە ئێوە ژمارەتان کەم بوو خوای گەورە زۆری کردن، یان فەقیر بوون دەوڵەمەندی کردن، تەماشا بکەن بزانن سەرەنجامی ئاشووبگێڕان و خراپەکاران لە نەتەوەکانی تر چۆن بووە چۆن خوای گەورە لەناوی بردوون﴿٨٦﴾ هەر چەندە کۆمەڵێکیان ئیمانیان هێنا بەو پەیامەی کە خوای گەورە منی پێ ناردبوو کۆمەڵێکیان ئیمانیان نەهێناوە، ئارام بگرن تا خوای گەورە خۆی بڕیار ئەدا لە نێوانماندا کە بزانین کێ لەسەر حەقەو کێ لەسەر باتڵە، یان تا خوای گەورە باوەڕداران سەر ئەخات بەسەر بێباوەڕان خوای گەورە باشترینی دادوەرانە﴿٨٧﴾ دیسانەوە دەسەڵاتدارو گەورەو سەرکردەکان لە کافران و خۆ بەگەورەزانان لە قەومەکەی پێیان وت: ئەی شوعەیب خۆت و ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە لەگەڵ تۆدا، ئەبێ لە دێیەکەمان دەرتان بکەین و شاربەدەرتان بکەین یاخود ئەبێ بگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینی ئێمە، شوعەیب وتی: ئایا بەزۆر لە دین هەڵماندەگەڕێننەوە چۆن شتی وا ئەبێت ئێمە ئیمانمان هێناوە﴿٨٨﴾ بەڕاستی ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە بۆ ئایینی ئێوەو شەریک بۆ خوای گەورە بڕیار بدەین ئەوە واتە درۆمان بۆ خوای گەورە هەڵبەستووە، کەواتە هەر کەسێک شەریک بۆ خوای گەورە بڕیار بدات ئەوە درۆی بۆ خوای گەورە هەڵبەستووە لە دوای ئەوەی کە خوای گەورە ئێمەی ڕزگار کرد لە کوفرو شەریک دانان بۆی، ئێمە بۆمان نییە بگەڕێینەوە بۆ ناو ئەو کوفرو شیرکە، ئیلا مەگەر خوای گەورە ویستی لێبێت، زانیاری خوای گەورە زۆر فراوانەو هەموو دروستکراوانی گرتۆتەوە، ئێمە تەوەکولمان لەسەر تەنها خوایەو پشتمان تەنها بەخوای گەورە بەستووە کە دامەزراومان بکات لەسەر ئیمان، ئەی پەروەردگار بڕیار بدە لە نێوان ئێمەو قەومەکەماندا بەحەق بەوەی کە سەرمان بخەی بەسەریاندا، تۆ باشترین دادوەرو سەرخەری کە موسڵمانان سەرئەخەی بەسەر کافراندا﴿٨٩﴾ دیسانەوە دەسەڵاتدارو سەرکردەکان لە کافران لە قەومەکەی وتیان: ئەگەر ئێتوو

ئێوە شوێنی شوعەیب بکەون و ئیمانی پێ بێنن و بچنە ناو دینەکەی ئەوە ئێوە زەرەرمەند ئەبن و تیا ئەچن و لە ناوتان ئەدەین، یاخود ئیتر نابێ فێڵ بکەن لە کێشانەو پێوانەدا بەوە زەرەر ئەکەن﴿٩٠﴾ ئەمانیش خوای گەورە زەوی هەژاند لە ژێریاندا بە بوومەلەرزە، یاخود دەنگێکی بۆیان نارد لەناو ماڵی خۆیاندا هەموویان لەسەر ئەژنۆ و ڕوویان نووسان بەزەویەکەوەو هەموویان مردن و جووڵەیان لێ برا﴿٩١﴾ ئەوانەی کە شوعەیبیان بەدرۆ زانی وەک ئەوەی کە لەو شوێنەدا هەر نەبووبێتن لەبەر ئەوەی خوای گەورە ڕیشەکێشی کردن، ئەوانەی کە شوعەیبیان بە درۆزانی و شوێنی نەکەوتن ئەمان زەرەرمەندی ڕاستەقینە بوون، کە پێشتر ئەوان بە موسڵمانانیان ئەوت ئەگەر ئێوە شوێن شوعەیب بکەون ئێوە زەرەر ئەکەن، نەخێر زەرەرمەند خۆیان بوون ئەوەتا خوای گەورە لە دونیا لەناوی بردن و لە قیامەتیش بەهەمیشەیی لە دۆزەخدان﴿٩٢﴾ شوعەیب کە بینی خوای گەورە سزایان بۆ دائەبەزێنێ پشتی تێ کردن یان دوای لەناوچوونیان وەکو سەرزەنشت کردنیان پێی فەرموون: ئەی قەومی خۆم بەدڵنیایی من پەیامی خوای گەورەم پێ ڕاگەیاندن و ئامۆژگاریم کردن بەدڵسۆزی ئیتر چۆن من خەفەت بخۆم لە کەسانێک کە کافرن بە خوای گەورە و ئیمانیان نەهێناوە﴿٩٣﴾

هەروەها ڕوویەکی تریشمان نیشان ئەدات و دەفەرموێت: ﴿۞ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ وَلَا تَنقُصُواْ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَۖ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ﴿٨٤﴾ وَيَٰقَوْمِ أَوْفُواْ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِۖ وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْاْ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ﴿٨٦﴾ قَالُواْ يَٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِيٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ﴿٨٧﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُۚ وَمَا تَوْفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴿٨٨﴾ وَيَٰقَوْمِ لَا يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثْلُ مَآ أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ أَوْ قَوْمَ هُودٍ أَوْ قَوْمَ صَٰلِحٍۚ وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ﴿٨٩﴾ وَٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِۚ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ﴿٩٠﴾﴾هود

واتە: بۆ لای قەومی مەدیەن کە لە نێوان حیجازو شام نیشتەجێ بوون شوعەیب پێغەمبەرمان نارد کە ئەمیش لە خۆیان بووە، ئەمیش وتی: ئەی قەومی خۆم بەتاک و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن و خوا بپەرستن و شەریک بۆ خوا دامەنێن لەبەر ئەوەی جگە لە زاتی پیرۆزی (الله) هیچ پەرستراوێکی تری حەقتان نییە شایەنی پەرستن بێت، پێوانەو کێشانەتان کەم مەکەن بەجوانی و تەواوی بەخەڵکی بدەن. من ئەبینم کە ئێوە خوای گەورە ڕزق و

ڕۆزییەکی فراوان و زۆری پێ بەخشیون، من لەوە ئەترسێم ئەگەر ئێوە لەسەر ئەم کارانە بەردەوام بن خوای گەورە سزایەکتان بدات لە ڕۆژێکدا کە سزای خوای گەورە دەورتان بدات و شوێنی ڕاکردن و پەناتان نەبێ بۆی ڕا بکەن(٨٤) ئەی قەومی خۆم کێشانەو پێوانەتان با بە دادپەروەری بێت و نوقسانی مەکەن و فێڵی تیا مەکەن کە شتومەک بەخەڵکی ئەدەن بە کەمی پێیان مەدەن لەسەر زەویشدا ئاشووب مەنێنەوەو ئاشووب بڵاو مەکەنەوەو ڕێگری و چەتەیی مەکەن(٨٥) ئەوەی کە بەحەڵاڵی خوای گەورە پێتان ئەبەخشێ و بۆتان ئەمێنێتەوە ئەوە باشترە بۆتان لەو حەرام و فێڵە ئەگەر ئێوە باوەڕدارن، من پارێزەر نیم بەسەرتانەوەو چاودێریتان بکەم بەڵکو خوای گەورە چاودێریتان دەکات و موحاسەبەتان دەکات لەبەر خوا ئەمە بکەن(٨٦) بە سوکایەتی و گاڵتەپێکردنەوە وتیان: ئەی شوعەیب ئایا نوێژکردنەکانتە فەرمانت پێ دەکات کە واز بێنین لە پەرستنی ئەو خوایانەی کە باوک و باپیرانمان ئەیانپەرست، یاخود لەماڵی خۆماندا بە ویستی خۆمان کڕین و فرۆشتن نەکەین واتە فێڵی تیا نەکەین و زیادو کەمی لێ نەکەین؟ بە سووکایەتی و گاڵتە پێکردنەوە ئەیانووت: بەڕاستی تۆ کەسێکی زۆر نەرمونیانی و سزای بەرامبەرەکەت نادەی، لەسەر ڕێگای ڕاستی هەر چەندە ئەیانزانی لە حەقیقەت و ڕاستیشدا هەروابووە(٨٧) شوعەیب پێغەمبەر فەرمووی: ئەی قەومی خۆم هەواڵم پێ بدەن کە من لەسەر بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرام لەلایەن خوای گەورەوە ڕزق و ڕۆزی و ماڵێکی زۆرو باش و حەڵاڵی پێ بەخشیووم، یان پێغەمبەرایەتی و حیکمەتی پێ بەخشیووم، من نامەوێ پێچەوانەی ئێوە بکەم و شتێک لە ئێوە قەدەغە بکەم و خۆم بیکەم، بەڵکو من تەنها مەبەستم چاکسازیەو چاکسازیم دەوێت چەندێک لە توانامدا بێت ڕێنمایی و هیدایەتی من تەنها لەلایەن خوای گەورەوەیە کارەکانم هەمووی بەو سپاردووەو تەوەکولم لەسەر ئەوە، هەر بۆ لای خوای گەورەش ئەگەڕێمەوە(٨٨) ئەی قەومی خۆم با ڕق لێبوونتان لە من واتان لێ نەکات کە من بەدرۆ بزانن و ئیمانم پێ نەهێنن، چونکە ئەو سزایەی کە تووشی قەومی نوح و هود و صاڵح بوو تووشی ئێوەش دەبێت و خوای گەورە سزاتان دەدات قەومی لوط-یش سەردەمیان یان شوێنیان لە ئێوەوە دوور نییە، بترسێن کە خوای گەورە سزای ئێوەش بدات(٨٩) ئێوە داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن لە تاوانەکانی ڕابردووتان، پاشان بۆ لای خوای گەورە بگەڕێنەوەو تەوبە بکەن و لە داهاتوودا مەگەڕێنەوە سەر تاوان، بەڕاستی پەروەردگاری من زۆر بەڕەحم و سۆزو بەزەییە بۆ ئەو کەسانەی تەوبە ئەکەن، ئەوانەی کە تەوبە ئەکەن خۆشەویستی خوای گەورەن و خۆشی ئەوێن(٩٠)

پێشتریش لەسەرەتای ئەم کتێبەدا ئاماژەمان پێداوە ژیانی پێغەمبەران زۆربەی زۆری لێکچوون، ئەگەر تەماشای ژیانی پێغەمبەرانی ڕابردوو بکەین لەگەڵ شوعەیب دا لێکچوونی زۆر هەیە لە نێوانیاندا.

لێرەدا تاوانەکان گۆڕانکاری تێدا دەکرێت، بەڵام لە ڕووی بیروباوەڕەوە هەموو پێغەمبەران خاوەنی یەک وتە و ڕوونکردنەوە بوون ئەویش تەوحیدە.

خوای موتەعال لەگەڵ کافری بیروباوەڕی چەوتیاندا، تاوانە گەورەکانیان دیاردە قێزەونەکانیان دەرخستووە، لووتبەرزی هۆزی (عاد) خۆبادانیان بەهێزو بازوویاندا بە هەمانشێوە هۆزی (ثمود) لووتبەرزی و گاڵتەکردن بە خودی پێغەمبەر و ئینکاری کردنیان لە وجودی ئیمان بە یەکتاپەرستی، هۆزی لوط بە نێربازی و ڕەوشتی ناپەسەند و..هتد. میصر بە چاوبڕکێ و داوێنپیسی ناو کۆمەڵگە...هتد.

هۆزی مەدیەن یان هۆزەکانی ناوچەی مەدیەن بێجگە لە پەرستنی دارو بەرد و بت، تاوانی زۆر ناشیرینیان هەبوو، ئەوانەش هەر دیاردەی ناو کۆمەڵگەن، وا دەردەکەوێت بێجگە بیروباوەڕ ئەم تاوانانە دەشێت ئیمانداریش تێبکەوێت، بەڵام تاوانەکەی زۆر گەورەیە لای خوای پەروەردگار بۆیە لەگەڵ هەر پێغەمبەرێکدا تاوانێکی گەورەیان ئاشکرا دەکات کە باوبووە لەناو کۆمەڵگەکەیاندا.

جا لەناو هۆزەکانی مەدیەن دا دیاردەی زۆر ناشیرین باوبووە، لەوانە لاسەنگ کردنی تەرازوو، مەرج نییە مەبەستەکە لە فرۆشتنی کیلۆیەک تەماتە یان فەردەیەک برنج بە قەپان و تەرازووی سەرشان، نا بەڵکو هەموو پێوەرێکی چەوت دەچێتە خانەی تەرازووبازی بە بەڵگەی قورئان خۆی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ٢ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ٣ أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبۡعُوثُونَ ٤ لِيَوۡمٍ عَظِيمٖ ٥ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦﴾ المُطَفِّفِينَ

واتە: هەڕەشەی قورس و سەخت و ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو کەسانەی کە شت لە خەڵکی بکڕن ئەوە بە تەواوی ئەیکڕن، بەڵام بە خەڵکی بفرۆشن بە کەمی پێیان ئەفرۆشن(١) کاتێک کە شت لە خەڵکی بکڕن ئەوە حەقی خۆیان بە تەواوی وەرئەگرن یاخود بە زیادەوە لێیان وەرئەگرن(٢) بەڵام کاتێک کە شت بە خەڵکی بفرۆشن کەمیان پێ ئەدەن و فێڵیان لێ ئەکەن، قەومی (شوعەیب)یش لە پاش شەریک دانان بۆ خوای گەورە ئەم سیفەتە خراپەیان تیابوو لە کێشانەو پێوانەو کڕین و فرۆشتندا فێڵیان لە خەڵکی ئەکرد خوای گەورە لەناوی بردن(٣) ئایا ئەم کەسانە

نازانن کە ئەمانە زیندوو ئەکرێنەوەو لەبەر دەستی خوای گەورەدا ڕائەوەستێنرێن و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ئەکرێ۝ لە ڕۆژێکی زۆر گەورەدا کە ڕۆژی قیامەتە۝ ڕۆژی قیامەت ڕۆژێکە کە خەڵکی هەموویان ڕائەوەستێنرێن لەبەر دەستی پەروەردگاری هەموو جیهاندا بە پێی پەتی و بە ڕوتی و بە خەتەنە نەکراوی، لە هەڵوێست و دیمەنێکی زۆر قورس و سەختدا کە خۆر نزیک بۆتەوە بە ئەندازەی تەنها میلێک، خەڵکی بە گوێرەی تاوانی خۆیان عەرەق ئەکەن و لە عەرەقی خۆیان نوقم ئەبن و غەرق ئەبن، هەیە عەرەقەکەی ئەگاتە لای گوێی، هەیە دایئەپۆشێ، هەیە خوارتر و هەیە سەرووتر بە گوێرەی تاوانی خۆیان، واتە: لەو ڕۆژە بترسێن کە خوای گەورە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ئەکات کە ڕۆژی قیامەت ئەندازەی هەر ڕۆژێکی بە پەنجا هەزار ساڵ تێئەپەڕێ لەسەر خەڵکی و ڕۆژێکی یەکجار سەختە پەنا بەخوای گەورە۝

جا تەرازووبازی لە دادگادا دەکرێت، لە پێشانگای سەیارە فرۆشتن دەکرێت، تەرازووبازی تەنانەت لە فرۆشتنی ئامێرەکانی سەردەمیش دەکرێت، ئینجا دیاردەیەکی تری ناو کۆمەڵگەی شوعەیب شتی خەڵکیان بەکەم دەزانی، ماڵی خەڵکی تریان دەشکاند و سووک دەکرد، ئەمە تەنها لە شووتی و کاڵەک دا نابینرێت، بەڵکو بێستانی باخەوانەکە بشکێنن و بڵێن شوتیەکەی سپییە و کاڵەکەکەی بۆگەنە.

دەبێت ئیماندار زۆر دەمپاک بێت و نەکەوێتە ئەو بوارانەوە بەتایبەت قسە وتن بە زانایانی ئیسلام، هەروەکو چۆن هەندێک قسەی ناشیرین بە سەید قوطب دەڵێن و درۆی بەدەمەوە هەڵدەبەستن، تەنها بۆ سەرخستنی مەنهەجی حیزب و گرووپەکەی یان سۆفی قسە بە ئیبنو تەیمییە دەڵێن یان (محمدی کوڕی عبدالوهاب) یاخود سەلەفی قسەی ناشیرین بەرانبەر بە زانایانی ئەشعەری و خودی ئەبو حەسنی ئەشعەری ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێت، ئەمانە هەموو دەچنە خانەی ئەو دیاردە ناشیرینەی هۆزی مەدیەن کە پێغەمبەر شوعەیب نێردراوە بۆیان.

پاشان فرت و فێڵ و چاوبەست و کاری هەڵخەڵەتاندنیان دەکرد، لەسەرەڕێگا دا بۆ خەڵک دادەنیشتن و چاوبەستیان دەکردن و ماڵی خەڵکیان بەهەدەر دەبرد، هەڵبەت زۆرجار بە کۆمەڵ ئەم کارەیان دەکرد.

لە ئێستاشدا سەروەت و سامان و خاک و نەوت و کانزای ئەو وڵاتانە دەفرۆشرێت و دەدزرێت بۆ سەرۆک و حکومەت و حیزبەکان و خەڵکیش ئاوی خواردنەوەشی بەپارە دەست ناکەوێت!

هەربۆیە لەسەرەتاوە چەند نموونەیەکمان لە ئایەتەکان داناوە بە تەفسیرەوە، بێجگە ئەو سەرچاوەیە هیچ سەرچاوەیەکی تر بەردەست نییە کە ڕاست و دروست بێت، بۆ پشت بەستن

بەو ئایەتانە واتا بەهێزکردنی باسەکەمان، بۆیە ناچارین زیاتر ئەوەی لایەنی ژیانی حەزرەتی شوعەیبە لە قورئان وەردەگرین.

جا هەر گەلێک بێباوەڕ بوون ئەم کردار و دیاردە ناشیرینانەیان هەبوو ئەوە بە دڵنیاییەوە لەناو دەچن، ئەم سوننەتەش بەردەوام بوو تا هاتنی تەیر و ئەبابیل، لەدوای ئەو موعجیزەیە خوای گەورە گەلان لەناو نابات بە هۆکاری تاوانیان، چونکە کۆتا پێغەمبەر هات کە محمد ﷺ دەبێت بە قورئان و سوننەتی جەنابیان چاکسازی لەناو گەلان دا بکرێت یان خوای موتەعال لە قیامەتدا تۆڵەیان لێ دەکاتەوە.

لەوانەیە خوێنەر بپرسێت ئەی ئەو هەموو ڕەشەبا و لافاو و زەمین لەرزە و بورکانە چییە لەم سەردەمەدا؟

لەوەڵامدا دەڵێین: هیچ پەیوەندی بە تۆڵەسەندنەوەی گەلانەوە نییە، بەڵکو هەمووی دیاردەی سرووشتی زەوییە، بەفەرمانی خوای گەورە، بێگومان بۆ (ئەپدەیت کردنەوەی خودی گۆی زەوی و ئاو و هەواکەیەتی) لەناوبردنی گەلانی ڕابردوو پێشتر ئاگادار کرانەوە لەلایەن پەیامبەرەکانیان دوای ئەوە ڕاستەوخۆ ڕووی ئەدا، بەڵام دیاردە سرووشتییەکانی ئێستا هیچی ناچێتە ئەو خانەیەوە، دەشێت لە وڵاتێکی موسڵمان زەوی لەرزە ڕوو بدات لە ئەمەریکا باوبۆران و لافاو ئەمانە هەموو تەفسیری پەستانی بەرز و نزم و گۆڕانکاری هەوای بۆ دەکرێت، بەڵام لافاوی نوح هی تەفسیرێکی زانستی هەڵناگرێت عەزاب و سزای خواییە.

لەناوچوونی هۆزی (ثمود و عاد و لوط) ئەوە تەفسیری زانستی هەڵناگرێت (کن فیکون)ی خوای پەروەردگارە.

کەواتە پێوەری لەناوچوونی گەلان کۆتایی پێهاتووە بە هاتنی پێوەری شەریعەتی محمد ﷺ کە شەریعەتی ئیسلامە، لەوانەیە جارێکی تر خوێنەر بپرسێت ئەی ئەوە نییە پێغەمبەری خوا ﷺ دەترسا لە دووبارە بوونەوەی ئەو سزایانە؟

بە دڵنیاییەوە ئەم وشەیە ڕاستە، بەڵام خودی پێغەمبەر ﷺ مابوو، بۆیە (رسول الله ﷺ) دەترسا، چونکە خۆی رئوف رحیم بوو دوعای دەکرد لە خەڵکی طائیف کە خوا هیدایەتیان بدات لەکاتێکدا دەیتوانی شار و خەڵکەکەی وێران بکات لە ڕێگای فریشتەکان کە خوای گەورە هەڵبژاردەی خستە بەردەمی تا خۆی لە ژیاندا بوو دەترسا وەکو (تەغیب و تەرهیب) بۆ ئێمە و هاوەڵانیشی باسکرد و جێهێشت، بەڵام هیچ کات ڕووی نەدا.

دەشێت لە یەک حاڵەتدا ڕووبدات ئەگەر موسڵمانان دژی بێباوەڕان جەنگان، خوای موتەعال وەکو سەربازی خۆی دەنێرێت جا ڕەشەبا بێت یان باران وەکو لە بەدر و ئەحزاب ڕوویداوە،

بەڵام ناگاتە ئەوەی هەموو هۆز و گەلێک لەناو ببات، چونکە ئەو زوڵم و کوشتارەی یەهود دەیکات بەرانبەر فەلەستین لە ماوەی چەند مانگێک دا ٤٠ هەزار ژن و منداڵ و پیری شەهید کرد و شارێکی وێران کرد، دەبوو بەو پێوەرە بێت ئیسرائیل بەلافاو لەناو بچوایە یان بە زەمین لەرزە.

هاوکێشەکە بەم شێوەیە نییە، بەڵکو خوای گەورە فێرمان دەکات کە سەرکەوتن لای خودی ئیماندارەوە دێت، نەک لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، کە مادام خاوەن هێز و عیزەت و کەرامەت نین کەواتە دوژمن بەسەرتاندا زاڵ دەبێت.

بابگەڕێینەوە بۆلای حەزرەتی شوعەیب عَلَيْهِ السَّلَامُ، شوعەیب ئەزموونی گەلانی ڕابردووی لەبەرچاو بوو بۆیە ئاگاداری هۆزەکەی کردەوە، ئامۆژگاری کردن کە چی بەسەر (هۆزی ثمود و لوط و نوح) دا هاتووە، داوای لێکردن کە زوو فریای خۆیان بکەون و تۆبە بکەن و داوای لێخۆش بوون بکەن، بەڵام ئەوان دەیانووت حەزمان بەم جۆرە وتانە نییە، نامانەوێت گومانمان لێت بێت. خۆ ئەگەر هێز و توانای هۆز و عەشیرەکەت نەبوایە ئەوا زوو دەربەدەر و ڕەجممان دەکردی، پاشان دەستیان کرد بە گاڵتە پێکردن و دەیانووت ئەمە نوێژەکانت ئەم فەرمانەت پێدەکات؟ ئەو هەر بەردەوام بوو لە وشەی جوان و ئوسلوبی جوان لەگەڵیاندا، بەڵام بەداخەوە هیچ کاریگەری نەبوو لەسەر زۆرینەی گەلەکەی هەرچەندە هۆزەکەی بوون بە دوو بەش، بەشێکیان بەتەواوەتی شوێن شوعەیب کەوتن و بەشەکەی تریش دژایەتی سەرخستنی شوعەیبیان دەکرد، ناچار شوعەیب دوعای لێکردن و کە خوای موتەعال جیاکاری بخاتە نێوان بەشی چاکە و بەشی خراپەکەی، ئەوەبوو خوای گەورە (رجفة)ی بۆ ناردن کە زانایان کۆیان کردۆتەوە لە نێوانی زەمین لەرزە و دەنگێکی بەهێز کە هەرچی دەنگی ترە دەیوەستێنێت و پاشان وشک بوونی لاشەیان و دەرچوونی ڕۆحیان، کۆتایی بە خۆیان و خراپەکارییان هات، پێشتر دەیانووت شوێن شوعەیب مەکەون دوایی تووشی زەرەرو زیان دەبن، چونکە بۆ فرت و فێڵی ئەوان بەزەرەرو زیانیان دەزانی بەڵام کە خوای گەورە (الرجفة)ی بۆ ناردن هەموو لەناوچوون، ئەو زەرەرو زیانە کە مرۆڤ بەکافری بمرێت، ئەو زەرەروزیانە کە مرۆڤ بۆ هەتاهەتایە بڕواتە دۆزەخ، سەرگەردانی ئەوەیە کە قیامەت لەدەست بدەیت نە ڕۆژێکە و نە سەد ساڵ و نە ملیۆنێک ساڵ، بەڵکو هەتاهەتایی و ئەبەدییە.




## اصحاب الأيكة خەڵکی دارستانە چڕەکە
## قۆناغی دوای هۆزی مەدیەن

لەدوای لەناوچوونی هۆزی مەدیەن خوای گەورە فەرمانی کرد بە حەزرەتی شوعەیب کە بڕوات بۆ ناو خەڵکی ناو دارستانێکی چڕ لەو ناوچەیە، ئەوانیش هەموو دارپەرست و کافر و خراپە کار بوون، ناسرا بوون بە (اصحاب الأيكة) واتا خەڵکی ناو دارستانە چڕەکە، یاخود کۆمەڵێک لە مێژوونووسان دەڵێن: کە کۆمەڵە دارێکیان دەپەرست و بەیداخیان پێوەکردبوو و بە پیرۆزیان دەزانی، نازناوی خەڵکی ناوچەکەی ئەو دارەیان وەرگرتووە، خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿وَإِن كَانَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ لَظَٰلِمِينَ ۝٧٨ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٖ مُّبِينٖ ۝٧٩﴾ الحجر

واتە: هەرچەندە هاوەڵانی (ئەیکە) لە ستەمکاران بوون (شەریکیان بۆ خوا داناوەو چەتەیی و ڕێگریان کردووەو لە کێشانەو پێوانەدا فێڵیان کردووە)، وتراوە: (ئەیکە) داری چڕ بووە، یاخود ناوی دێ یەکەیان بووە کە قەومی شوعەیب بوون۝٧٨ تۆڵەمان لەوانیش سەندو زەویمان لەژێریاندا هەژاندو بە دەنگێکی گەورە لە ناومان بردن ئەوانیش شوێنیان ئاشکراو دیار بووە۝٧٩

پاشان خوای گەورە لە سورەتی (الشعراء) زیاتر باسەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و دەفەرموێت:

﴿كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ۝١٧٦ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ شُعَيۡبٌ أَلَا تَتَّقُونَ۝١٧٧ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ۝١٧٨ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ۝١٧٩﴾ الشعراء

واتە: (ئەصحابی ئەیکە) واتە: قەومی شوعەیب پێغەمبەر کە دارێکیان ئەپەرست لای (مەدیەن) خوای گەورە ئەفەرمووێ: ئەوانیش سەرجەم پێغەمبەرانیان بەدرۆ زانی۝١٧٦ شوعەیب پێی فەرموون: ئەوە بۆ تەقوای خوای گەورە ناکەن بەوەی کە ئیمان بێنن۝١٧٧ من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆ ئێوەو پەیامی خوای گەورەتان وەکو خۆی پێدەگەیەنم بەبێ زیادو کەم۝١٧٨ دەی ئێوە تەقوای خوای گەورە بکەن و گوێڕایەڵی من بکەن۝١٧٩

ئەمانیش هەمان دیاردە و کاری قێزەونی شاری مەدیەن و هۆزی مەدیەنیان هەبوو، ئەمان بە جۆرێک لە دوکەڵ کە هەناسەیان بۆ نەئەدرا کە ناسراوە بە (الظلة) یان ڕاڤەکارانی قورئان دەفەرموون لەدوای ئەوەی ئاگاداری کردنەوە لە سزای خوایی ناوچەکەیان زۆر بێ باران و وشکە ساڵی بوو، پەڵە هەورێکی ڕەش هات و هەمووان وایانزانی ئەو هەورە باران دەبارێنێ، چوونە ژێر سێبەرەکەی و خوای گەورە بەهەورە بروسکەی هەورەکە هەموویانی لەناوبرد، بەڵام زۆرێکیش لە خەڵکی ناوچەکە لەسەر دەستی خواناس و ئیماندار بوون، ئەویش کۆتایی بەبانگەواز و پەیامەکەی هێناو تەشریفی برد بۆ مەککە و لەوێ مایەوە، خەڵکی مەککە زۆر ڕێزیان لێگرتووە کە زانیویانە باوباپیرانی شوعەیب حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل-ە. لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە کە لە شاری مەککەدا دوا ساتەکانی ژیانی بەسەر بردووە و هەر لەوێش وەفاتی کردووە، لە ڕۆژئاوای مەککە لای دارالندوة و دار السهم نێژراوە و قەبرەکەی لە شاری مەککەیە.

کۆی گشتی باسی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە هاندانی خەڵکییە بۆ دەستپاکی و سەر ڕاستی و وازهێنان لە گزیبازی و بەڕێزەوە تەماشاکردنی ئەو کەسەی کە چاکەت لەگەڵ دەکات جا لەڕووی ڕزق و ڕۆزی بێت یان زانا و پیاوچاکان بن، هەڵبەت مەبەستمان زانایانی ئیسلامە لەهەموو بوارەکانیدا نەک مارکس و جان جاک ڕۆسۆ و نیچە، هەڵبەت هەموو زانایەک هەر جێگای ڕێزن بەهۆی زانستەکەیانەوە.

## ڕووداوەکانی ژیانی حەزرەتی ئەیوب عَلَيْهِ السَّلَامُ

ئەم پێغەمبەرە چوار جار ناوی لە قورئاندا هاتووە، مێژووی ژیانی لەناو موسڵماناندا زۆر کورتە و نادیارە، ئەوەندەی کە پێویست بووە لە ئارامگری و نارەحەتی لە قورئاندا بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ باسکراوە.

لای موسڵمانان یەکێک لە پێغەمبەران و هەروەها لای یەهودیش بە ئەیوبی ڕاستگۆ ناسراوە، لای ئەوانیش پێغەمبەرە، بەڵام لای نەسارا بە پێغەمبەری نازانن و دەڵێن: (موبارەک و قدیسە) واتا بە (سەنت) ناوی دەبەن، لە کیتابی پیرۆزدا (ئینجیل) بەشێکی تایبەتی هەیە بە (سفری ئەیوب) ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: یەکێک بووە لە خەڵکی ڕۆم، ئەم وتەیە پێناچێت دروست بێت، چونکە ئەو سەردەمە جێگایەک دروست نەبووە بەناوی ڕۆم، ئەگەر مەبەستی ڕۆژئاوا (ئەوروپا) بێت پێدەچێت بەم شێوەیە دروست بێت، هەروەها نەسەب و بنەماڵەی دەگەڕێتەوە سەر حەزرەتی

ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ، لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل نییە، چونکە نەسەبی دەگەڕێتەوە سەر ئەیوبی کوڕی موصی کوڕی زراحی کوڕی عیصی کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم سەلامی خوا لەهەموویان بێت.

هەندێک دەڵێن دایکی کچی حەزرەتی لوط بووە، ئەمیش پێناچێت دروست بێت، چونکە جیاوازی زۆری سەردەم لەنێوانی ئەو دوو پێغەمبەرەدا هەیە، دەشێت دایکی یەکێک بێت لە کچانی نەوەکانی لوط عَلَيْهِ السَّلَامُ.

ڕایەک هەیە کە گوایە نەسەبی دەگەڕێتەوە سەر یوسف، کوڕی یوسف بەناوی ئەفراسیاو یاخود ئەفراسیم کوڕی یوسف، ئەمەش جێگای بڕوایە لەبەر چەند هۆکارێک هەروەها گوایە لە خانەوادەی یەعقوبە، لە کچێکی بەناوی لیای کچی مەنسای کوڕی یەعقوب، کۆتا قسەش ئەوەیە کە کوڕی لاوی کوڕی یەعقوبە.

بۆچی جێگای باوەڕە وتمان لەبەر چەند هۆکارێک!

هۆکاری یەکەم: دەشێت لەنەوەی یوسف بێت بە چەند پشت ئەمە دیار نییە، چونکە واهاتووە کە گوایە لە بنەماڵەی یەعقوب لە نەسەبی یوسف پێغەمبەران دێن، لە خێزانی یەهوزای کوڕی یەعقوب پاشان مەلیکەکانیان دێت، ئەمیش پێغەمبەرێکە و لە نەوەی یوسف-ە عَلَيْهِ السَّلَامُ.

هۆکاری دووەم: دەشێت ئەیوب لەناوچەی ئەنادۆڵ (تورکیای ئەمڕۆ) یاخود یۆنستانەوە هاتبێت و لەنەوەی ئیبراهیمە، بەڵام لەبەشی یەعقوب کە ئەسباط بێت، لەبەر ئەوەی کوڕانی

یەعقوب بەهۆکاری پلەو پایەی عەزیزی میسری درا بە یوسف، پاشان یەهوزای برای توانیویانە دەسەڵاتیان هەبێت بە زۆرێک لەناوچەکاندا، هەربۆیە کوڕانی ئیبراهیم و لەنەسەبی یەعقوب زۆر بڵاوەیان کردبێت بە وڵاتاندا و ئەیوب پێغەمبەر لەنەوەکانی ئەسباط بێت.

هۆکاری سێیەم: کەسێکی زۆر سەرمایەدار بووە لە هەژارییەوە پێگەیشتووە، بەڵکو لە قورئان و کتێبی پیرۆزدا بە دەوڵەمەند باسکراوە، ئەمەش زیاتر دڵنیامان دەکاتەوە کە لە بنەماڵەی ئەسباط-ە، چونکە بەهۆکاری یوسف و دەسەڵاتیان لە وڵاتی میسردا دەوڵەمەند بووبوون.

هۆکاری چوارەم و کۆتایی: پێغەمبەرێک بووە لەناو گەلێکی تاوانباردا، بانگەوازی بۆ ئەوە بوو کە خەڵکی کوفری نیعمەت نەکەن، خەڵکەکەی بڕوایان بە یەکتاپەرستی خوا هەبووە، بەڵام کوفری نیعمەت و سەرپێچییان زۆر بووە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە نزیک بووە لەبانگەوازی پێغەمبەرانی تر، ئەویش باوباپیرانیەتی لە یوسف و یەعقوب و ئیسحاق و ئیبراهیم سەلامی خوا لەهەموویان بێت.

خوای پەروەردگار لە قورئان دا لە چوار سورەتی جیاوازدا باسی کردووە کە سەرەتا لە سورەتی النساء بە پێغەمبەر ناوزەدی کردووە و دەفەرموێت:

﴿۞ إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَـٰرُونَ وَسُلَيْمَـٰنَ ۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ١٦٣﴾ النساء

واتە: ئەی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئێمە وەحیمان بۆ تۆ ناردووە هەروەکو چۆن وەحیمان بۆ نوح و بۆ پێغەمبەرەکانی دوای نوحیش ناردووە، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نوح یەکەم پێغەمبەر بوو بۆیە باسی دەکات و پێغەمبەرانی تر لەدوای ئەو باس دەکات و لە فەرموودەی شەفاعەتدا هاتووە کە نوح یەکەم پێغەمبەر بووە خوای گەورە ناردوویەتی، وەحیمان بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و هۆزەکانی تر لە نەوەی یەعقوب پێغەمبەر لە پێغەمبەرانیان و بۆ عیسى و ئەیوب و یونس و هاروون و سولەیمان ناردووە، زەبووریشمان بە داوود پێغەمبەر بەخشیوە.

هەروەها لە سورەتی (الأنعام) نەسەبی دیاری کردووە کە دەگەڕێتەوە سەر ئیبراهیم نەک نوح سەلامی خوایان لێ بێت.

﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ٨٤﴾ الأنعام

واتە: ئیسحاقمان بە ئیبراهیم بەخشی کاتێک کە خۆی و سارەی خێزانی بێئومێد بوون لە منداڵ، لە نەوەی ئیسحاقیش یەعقوبیشمان پێی بەخشی و کوڕەزای خۆی بینی هیدایەتی هەموویانمان دا، پێش ئەمانیش هیدایەتی نوحمان دا، لە نەوەی ئەمانیش داوودو سولەیمان و ئەیوب و یوسف و موسی و هاروون هیدایەتی هەموومان داون و هەموومان کردوون بە پێغەمبەر بەم شێوازە پاداشتی چاکەکاران ئەدەینەوە.

پاشان لە سورەتی (الأنبیاء) خوای گەورە باسی دەرد و نەخۆشی و بواری کۆمەڵایەتی و نەخۆشییەکەی دەکات و دەفەرموێت: ﴿۞ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ۝٨٣ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّۖ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ۝٨٤﴾ الأنبياء

واتە: ئەیوب پێغەمبەر کاتێک لە خوای گەورە پاڕایەوە کە من تووشی نەخۆشییەکی سەخت بووم هەر تۆ خوایە لە هەموو بەڕەحم و بە سۆزەکان بەڕەحم و بەسۆزو میهرەبانتری۝٨٣ ئێمەش وەڵاممان دایەوەو ئەو نەخۆشییەی کە هەیبوو لامان برد لەسەری و شیفامان دا، خێزان و کەسوکاریشیمان بۆ گەڕاندەوە هاوشێوەی ئەوەیشی کە هەیبوو بۆیمان گەڕاندەوە، یاخود منداڵی ترمان پێی بەخشی، ئەم شتانەمان بە ئەیوب بەخشی ڕەحمەت و میهرەبانیەک بوو لە ئێمەوە یادخستنەوەیەکیشە بۆ ئەو کەسانەی عیبادەتی خوای گەورە ئەکەن تا ئارامگر بن وەکو ئەیوب۝٨٤

لە کۆتاییدا خوای گەورە لە سورەتی (ص) دیمەنی چاک بوونەوەیمان نیشان دەدات و دەفەرموێت:

﴿وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيْطَٰنُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ۝٤١ ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَۖ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ۝٤٢ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ لِأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ۝٤٣ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْۗ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًاۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ۝٤٤﴾ ص

واتە: ئەی محمد تۆ یادی ئەیوب پێغەمبەریش بکە کاتێک بانگی لە پەروەردگاری کردو لێی پاڕایەوە، وتی: من شەیتان تووشی ماندوویێتی و سزای کردووم بەهۆی نەخۆشی و ئەو شتانەوە، کە گەڕاندیەوە بۆ شەیتان لەبەر ئەوەی شەیتان هۆکار بووە، ئەوتریّ: شەیتان وای لیّ کردووە بەخۆی سەرسام بێت، خوای گەورە نەخۆشی خستووە، لێرەش دیسان لەم چیرۆکەش (ئیسرائیلیات) هەیە کە گوایە هەموو لەشی بۆتە برین تەنها دڵی نەبێت و بێزیان لیّ کردۆتەوەو

کەسوکاری فڕێیان داوەتە سەر زبڵدان، ئەمانەش بەهەمان شێوە هیچی ڕاست نییە﴿١١﴾ خوای گەورە فەرمووی: بە پێیەکانت ڕابکەو بیدە بە زەویدا ئەمیش وای کردو ئاوێکی بۆ هەڵقووڵاندو فەرمووی: بەناو ئەم ئاوەدا بڕۆ و خۆتی پێ بشۆرە ئەمە ئاوێکی ساردو سازگارە، دواتر لێشی بخۆرەوە بەوە چاک ئەبیتەوە یەکسەر چاک بووەوە لەو نەخۆشیە کە هەژدە ساڵ نەخۆش بووە﴿١٢﴾ کەسوکاریشیمان بۆ گێڕایەوە، ئەوتریش: مردوون خوای گەورە زیندووی کردونەتەوە، یاخود کۆی کردونەتەوە لە دوای ئەوەی بڵاو بوونەتەوە، هاوشێوەی ئەوانەیشی لەگەڵیاندا پێ بەخشیوە، وەکو ڕەحمەتێک لە خوای گەورەوە بەهۆی ئارامگرتن و سوپاسگوزاری و ڕازی بوونی وەکو یادخستنەوەیەکیش بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەن عەقڵ و ژیرین کە بزانن سەرەنجامی ئارامگرتن خۆشگوزەرانی و دەرووی خێرو بردنەوەیە ﴿١٣﴾ هەندێک پووش یان پەلە دار خورمایە بگرە بەدەستەوەو بەو شێوازە لێی بدە بۆ ئەوەی سوێندەکەت نەشکێت و ئەویش ئێش و ئازاری پێ نەگات. ئێمە بینیمان ئەیوب کەسێکی زۆر ئارامگر بوو باشترین بەندە بوو زۆر بۆ لای خوای گەورە ئەگەڕایەوە ﴿١٤﴾

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: زۆرترین ئازار و ناڕەحەتی و سوێ بەسەر پێغەمبەراندا دێت، ئەوانەی شوێنکەوتووی پێغەمبەران واتا چاکەکاران و پاشان ئەوان هاوشێوەی ئەو چاکەخوازانەن[٨].

---

[٨] سَعدُ بنُ أبِي وقَّاص رضِيَ اللهُ عَنه: "قلتُ: يا رسولَ الله، أيُّ النَّاس أشَدُّ بَلاءً؟" أي: مَن أثقَلُ النَّاسِ ابتلاءً وأشَدُّهم مَصائبَ وبَلايا؟ قالَ النَّبيّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: الأنبيَاءُ" أي: "أَشَدُّ النَّاسِ المُبتَلِينَ وأثقَلُهم بَلاءَ ومَصائَبَ وبَلايا هم الأنبيَاء، "ثمّ الصّالحونَ، ثمّ الأمثَلُ فالأمَثَلُ"/الترمذي.




أيوب عليه السلام
بوشنییه: نێوان دیمەشق و ئەزرەعات
(دەوترا لە باکووری نێوان کەنداوی
عەقەبەدایە)

هەروەها فەرمووی: هەموو کەسێک بە گوێرەی پابەند بە دینەکەیەوە تاقی دەکرێتەوە، چەندە پابەند و باش بێت لەخواناسی و دینداریدا ئەوەندە تاقی کردنەوەکەی سەختر دەبێت[٩].

## قووڵ بوونەوە لە بەشێک لە ڕووداوەکانی ژیانی

لە سفری ئەیوب دا هاتووە کە حەزرەتی ئەیوب زۆر دەوڵەمەند بووە، خاوەنی هەزارەها سەر مەڕ و وشتر و مانگا بووە، بێجگە لە زەوی و زار و خاک و ماڵ و دەست و پێوەند و خزمەتکار و کۆیلە!

لەخاکی (البثنية) کە بە حۆران کەوتۆتە نێوانی دیمەشق و ئەو زەرعاتانە لەو خاک و نیشتمانەدا جێگیر بووە.

ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە لەناو گەلێکدا هاتووە کە زۆر خۆشیان ویستووە هاوکاری هەژار و بێوەژن و منداڵانی بێ باوک بووە، هیچ کات بەتەنها نانی نەخواردووە، هەر لە خۆشەویستی و چاکی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە هەموو گەلەکەی و ناوچەکە خواناس و دیندار بوون، ئەم پێغەمبەرە ئازیزە بەڵاو موصیبەتێک کە ڕووی تێدەکات لەخۆی و ماڵومنداڵییەوە دەست پێدەکات، خەڵکی سەرزەنشتی دەکەن بەوەی کە پێغەمبەر نییە!

لە کیتابی پیرۆزدا هاتووە کە لەگەڵ سێ کەس لەناودارانی ئەو ناوچە دەکەوێتە گفتوگۆ و ئەوانیش، سەرزەنشتی دەکەن ئەگەر پێغەمبەرە بۆ تووشی ئەم هەموو ئازار و ناڕەحەتی و بێ کەسیە بووە، ئەویش وەڵامیان ئەداتەوە لەوپەڕی لۆژیک، پاشان لەسەر و عەقڵانیەتەوە باسی ئیمان بە خوای پەروەردگاریان بۆ دەکات.

ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشا وتەکانی ئەیوب پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ لە کیتابی پیرۆز دا زۆر باسی حیکمەت و نموونەی زۆر جوانی عەقڵانی فەلسەفی دەکات بۆ هاوڕێکانی یان بۆ خەڵکی ناوچەکە کە لە دوای ئەو ناڕەحەتییە بۆچی بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەن، وتەکانی چەندە ڕووناکی وەحی پێوە دیارە لە کتێبی پیرۆزدا، ئەوەندەشی باسەکانی عەقڵانی و شیکاری ڕەخنەی سێ قسە کەرەکەیە بەناوی (أليفاز التيماني، بلدد الشوحي، صفور النعماني)، وتەکانی ئەمان و وەڵامدانەوەی ئەیوب زۆر جوان و ناوازەیە لەسفری ئەیوبی ڕاستگۆدا، بەڵام ئەگەر بهاتینایە تەنها بمانگواستایەتەوە بۆ ناو ئەم کتێبە تامی مێژووی ژیانی ئەیوب عَلَيْهِ السَّلَامُ-ی لەدەست ئەدا و دەبووە وەرگێڕانێک بۆ سفری ئەیوب لە کیتابی پیرۆزدا.

---

[٩] فيبتلى الرّجلُ على حسْبِ دينِه، فإن كانَ في دينهِ صلبًا اشتدَّ بلاؤُه.

دێینەوە سەر باسی مێژووی ژیانی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە، لە مێژووی ئەهلی ئیسلامدا هاتووە کە لە دوای دەوڵەمەندی زۆر بەرشکست دەبێت، پاشان ماڵومنداڵی لەدەست ئەدات. لە سفری ئەیوب دا هاتووە خاوەنی ٧ کوڕ و سێ کچ بووە، هەموو ئەمانە لە دەست ئەدات، پاشان تووشی نەخۆشی پێست دەبێت لە تەفسیری (المراغي) نووسەرەکەی (أحمد مصطفى المراغي) وا دەڵێت: ئاماژەیە بۆ نەخۆشی پێست، وەکو گەڕی و گولی و ئەکزیما، تووشی نەخۆشی پێست بووە، نەک نەخۆشی ناوەکی وەکو گورچیلە، جگەر و دڵ و...هتد. ئەم نەخۆشییەش کوشندە نییە، بەڵام بێزارکەر و لەناو خەڵکی قێزەونە، بەڵام ئازاری زۆری هەیە بۆ نەخۆشەکە، ئەیوب پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ تووشی نەخۆشی پێست ببوو کە بۆندار بوو، وای لێ کردبوو بۆنێکی ناخۆش لە لاشەی دەردەچوو، کە ناچار بوو لەناو کۆمەڵگەدا ئەم نەخۆشییە سێساڵی خایاند، کۆمەڵێک لە مێژوو نووسان دەڵێن ٧ ساڵی خایاندووە، لە ئیبن کەسیرەوە هاتووە کە دەڵێت: ٧ ساڵ لەلایەن (ئەنەس)ەوە وتراوە.

تەنانەت ئەوەندە هەژار کەوت توانای کارکردنی نەما، خێزانەکەی کاری دەکرد، خەڵکی لەبەر حورمەتی ئەیوب ترسان لەوەی کە بەڵایان بەسەر نەیەت کارو ئیشیان ئەدایە هاوسەری پێغەمبەر ئەیوب عَلَيْهِ السَّلَامُ.

لەگەڵ ئەوەی خەڵکەکە دەیانزانی کە پێغەمبەرە، لە سفری ئەیوب دا هاتووە تانەو تەشەریان لە ئەیوب ئەدا و دەیانوت تۆ ئەگەر پێغەمبەری بۆچی خۆت لەم ناڕەحەتی و نەخۆشییە ڕزگار ناکەیت، ئەویش نەیدەویست قەدەری خوای گەورە لەسەر خۆی بگۆڕێت، چاوەڕێی خێر و پاداشت بوو کە بێتە سەر چاکە و حەسەناتی، بێجگە ئەو تانەو تەشەر دانە، ماڵومنداڵی لەدەست دابوو بێجگە هاوسەرەکەی ئەوەندە ئارامگر بوو، تەنانەت ئێستاش لەم سەردەمەدا کەسێک تۆزێک ئارامگر بێت نموونەی حەزرەتی ئەیوب-ی لەسەر دەهێننەوە و دەڵێن: سەبری ئەیوبی هەیە!

کەواتە ئەوەندە ئارامگربووە!

لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە دوو هاوڕێی ئەیوب بەیەکەوە ئاخافتنیان کردووە، وتوویانە ئەیوب تاوانێکی کردووە کە هیچ کەس تاوانی وا گەورەی نەکردووە، ماوەی ١٨ ساڵە خوا تووشی ناڕەحەتی و ئازاری کردووە، ئەیوب کە بە قسەی دوو هاوڕێکەی دەزانێت سەردەکاتە سەر سوجدە و دەڵێت: خوای پەروەردگارم زاتی پیرۆزت زاتی بەرزو پیرۆزت دەزانیت کە هیچ کات تێر سکی خۆم خواردنم نەخواردووە ئەگەر زانیبێتم لە جێگایەکدا سک برسییەک هەبووە تا چووم هاوکاریم کردووە، پاشان فەرمووی پەروەردگارم زاتی بەرزت دەزانیت کە خاوەنی دوو کراسم بوو‌بێت کراسێکم بەخشیوە بە کەسێک کە ڕووت و ڕەجاڵ بووە، پاشان لە دوو هاوڕێکەی خۆش بووە لەبەر وتەکانیان، یان لە فەرموودەیەکی لاوازدا کە بەرزکرایەوە دەڵێت:

ئەو دوو کەسە برای ئەیوب بوون، ئەوەندە بۆنی ناخۆشیّ لێهاتووە بۆ سەردانی چوون نەیانتوانیوە لەلایدا بمێننەوە، پاشان سەری کردۆتە سەر سوجدە و کڕنوشی بردووە، ئەو دوعایەی کردووە و فەرمویەتی: سەربەرزناکەمەوە تاکو خوای گەورە ئەم ناڕەحەتی و نەخۆشییەم لەسەر لانەبات، خوای گەورەش وەحی بۆ کردووە و فەرمویەتی:

﴿ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾﴾ ص

واتە: خوای گەورە فەرمووی: بە پێیەکانت ڕابکەو بیدە بە زەویدا ئەمیش وای کردو ئاوێکی بۆ هەڵقووڵاندو فەرمووی: بەناو ئەم ئاوەدا بڕۆ و خۆتی پێ بشۆرە ئەمە ئاوێکی ساردو سازگارە، دواتر لێشی بخۆرەوە بەوە چاک ئەبیتەوە یەکسەر چاک بووەوە.

پاشان کە هاوسەرەکەی گەڕاوەتەوە بۆلای خوای گەورە چاکی کردۆتەوە، نەیناسیوەتەوە کە ئەیوبی هاوسەریەتی، بە ئەیوب-ی وتووە ئەی بەندەی خوا کەسێک لەم ناوەدا بوو تووشی نەخۆشی و ناڕەحەتی بووبوو نازانی چووە بۆکوێ یاخود نەت بینیووە؟

ئەیوبیش وەڵامی ناداتەوە بۆ ئەوەی زیاتر لەگەڵی بڕوات و بۆی بکاتە خۆشییەکی لە ناکاو و کوتوپڕ، بەڵام هاوسەرەکەی دەڵێت: زۆر دەترسم سەگ و گورگ خواردبێتیان، چونکە لە جێگایەکدا بوو دوور لە کۆمەڵگەو خەڵکی.

ئینجا ئەیوب فەرمووی: ئەی ماڵئاوەدان منم ئەیوب!

هاوسەرەکەی دەڵێت: ئەی بەندەی خوا گاڵتەم پێ دەکەیت؟ ئەیوب دیسان دەڵێت: ماڵئاوەدان من ئەیوب-م، خوای پەروەردگار لاشەی ساغی بۆ گەڕاندمەوە. لەفەرموودەیەکی تردا لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕیتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی خۆشۆردندا خوای گەورە لە شێوەی کوللەدا ئاڵتونی بۆ دەنارد و پاشان هەڵیگرتەوە و خستییە ناو جلەکانی، خوای گەورە فەرمووی: بەست نییە ئەو هەموو ئاڵتونە پێی تێر نەبوویت؟

ئەیوبیش فەرمووی: خوایە گیان کێ تێر دەخوات لە ڕەحمەتی زاتی بەرزت؟

ئەم فەرموودانە لە (البداية والنهاية) داهاتووە، هەروەها لە (قصص الأنبياء) دا هاتووە کە ئیبن کثیر نووسیوویەتی و سەنەدی فەرموودەکانیش دیاری کراوە.

هەرچەندە ئەوەی کە وتراوە لەناو خۆڵ و خاشاکی ماڵەکاندا فڕێدراوە و گوایە لاشەی بۆنی ناخۆشی لێهاتووە، ئەمە جێگای باوەڕ نییە، چونکە خوای گەورە پێغەمبەرانی بەو شێوەیەی لێ ناکات، نەخۆش نەکەوتووە بەڵام بۆنی نەهاتووە (والله اعلم)[١٠].

## خێزانی ئەیوب و ١٠٠ قامچییەکە

لەدوای چاک بوونەوەی خوای گەورە منداڵی تری بەخشییەوە حەزرەتی ئەیوب و ماڵوسەروەت و سامانی زۆری بۆ گەڕاندەوە، هەرچەندە زانایان دەڵێن: لە ڕۆژی قیامەتدا هەموویان کۆدەکاتەوە ئەوەی کە مرد ناگەڕێتەوە، پاشان ئەیوب ٧٠ ساڵی تەمەنی لەخاکی ڕۆم دا بەسەر بردووە لەبانگەوازی ئایین حەنەفی ئیبراهیمی.

بەڵام دەشێت تەندروستی باش و سەروەت و سامان، خزمەتکار و ...هتد خوای گەورە پێی بەخشییەوە.

زۆرێک لە سەرچاوەکاندا هاتووە کە گوایە شەیتان خۆی لێکردووە بە حەکیم و پزیشک و بە پەلکەکانی ویستویەتی دەرمانی لێبکرێت کە ئەیوب پێی زانیوە سوێندی لێخواردووە کە ١٠٠ قامچی یاخود چەند قامچییەکی لێ بدات.

یاخود دەڵێن: پەلکەکانی بۆ خواردن فرۆشتووە بۆ ئەیوبی هاوسەری، ئەگەر بەگوێرەی ئەم دوو باسە مێژوویە بێت هاوسەرەکەی کارێکی خراپی نەکردووە، پەلکەی خۆی فرۆشتووە بە ژنانی دەوڵەمەند بۆ بەدەستهێنانی پارە بۆ هاوسەرەکەی، ئەمەش وەفایە هاوسەرەکەی پێویستە سوپاسی بکات نەک قامچی لێ بدات.

کەواتە ئەو وتانە هیچی جێگای باوەڕ نییە.

﴿وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ ۗ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾﴾ص

ئەوەی کە زانایان باسیان کردووە لە تەفسیرەکانیاندا ئەوەیە کە هاوسەری کاریگەری کۆمەڵگەی کەوتۆتە سەر پێدەچێت لە چەند ساتێکی لاوازدا، کارێکی وای کردبێت کە نازانین چییە، ئەویش سوێندی لێ خواردبێت کە دەبێت قامچی لێ بدات!

خوای گەورەش بەوەفایی ئەو خێزانەی باس دەکات و سوێندەکەی پێ هەڵدەوەشێنێتەوە بەوەی کە بە چەپکێ ڕێحانە یان گوڵ و گژوگیا یەکجار پێیدا بکێشێت، یاخود بە دیاری پێی

---

[١٠] ئەمەش وتەی زانایانی فەرموودەوانییە لە کتێبی (قصص الأنبياء والأخبار الماضين خلاصة: تأريخ إبن كثير) (للقاضي الشيخ محمد بن أحمد كنعان) لاپەڕە (٣٣٣).

ببەخشێت لە جیاتی لێدانەکەی خۆ ئەگەر ئەم چەپکە گوڵە یان گیایە یاخود ڕێحانەیشی پێدا کێشا بێت وەکو خۆشەویستی و بەخشینی دیارە بە هاوسەرەکەی چونکە بەوەفا بوو تا چاک بوویەوە جێی نەهێشت و خوای گەورە دوو کوڕی پێ بەخشیوە بەناوی (حومل و بشر) کە بشر دەبێتە پێغەمبەر و بەناوی (ذولکفل) دەناسرێت.

ئەوەی کە باسکراوە لە مێژووەکاندا گوایە ئەیوب ماوە ٩٣ساڵ ژیاوە، ئەمەش لە مێژووی طەبەریدا هاتووە. کۆی گشتی باسە لە گشتی ئەم پێغەمبەرەدا ئارامگرییە و گێڕانەوەی لە قورئان دا بۆ پێغەمبەری نازدار ﷺ بۆ ئەوە بووە کە زیاتر خۆڕاگربێت لەبەرانبەر قورەیش دا ئینجا بە ئازاری برا پێغەمبەرەکانی بزانێت، بۆیە زۆرێکیان بە کورتی لە قورئان دا باس کراون، باسکردنی ئەم پێغەمبەرە عەزیزانە بۆ چاولێکردن و پەند و وانە وەرگرتنە لێیانەوە، هەروەها لە ڕووی مێژوویشەوە گرنگە بزانین چونکە بەرپەرچدانەوەی بێ دین و خوانەناس و مولحیدەکانە کە زۆرجار بەوە گومان دروست دەکەن کە بۆچی پێغەمبەران تەنها لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە هاتوون لە کاتێکدا ئەیوب بە پێغەمبەری ڕۆم ناسراوە؟

## ڕووداوی ژیانی ذولکفل

ئەم پێغەمبەرە لە دوو جێگادا خوای گەورە لە قورئان دا ناوی هێناوە ئاماژەی بەناوەکەی داوە، ڕووداوی ژیانی زۆر نادیار و ناڕوونە. زۆرێک لە مێژوونووسان وتوویانە کە گوایە پێغەمبەر نەبووە، بەڵام خوای گەورە کەناوی هێنا لەگەڵ پێغەمبەراندا ناوی هاتووە، خوای موتەعال دەفەرموێت:

﴿وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٦﴾﴾ الأنبیاء

واتە: ئیسماعیل و ئیدریس (وَذَا الْكِفْلِ)، هەموو ئەمانەش ئارامگر بوون و ئارامیان گرتووە﴿٨٥﴾ ئەمانەشمان خستۆتە ناو ڕەحمەتی خۆمان واتە: پێغەمبەرایەتی، پێغەمبەرایەتی یان بەهەشتمان پێ بەخشیون، هەموویان لە پیاوچاکان بوون﴿٨٦﴾

لەباسی دووەمدا لە سورەتی (ص) دەفەرموێت:

﴿وَٱذۡكُرۡ عِبَـٰدَنَآ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَـٰقَ وَيَعۡقُوبَ أُوْلِي ٱلۡأَيۡدِي وَٱلۡأَبۡصَـٰرِ﴿٤٥﴾ إِنَّآ أَخۡلَصۡنَـٰهُم بِخَالِصَةٖ ذِكۡرَى ٱلدَّارِ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّهُمۡ عِندَنَا لَمِنَ ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ٱلۡأَخۡيَارِ﴿٤٧﴾ وَٱذۡكُرۡ إِسۡمَـٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ وَكُلّٞ مِّنَ ٱلۡأَخۡيَارِ﴿٤٨﴾﴾ ص

واتە: تۆ یادی ئەم بەندانەی ئێمە بکەوە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب کە ئەمانە دەستێکی باڵایان هەبووە لە کردەوەی چاک و پەرستندا، چاکەی زۆریان هەبوو بەسەر خەڵکەوە، خاوەن بینایی بوون و حەق بین بوون و زانیاری و شارەزاییان هەبووە لە دیندا﴿٤٥﴾ ئەمانمان تایبەت کردووە بەوەی کە بیریان لای دونیا نەبووە بەڵکو تایبەت یادی قیامەتیان کردۆتەوەو کاریان بۆ قیامەت کردووەو خۆشەویستی دونیامان لە دڵیان دەرکردووەو خۆشەویستی قیامەت و بەهەشتمان خستۆتە دڵیانەوە﴿٤٦﴾ ئەمان لەلای ئێمە لەو کەسانە بوون کە لەناو چاکەکاراندا هەڵمانبژاردوون و چاکەکار بوون﴿٤٧﴾ یادی ئیسماعیل و (ئیلیەسەع) بکەوە، کە وتراوە: (خضر) بووە، یاخود هاوڕێی (ئیلیاس) بووە یادی (ذا الكفل)یش بکە کە پیاوێکی چاک بووە لە بەنی ئیسرائیل وتراوە: پێغەمبەر بووە ئەمانە هەموویان لە پیاوچاکان بوون﴿٤٨﴾

لەڕاستیدا ئەم ئایەتانە هەموو بەڵگەی پێغەمبەرایەتی نیشان ئەدەن، زۆرێک لە مێژوونووسان بە پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل لە قەڵەمیانداوە. ئەمەش وەک نووسەر زۆر بە دووری دەگرم، چونکە هیچ پەیوەندی بە کوڕانی حەزرەتی یەعقوبەوە نییە کە ناسراون بە (الأسباط)، بەڵام لە بەشی عیصۆی کوڕی ئیسحاقەوە کوڕی حەزرەتی ئەیوبە و ئەیوبیش خەڵکی ناوچەی ئەنادۆڵە و لە کوڕانی عیصۆ لە (ڕۆمیانە) واتا عیصۆ کوڕێکی هەبووە ناوی ڕۆم بووە، دەشێت ناوی کوڕەکەی عیصۆ (ڕۆم) تێکەڵاو بووبێت بە خەڵکی وڵاتی ڕۆم، چونکە پێشتر ئاماژەمان پێداوە زۆر دێرینە هێشتا وڵاتی ڕۆم دروست نەبوو، ناوناوبانگی نییە و نەبۆتە شارستانییەت تا ئەو ساتە وەختە، لێرەوە دەستپێکی شارستانیەتی قیبطی فیرعەونی دەست پێدەکات و پاشان فینیقییەکان و پارسیا و ئینجا گریک کە لە سەردەستی ئەسکەندەری مەقەدۆنی داڕێژەری ئیمپراتۆریەتی گەورە دەبێت، بۆ ئەم سەردەمەش بەلای کەمەوە (١٤٠٠-٢٠٠٠) ساڵمان ماوە بە گوێرەی قۆناغەکانی مێژوو کە شارستانییەتەکان دروست بوون بەراوردیان لەگەڵ مێژووی پێغەمبەران لە قورئان و کتێبی پیرۆزدا، ذولکفل کوڕی حەزرەتی ئەیوبە سەلامی خوا لەهەموویان بێت. لەدوای باوکی هەر لەو ناوچەدا ماوەتەوە لە شام مردووە واتا لە دیمەشقی ئێستا و نزرگاکەشی هەرلەوێیە، هەندێک لە سەرچاوەکان دەڵێن: گوایە لە نەجەف-ە، ئەمەش وتەی شیعەکانە و هیچ ڕاستی پێوە نییە.

چونکە شیعە خاوەنی هیچ سەنەد و کتێبێکی موعتەبەر نییە، هەموو بنەمای مێژوویی تەنانەت ئوصولیشیان لەسەر خورافات دامەزراند، هەڵبەت ئەم وتەیە (د. علی شەریعەتی) دەفەرموێت: لە ڕەخنە لە ئەهلی شیعە و سوننە، بە شیعە دەڵێت: واز لە خورافات بهێنن دەگەن بە ئەهلی سوننەت، ئەهلی سوننەتیش واز لە دەمارگیری بهێنێت دەگات بە ئەهلی شیعە!

هەندێکی تر ذولکفل-یان بە حەزقیال داناوە کە لە کتێبی پیرۆزدا ئەویش خاوەنی سفری تایبەتی خۆیەتی بەناوی (سفری حەزقیال) کە ئەمەش لە ڕووی مێژوویی و نەسەب و لۆژیکەوە یەک ناگرێتەوە. حەزقیال پێغەمبەرێکی چاکساز بووە بۆ ناو بەنی ئیسرائیل و بانگەوازی تەنها بۆ خودی نەوەی ئیسرائیل بووە کە ئەو دەمە خاوەنی دەوڵەتی بەهێزی میزۆپۆتامیا تا دەگاتە تەیماء لە وڵاتی عەرەب کە بە هیلالی جوولەکە ناسراوە ئەویش لەکاتی خۆیدا باسی دەکەین بە پشتیوانی خوای موتەعال.

ذولکفل زانایان لە مێژووی ژیانی پێغەمبەراندا و ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن بەواتای ئەوەبووە کە زۆر نوێژ و ڕۆژوو و زیکری کردووە، زۆر خۆی وابەستە کردووە بە بەندایەتی و خواناسی زۆرەوە بۆیە ناونراوە ذولکفل، چونکە خۆی کردۆتە کەفیلی ئەو بەندایەتییانە بۆیە ئەو نازناوەی وەرگرتووە بەوەفا بووە بەرانبەر بە (کەفیلەکەی) تا ئەو کاتەی وەفاتی کردووە بەردەوام بووە لەسەر بەندایەتییەکانی.

## خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ ذولکفل

خوای گەورە لە قورئان دا باسی گەل و هۆزی زۆری کردووە کە لە ناوچوون لە نموونەی (هۆزی ڕەس) (أصحاب الرس).

﴿وَعَادًا وَثَمُودَاْ وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونَۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ۝٣٨ وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ ٱلْأَمْثَٰلَ ۖ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ۝٣٩﴾الفرقان

واتە: قەومی (عادو ثمود) و هاوەڵانی بیرەکەیش، چەندەها ئوممەتی تر لەم نێوانانەدا خوای گەورە هەموویانی لەناو بردووە کە ئیمانیان نەهێناوە۝٣٨[11] هەموو ئەمانەمان ترساندووەو

---

[11] کە بیرێك بووە ئەووترێ: لە دێی (فەلج) لە (یەمامە)، یاخود لە (ئەنطاکیا)، یاخود لە (ئازەربیجان) بووە، کە قەومێکی بتپەرست بوونەو پێغەمبەرەکەی خۆیان بە درۆزانیوەو کوشتوویانەو خستوویانەتە ناو بیرەکەوە، بۆیە پێیان وتراوە: هاوەڵانی بیر، خوای گەورە لە ناوی بردوون، یاخود (أصحاب الاخدود) بوونە ئەوانەی کە خوای گەورە لە سورەتی (البروج) باسیان دەکات، یاخود وتراوە: قەومی شوعەیب پێغەمبەر/ تەفسیری ڕێبەر.

نموونەو بەڵگەمان بۆ هێناونەتەوەو بیانوومان بڕیون کە ئیمانیان نەهێناوە هەموویانمان لەناو بردووە﴿٣٩﴾

﴿وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَانُ لُوطٍ ﴿١٣﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ ۚ كُلٌّ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ﴿١٤﴾﴾ ق

واتە: لە پێش کافرانی قوڕەیشیشدا قەومی نوح پێغەمبەری خۆیان بەدرۆزانی، هاوەڵانی بیرەکە و قەومی (ثمود)﴿١٢﴾ قەومی (عاد)یش کە خوای گەورە هود پێغەمبەری بۆ ناردبوون، قەومی فیرعەونیش کە مووسای بۆ ناردبوون قەومی (لوط)یش کە لوط لە خۆیان بوو پێغەمبەرەکەی خۆیان بەدرۆ زانی﴿١٣﴾ هاوەڵانی دارەکە قەومی (توببەع)یش هەر هەموو ئەمانە پێغەمبەرانی خۆیان بەدرۆ زانیوە بۆیە هەڕەشەو سزای خوای گەورە جێبەجێ بوو بەسەریاندا، بۆیە با کافرانی قوڕەیشیش ئاگادار بن ئەگەر ئیمان نەهێنن خوای گەورە توانای هەیە ئەمانیش وەکو ئەو نەتەوانەی تر لەناو بدات﴿١٤﴾

دەشێت یەکێک بووبێت لەم پێغەمبەرانەی کۆ بۆ هۆزی (ڕەس) ون و خوای گەورە هاوشێوەی گەلان و هۆزەکانی عاد و ثەمود و ئەیکە و لوط...هتد، لەناوچوون. لێرەدا خوای گەورە باسی ئەوەمان بۆ دەکات لەباسی حەزرەتی مووسادا کە گەلانێکی تر لەناوچوون، دەفەرموێت:

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ ٱلْأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾﴾ القصص

واتە: بەدڵنیایی ئێمە تەوراتمان بە موسی بەخشی، لە دوای ئەوەی کە چەندەها ئوممەتانی کافری پێشترمان لەناو برد، کە ئەو تەوراتە چاوڕۆشنایی بوو بۆ خەڵکی سەردەمی خۆی کە حەقیان پێی ئەدۆزیەوە، هیدایەت بوو بۆ حەق و ڕەحمەت بوو لەلایەن خوای گەورەوە بۆ خەڵکی، بەڵکو خەڵکی یادی خوای گەورەو شوکرانە بژێری نیعمەتەکانی بکەن﴿٤٣﴾

خوێندنەوەی ئەم باسە دەبەستینەوە بە گریمانێکەوە کە باسی نەکردووە، بۆچوونێکی ناکامڵی خۆمە (نووسەر) کە پێم وایە ذولکفل یەک پێغەمبەر نەبووە، دەشێت چەند پێغەمبەرێک بووبن کە بەدوای یەکدا هاتبن و کەفالەتی ناوچەکەیان کەوتبێتە سەرشان و لە نەوەی حەزرەتی ئەیوب بن، ذولکفل سێ پێغەمبەر بوون بەناوی (صادق، مصدوق و شلوم)، ئەم پێغەمبەرە بۆ ناوچەی

(ئەنطاكيا) نێردراون، کەفالەتی ئەو ناوچەیان لە ئەستۆ گرتووە، بەڵام کە خەڵکی ئەنطاكيا بەدەم بانگەوازی ئەو سێ پێغەمبەرە بەرێزەوە نەچوون، خوای گەورە لەناوی بردوون.

هەروەک چۆن پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل ناسراون بە نەوەکانی یەعقوب (الأسباط) ئەم سێ پێغەمبەرەش ناسراون بە ذولکفل خوای موتەعال بە ڕوونی بۆمان باس دەکات لە قورئان دا دەفەرموێت:

﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ﴿١٤﴾ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ﴿١٥﴾ قَالُواْ رَبُّنَا يَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَيۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيۡنَآ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴿١٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ﴿١٨﴾ قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ﴿١٩﴾ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴿٢٠﴾ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴿٢١﴾ وَمَالِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴿٢٢﴾ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ﴿٢٣﴾ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ﴿٢٤﴾ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ﴿٢٥﴾ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴿٢٧﴾ * وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾﴾ يس

واتە: ئەی محمد صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ تۆ نموونەی هاوەڵانی ئەو شارەیان بۆ بێنەوە کاتێک کە پێغەمبەرانی خوای گەورە بۆ ئەو دێیە ڕۆیشتن﴿١٣﴾[١٢] خوای گەورە ئەفەرمووێ: دوو پێغەمبەرمان بۆ ناردن، بەڵام خەڵکی شارەکە بەدرۆیان زانین و باوەڕیان پێ نەکردن بەهێزمان کردن بە سێیەمیان و سێیەم پێغەمبەرمان نارد وتیان: ئێمە پێغەمبەرو نێردراوی خوای گەورەین بۆ ئێوە﴿١٤﴾ خەڵکەکە وتیان: ئێوە هیچ شتێک نین تەنها مرۆڤێکن وەکو ئێمە، بۆ وەحی بۆ ئێمە دانەبەزیوەو بۆ ئێوە دابەزیوە خوای گەورەی ڕەحمان هیچ شتێکی دانەبەزاندۆتە خوارەوە بۆ سەر ئێوە تا ببن بە پێغەمبەر، بەڵکو ئێوە تەنها درۆ ئەکەن لەوەی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی ئەکەن﴿١٥﴾ پێغەمبەران وتیان: پەروەردگارمان دەزانێت کە ئێمە بەدڵنیایی پێغەمبەرین و بۆ لای ئێوە

---

[١٢] زۆربەی زانایانی تەفسیر ئەفەرموون: (ئەنتاكيا)یە بەڵام (ابن كثير) لە کۆتایی تەفسیرەکە ڕەتی ئەکاتەوە کە (ئەنتاكيا) بێت وە بەڵگە دێنێتەوە کە شارێکی ترە، چونکە ئەم شارە خوای گەورە لەناوی بردن، بەڵام (ئەنتاكيا) یەکەم شار بووە کە ئیمانیان بە عیسا پێغەمبەرهێناوە/ تەفسیری ڕێبەر.

نێردراوین﴿١٦﴾ هیچ شتێکیش لەسەر ئێمە نییە تەنها گەیاندنی پەیامی خوای گەورە نەبێت کە بە ئاشکرا بۆتان ڕوون دەکەینەوە﴿١٧﴾ وتیان: باوەڕمان وایە کە ئێوە شوومن و هیچ خێرێکتان پێ نیەو تەنها شەڕو خراپەتان پێیە، ئەگەر واز نەهێنن لەم بانگەواز کردنە بۆ تەوحیدو یەکخواپەرستی خوای گەورە، ئەوا بەردبارانتان ئەکەین لەلایەن ئێمەوە سزایەکی زۆر بەئێش و ئازار دەتانگرێتەوە﴿١٨﴾ ئەوانیش وتیان: شوومی ئێوە بەهۆی کردەوەی خراپ و کوفری خۆتانەوەیە ئایا کاتێک ئێمە یادی خوای گەورەتان ئەخەینەوەو بانگتان دەکەین بۆ یەکخواپەرستی بە ئێمە ئەڵێن شوومن و هەڕەشەمان لێدەکەن بەڵکو ئێوە قەومێکن کە زیادڕەویتان کردووە لە تاوان کردندا﴿١٩﴾ کاتێک کە خەڵکی ویستیان پێغەمبەران بکوژن لەوپەڕی شارەوە پیاوێک بەڕاکردن دێت و کۆشش ئەکات بۆ ئەوەی سەریان بخات کە (حەبیبی نەجار) بوو پیاوێکی چاک بووە، عیبادەتی خوای گەورەی کردووەو زۆر خێرخواز بووە، هانی قەومەکەی دا موسڵمان بن و وتی: ئەی قەومی خۆم شوێن ئەم پێغەمبەرانە بکەون﴿٢٠﴾ شوێنی کەسانێک بکەون کە داوای پاداشت و پارە لە ئێوە ناکەن لەسەر گەیاندنی پەیامی خوای گەورە، ئەوان هیدایەتدراون لەلایەن خوای گەورەوە﴿٢١﴾ من چیمەو چی ڕێگری لە من ئەکات کە عیبادەتی ئەو خوایە نەکەم کە منی دروست کردووە وە هەر بۆ لای ئەویش ئەگەڕێنەوەو پاداشت یان سزامان دەداتەوە لەسەر کردەوەکانمان﴿٢٢﴾ ئایا جگە لە خوای گەورە من خوا گەلێکی تر بڕیار بدەم و بیانپەرستم کە ئەگەر خوای گەورە بیەوێ من تووشی زیانێک بکات ئەو خواگەلەی تر ناتوانن سوودێکم پێ بگەیەنن، یان ناتوانن لای خوای گەورە هیچ شەفاعەت و تکایەکم بۆ بکەن نایشتوانن ڕزگارم بکەن﴿٢٣﴾ ئەگەر من جگە لە خوای گەورە خواگەلێکی تر بڕیار بدەم و بیانپەرستم ئەوە بە دڵنیایی من لە گومڕابوونێکی زۆر ئاشکرادام﴿٢٤﴾ بە پێغەمبەرانی وت: ئەوە من ئیمانم بە پەروەردگاری ئێوە هێنا دەی ئێوە ببیستن و لای خوای گەورە شایەتیم بۆ بدەن﴿٢٥﴾ کە وای وت خەڵکەکە یەکسەر پەلاماریانداو کوشتیان، خوای گەورە ڕاستەوخۆ خستییە بەهەشتەوە، پێی وترا: فەرموو بچۆرە بەهەشتەوە وەکو هەموو شەهیدان کە لە پێناو خوای گەورە بکوژرێن یەکسەر شوێنی خۆیان لە بەهەشت نیشان ئەدرێ ئەمیش وتی: خۆزگە قەومەکەم ئێستا ئەیانزانی﴿٢٦﴾ کە چۆن خوای گەورە لێم خۆشبوو منی گێڕا لەو کەسانەی کە ڕێزم لێگیراوە تا ئەوانیش ئیمانیان بهێنایە، لە دوای مردنیشی پەرۆش و دڵسۆز بووە بۆ قەومەکەی تا ئیمان بێنن﴿٢٧﴾ خوای گەورە ئەفەرمووێ: لە پاش ئەمیش بۆ سەر ئەم قەومە هیچ سەربازێکمان لە ئاسمانەوە دانەبەزاندە خوارەوە کە تۆڵەیان لێبسەنێت و لەناویان بەرێت و هیچ شتێکمان دانەبەزاند، چونکە شایەنی ئەوە نەبوون کە لە ئاسمانەوە سزایان بۆ دابەزێنین﴿٢٨﴾ بەڵکو تەنها

دەنگێک بوو جبریل هاوارێکی کرد، ئەوان هەموویان مردن وەک ئاگرێک کە بکوژێتەوەو دامرکێتەوە﴿٢٩﴾

## درووستبوونی گەلی ئیسرائیل

بەبۆچوونی نووسەر لەمەودوا ناوی گەلی ئیسرائیل دەست پێدەکات لە دوای ڕووداوەکانی ئەیوب و ذولکفل، ئینجا پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل دەست پێدەکەن، لەدوای یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ پاشان نەوەکانی یەعقوب پێغەمبەر (الأسباط) لەدوای پێغەمبەر هەڵدەبژێرێت بۆ بانگەوازی جیهان، هەڵبەت لەدوای دەستکاری کردنیان و نەتەوە پەرستی خۆیان کە خوای گەورە هەڵیبژاردن بۆ ئەوەی بانگەواز بکەن، نەک هەڵبژێردراون لەبەر ئەوەی چاکترین بن لە مرۆڤی تر لە ڕووی لەشولارەوە، یاخود وەکو خۆیان دەڵێن هەموو نەوەکانی یەعقوب کوڕی خوان، پەنا بەخوا.

لەبەشی داهاتوودا باسی پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل و نەوەکانیان و دەسەڵاتیان دەکەین.

## مەملەكەتی سیانزەهەم
## گەلی ئیسرائیل و چەند پێغەمبەرێک

پێش چوونە ناوباس...

لەمێژووی ئیبن كەثیردا لەدوای ژیانی ئەیوب و ذولكفل جەنابی ئیبن كەثیر باسی ژیانی یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ-ی كردووە، كاتێک تەماشای مێژووەكانی تر دەكەین بەتایبەت ئیبن جەریری طەبەری و ئیبن ئەثیر باسیان نەكردووە، تەنانەت مێژووی پێغەمبەرانی ئیبن كەثیر كە قاضی محمد أحمد كەنعان ئامادەی كردووە ئەویش دوای خستووە بۆ سەردەمی دوای مووسا و هاروون و پێغەمبەرانی ئەسباط و تەنانەت دوای داوود و سولەیمانیش هێناویەتی، پاشان تەماشی كتێبی پیرۆزمان كردەوە ژیانی یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ بەهەمان شێوە زۆر لە سەردەمی دوای مووسا و هاروون و پێغەمبەرانی تر باسكراوە، حەزرەتی یونس لە پەرتوكی پیرۆزدا ناوی بە یۆنان هاتووە خاوەنی سفری تایبەتی خۆیەتی، جا بۆیە لێرەوە باسەكەی دوادەخەین بۆساڵی (٦١٠)ی پ.ز. پشت بە سەرچاوەی كتێبی پیرۆز دەبەستین بەهۆكاری ئەوەی ئیبن جەریری طەبەری لە مێژووەكەیدا باسی نەكردووە.

كەواتە ئێستا لە ساڵانی (١٤٠٠-١٣٥٠) پ.ز. كە سەردەمی زۆربوونی گەلی ئیسرائیل و هاتنی پێغەمبەر مووسا و هاروونە سەلامی خوا لەهەردووكیان بێت.

لێرەدا هەوڵمان داوە پشت بەم ساڵانە نەبەستین وەک ئارگۆمێنتێكی بەهێز و بەڵگەی تەواو، بەڵكو تەنها بۆ زانیاری خوێنەر كە بزانێت ئەم ساڵانە لە كتێبی پیرۆزەوە وەرگیراون، دەشێت ڕاست بێت و بە پێچەوانەشەوە دەشێت هەڵە بێت. هەرچەندە شوێنەوارناسەكان بەشێكی ئەم ساڵانە بەڕاست نازانن، كۆمەڵێكیش دەڵێن ڕاستە، لێرەدا بۆ ئێمە ساڵ گرنگ نییە وەكو ژمارە بەڵكو ڕووداوەكان گرنگە كە بتوانین بەڕاستی و دروستی بۆ خوێنەری بگوازینەوە.

لەوانەیە جێگای سەرنجی خوێنەر بێت بۆ لە كتێبی پیرۆزدا(ئینجیل) سەرچاوە وەردەگرین؟ بەڕاستی لەدوای قورئان و سونەت ئەو سەرچاوە زیاتر بە ڕاست دەزانم لە وتەی ئاركۆلۆژەكان كە وتەیان لەسەر شوێنەواری دێرینە، بەهیوای ئەوە ڕوون بێت لای خوێنەر.

## گەلی ئیسرائیل

وشەی گەلی ئیسرائیل جیاوازە لەگەڵ وشەی نەوەی ئیسرائیل، بەڵام جوولەکە تێکەڵی کردووە بۆ ئەجێندای سیاسی و دیمۆگرافی خۆی. نەوەکانی ئیسرائیل کوڕانی حەزرەتی یەعقوبن، گەلی ئیسرائیل شوێنکەوتووی پێغەمبەرانی ئەسباط-ن کە لە دوای حەزرەتی یوسف دەست پێدەکات بۆ حەزرەتی مووسا سەلامی خوایان لێ بێت.

مەرج نییە گەلی ئیسرائیل هەموویان عیبرانی بن، بەڵکو شوێنکەوتووی ئایینی عیبرانین بە هۆکاری ئینتیمایان بۆ دینەکە ناونراون بە گەلی ئیسرائیل، چونکە ناگونجێت و جێگای باوەڕ نییە لەماوەی سێ پشت بۆ چوار پشت نەوەکانی یەعقوب بگەنە دەیان هەزار کەس!

بەڵام ئەگەر تەفسیری بکەین بەوەی کە گەلی ئیسرائیل تێکەڵاوە بەهەموو نەتەوەکانی تری ئەو چواردەورە ئەوە بە دڵنیاییەوە زۆر گونجاو و لۆژیکە کە لە ماوەی ژیانی چوار پێغەمبەردا بەدواییەکدا ئەو خەڵکە زۆرە کۆبووبێتەوە لەو ئایینەی کە ئیبراهیم، ئیسحاق، یەعقوب و یوسف سەلامی خوایان لێبێت بانگەشەیان بۆ کردووە.

حەزرەتی ئیبراهیم ساڵانێکی تولانی گەڕایەوە بۆبڵاوکردنەوەی تەوحید و خواناسی لەنێوان عێراق، شام، حیجاز و میصردا پاشان ئیسحاق و یەعقوب و یوسف کەواتە زۆر ئاساییە کە گەلی ئایینی ئیسرائیل زۆربووبێتن.

پێدەچێت ڕستەکە ئاوا ڕاستر بێت بڵێین (گەلی ئایینی ئیسرائیل)، چونکە لەناو ئەو گەلەدا خەڵکی تریشی تێدابووە کە ئیمانی بە مووسا هەبووە و شوێنی کەوتووە، وەکو ئیماندارەکانی بنەماڵەی فیرعەون، ئەهلی مەدیەن کە یەهود بەوانە دەڵێت (ئەشکەناز) بێجگە ئەو ناوانە جیاوازی کلتوری ڕۆشنبیری لەناو گەلی یەهود دا زۆرە کە ناسراون بە (میزاحی، سەفاردی، ئەشکەناز، تەقویمی...هتد). کەواتە لەمەودوا کە باسی گەلی ئیسرائیلمان کرد بە واتای شوێنکەوتوانیانە نەک نەوەکانی یەعقوب، چونکە نەوەکانی ئیسرائیل یان پادشا بوون یاخود پێغەمبەران یان ئەوانە بوون کە دەزگای ئەم دینەیان بەڕێگاوە دەبرد لە نەوەکانی ئیسرائیل، زاناکانیان ئەوانەی کەنیسەکانیان بەڕێوە دەبرد، یاخود ماڵی (میدراس) یان خێمە و چادری کۆبوونەوە یاخود بەیکلی پیرۆز و بەیکلی (دوم) کە لە قودس-ە بە بەڕێوەبەرانی پەیکەری سولەیمان ناسراوە، یان ڕێبەرەکانیان ڕێبەری سینا و کرمل و بەیکل ئەمانە هەموو شاخن، زۆر شتی تریش کە باسمان کرد دەبێت بە دەست نەوەکانی ئیسرائیلەوە بێت، بەڵام بەگشتی شوێنکەوتوانیان ناسراون بەگەلی ئیسرائیل.

## جیاوازی نێوان گەل و نەوەی ئیسرائیل

تاڕادەیەک بۆ خوێنەر ڕوونکراوەتەوە لە ڕابردوودا کە جیاوازی نێوان چینەکانی گەلی ئیسرائیل چییە و چۆنە، ئەوەی کە گرنگە ئاماژەی پێ بدەین ئەوەیە کە نەوەکانی ئیسرائیل لەلایەن خواوە هەڵبژێردراون بۆ بانگەوازی ئایینی خوای پەروەردگار لەو ماوەیەدا، کە بانگەوازەکە بگەیەننە جیهان و ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەندێک لەوان گەندەڵ و خراپەکار بوون، بۆ چاکسازی ئەم نوخبەیە خوای گەورە پێغەمبەرانی ڕەوانە دەکرد بۆ گەڕانەوە بۆ سەر بنەمای ئایینەکەیان و چاکسازی نێوان گەلەکەشیان، چونکە گەل شوێنەکەوتووی نەوەکانی ئیسرائیل بوون بڕوایان بە نەوەکانی ئەسباط هەبوو، بۆیە بانگەوازەکە نەدەبوو لەناو نەوەکانی ئیسرائیل دا دەربچێت، هۆکاری هەڵبژاردنیان بە گەلی هەڵبژێردراو هۆکاری بانگەوازەکەیان بوو لە ڕێگای پیاوچاکان و پێغەمبەرانیان.

لەدوای سەردەمی یەهوزا و لاوی کە لە دوای یوسف-ی برایان پلە و پایەی عەزیزیان پێبەخشرا لەناو دەسەڵاتی هیکۆس-ی میسردا و بانگەوازی خوای پەروەدگاریان بەباشترین شێوە بڵاو دەکردەوە لەناو نەوەکانیاندا گەندەڵی و خراپەکاری و فەساد سەری دەرهێناو خەریکی زوڵم کردن و ماڵی خەڵک خواردن بوون، ئەمەش وای کرد کە خەڵکی میسر بە چاوێکی زۆر کەم تەماشای نەوەکانی ئیسرائیل بکەن، لەخوارووی میسریش شۆڕشێک دەستی پێکرد کە خەڵکی میسر پادشای خۆی هەڵبژراد و ناوی نان بە فیرعەونەکان.

## دەسەڵاتی فیرعەونەکان بەسەر گەلی ئیسرائیل دا

فیرعەون لەناو کۆمەڵگەی میسردا بەچەند قۆناغێک دەڕوات، فیرعەونەکان زۆرن مێژووی سەرەتایی ئەم فیرعەونانە زۆر ڕوون و ئاشکرا نییە و قسە و باسی زۆری مێژوویی لەسەر کراوە، بەچوار قۆناغ دەسەڵاتی بنەماڵەی جیاواز کە هاتونەتە سەر حوکم لە میسردا باسکراوە بە شێوەیەکی گشتی، هەرچەندە ڕاوبۆچوونی زۆر جیاواز هەیە لەمبارەیەوە، بەڵام ئەوەندەی کە تاڕادەیەک کۆڕایەکی لەسەرە بەم جۆرەیە:

بنەڕەتی بنەماڵەی فیرعەونی لەخوارووی میسرەوە هاتوون لە سوودان-ی ئەمڕۆ و لوکسورەوە وەکو وتراوە لەیەک کاتدا دەشێت دوو فیرعەون هەبوو بێت لە دوو ناوچەی جیاوازی وڵاتی میسردا، بەڵام هاوکار و دژی یەکتر نەبوون و بوندیادی شارستانیەتیان ئەنجام داوە.

شۆڕشی سیاسی و شارستانیەتی فیرعەونی لەدوای بنەماڵەی هیکۆسیەکانەوە دێت، ئەوان توانیان شۆڕش بکەن بەسەریاندا و هەموو دەسەڵاتی هیکۆس لەناوبەرن و گەلی ئەو

سەردەمەش شوێنکەوتووی ئایینی کوڕانی یەعقوب بوون کە ناسراون بە نەوەکانی ئیسرائیل بیانکەنە بەندە و کۆیلەی خۆیان بە پیاو و ژن و مناڵەوە.

هەر لەڕێگای ئەم گەلەوە کە ناسراون بە ئیسرائیل بونیادی شارستانیەتی فیرعەونییەکان لەسەرەتاوە دروست بووە.

هەروەکو وتمان فیرعەون کە پلەوپایە و پۆستە لە دێرزەمانەوە هەبووە گوایە وتراوە یەکەم فیرعەونێک ناوی (خەشایار شاهد) بووە لە بابلەوە کە پارسەکان فەرمانڕەوا بوون ناردوویانەتە ناوچەی میسر.

فیرعەونەکان زۆرن ناوی هەندێکیان لە بەناوبانگترینیان (ڕامسیس، تومومس، حت شپسئوت، ئامین هۆتاب، خۆفۆ، خەفرەع، خیو، نیو، جۆزەر، ئەخناتون، تون ئانخ عامون، کلیۆپاترا...هتد)، زۆرێکی تر لە فیرعەونەکان هەمان ناویان هەیە بە ژمارە جیادەکرێنەوە نموونەی (ڕامسیس ٢) کە لەسەردەمی حەزرەتی مووسا ئەو حوکمڕان بووە، ئەمەش لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە، زانایان دەڵێن مووسا لە سەردەمی دوو فیرعەون دا ژیاوە، ئەوەی کە پەروەردەی کردووە مردووە کوڕەکەی حوکمڕان بووە، ئەمەش هەر زانا و مێژوونووسانی نەسارا و یەهود ئەم وتەیە دەڵێن لە دوای ئازار و ئەشکەنجەی ئەم گەلە و زوڵم لێکردنیان، خوای گەورە پێغەمبەریان بۆ دەنێرێت تاکو ڕزگاریان بکات لەو ناڕەحەتی و زوڵم و زۆرەی لەسەریانە.

## ڕووداو و ژیانی حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ

حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ ١٣٦ جار لە قورئان دا ناوی هاتووە، لە پێنج پێغەمبەرە گەورەکەیە کە ناسراون بە ئولول عەزم، ناڕەحەتی و ناهەمواری زۆری چەشتووە، هەر لە منداڵییەوە تا کۆچکردنی و گەڕانەوەی بۆلای پەروەردگاری.

ناوی مووسای کوڕی عیمرانی کوڕی قاهث کوڕی عازری کوڕی لاوی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە سەلامی خوایان لێ بێت.

هەموو پێغەمبەرانی نەوەکانی ئیسرائیل بە شەریعەتی تەورات حوکمڕانیان کردووە کە بۆ مووسا هاتووە، مووسا دوو کتێبی بۆ هاتووە صوحوف و تەورات.

ژیانی حەزرەتی مووسا لە قورئان دا بە جوانی ڕوونکراوەتەوە ئەگەرچی لە کتێبی پیرۆزدا لە بەشی خروج باسی ژیان و دروشم و شەریعەتی تەوراتی مووسا دەکات، خودی قورئان ئەو باسانە بەدەستکاری کراو دادەنێت و لە قورئان دا زۆر بە باشی ڕوون کراوەتەوە، لەبەر ئەوە

هیچ پێویستمان بە سەرچاوەی یەهود و نەسرانی نییە، مەگەر تەنها بۆ هێنانی ناوەکان وەکو نموونەی ناوی دایکی مووسا سەلامی خوای لێ بێت.

کە ناوی (یوکابد) بووە، هەرچەندە بە ناوی تریش باسکراوە هەموو ناوەکان لە یەکەوە نزیکن دیارە بە گوێرەی زمان و زاراوە جیاکان گۆڕاوە وەکو نموونەی (ئەیارخا، یاخود ئەیازخت...هتد).

هەروەها خوشکەکەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ کە کۆمەڵێک لە ئەهلی کیتاب دەڵێن ناوی (مریم) بووە، بەڵام کۆمەڵێکی تر لە ئەهلی کیتاب و موسڵمانان دەڵێن ناوی (زەینەب) بووە.

حەزرەتی مووسا لەسەردەمی فیرعەونێک ژیاوە بەناوی ڕامسیس، دووەم خێزانی ناوی ئاسیای کچی مزاحم بووە کە یەکێک بووە لە ئافرەتە ئیماندارەکان لە خانەوادەی هیکۆسییەکان بووە، لەنەوەی پادشای هیکۆسییەکانە کە ناوی ڕەیانی کوڕی وەلید بووە، واتا ئاسیای کچی موزاحیمی کوڕی عوبەیدی کوڕی ڕەیانی کوڕی وەلید بووە. لێرەدا ئەوە دەردەکەوێت کە بنەماڵەی هیکۆسییەکان بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە ناوچەی شام خاوەنی بەشێکی کەم لە دەسەڵات بوون لەناو فیرعەونەکان دا. هەروەها بەنی ئیسرائیلیش خاوەنی دەسەڵات بوون هەر لەناو سیستەمی حوکمڕانی فیرعەون وەکو قارون.

پرسیار ئەوەیە ئەی بۆچی گەلی ئیسرائیلی ئازار ئەدا؟

ئازاری ئەدان لەبەر ئەوەی فیرعەونەکان خۆیان بەخوا دەزانی و گەلی ئیسرائیلیش خوای پەروەردگاریان دەپەرست، ئەوەی وازی لە ئایینی ئیسرائیل بهێنایە ئەوا ئازاری لەسەر هەڵدەگیرا تاڕادەیەک پارێزراو بووە.

پایتەختی دەوڵەتی فیرعەونییەکان لوقسورە یان ناسراوە بە (طيبة)، ماڵی باوکی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لەشاری لوقسور بووە، لەوێ ژیاون و ڕووداوەکان لەوێ دەست پێدەکات.

## سەرەتای ڕووداووەکان بە سیحربازی

سیحر پرسێکی شاراوەیە کە پێکهاتووە لە گۆڕانی شتێک کە لە دۆخی خۆی دەربچێت، ئەمەش جۆری هەیە لە ڕێگای چاوبەستی و فرتوفێڵ یاخود لە ڕێگای جنۆکە و شەیتانەکانەوە یان لە کۆندا لە ڕێگای ماددە کیمیاییەکان کە لای خەڵکی زانراو نەبووە بە گشتی.

لەباسەکانی داهاتوودا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر و ڕوونی دەکەینەوە[١٣].

واباوە لە کتێبە مێژووییەکاندا کە ساحیرەکان هەواڵیان داوەتە فیرعەون کە لەو ساڵەدا منداڵێک لە دایک دەبێت لەنەوەکانی ئیسرائیل کەوا دەبێتە هۆکاری لەناوبردنت.

بەم هۆکارە فیرعەون دەکەوێتە لەناوبردنی منداڵانی بەنی ئیسرائیل لە ڕاستیدا هیچ پەیوەندی نییە بە هەواڵی ساحیرەکان، چونکە سیحر هیچ زانیاری لە پەنهانی نییە و غەیب نازانن، ئەو قسەیە دوورە لە ڕاستییەوە کە جادووبازەکان هەواڵیان دابێتە فیرعەون کەسێک پەیدا دەبێت و لەناوت دەبات، بەڵکو ڕاستییەکە لە دوو حاڵەت بەدەر نییە.

یەکەم: فیرعەون بەهۆکاری بیروباوەڕی گەلی ئیسرائیل لەناوی دەبردن و دەیویست لەناویان بەرێت بە جینۆساید، پیاو و منداڵی نێرینەی دەکوشت و ئافرەتەکانیشی بەکاردەهێنا بۆخزمەتکاری و کەنیزەک. فیرعەون دڕیان بووە و زۆر لووتبەرز و خراپەکار بووە، بۆ مانەوەی خۆی گەلەکەی پارچە پارچە کردبوو، بەم هۆکارە هەواڵی پێدەگەیشت و دەیزانی چی ڕوودەدات لەناو ژێر دەستەکانیدا.

دووەم: لەناو بەنی ئیسرائیل دا لە ڕێگای نبوەتی پێغەمبەرانی ڕابردووەوە هەواڵیان پێدراوە کە پێغەمبەرێک بۆ ئەوەی ئیسرائیل دێت و ڕزگاریان دەکات لە دەست زوڵم و زۆر، یاخود هەرچەند ساڵێک لەناو بەنی ئیسرائیل دا واباوبووە کە پێغەمبەرێک دەمرێت، ماوەیەکی کەم بێ پێغەمبەر دەبن پاشان پێغەمبەرێکی تر دێت، ئەویش مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ۝٢ نَتْلُواْ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ۝٣ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ۝٤ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٣] بۆ زانیاری خوێنەر سەرنجتان ڕادەکێشم بۆ کتێبی مەملەکەتی شەیتان کە پێک هاتووە لە چەند بەرگێک لەوێدا بە ڕوونی و درێژی سیحر و جۆرەکانی سیحری تێدا ڕوون کراوەتەوە.

أَيِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ۝ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُواْ يَحْذَرُونَ۝٦﴾ القصص

واتە: ئاماژەیە بۆ ئایەتەکانی ئەم سوورەتە، یان ئەم قورئانە پیرۆزە کە کتابێکە هەموو شتێکی بە ئاشکراو بە ڕوونی تیادا باسکراوە۝ ئەی محمد ﷺ لە ڕێگای وەحییەوە ئێمە هەواڵی مووساو فیرعەونت بۆ دەخوێنینەوەو ڕوون ئەکەینەوە بە حەق و بەڕاستی وەکو ئەوەی بە چاوی خۆت ببینیت بۆ کەسانێک کە باوەڕدار بن تا پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن۝ بە دڵنیایی فیرعەون لووتبەرزی نواند لەسەر زەویدا و خۆی بە گەورە زانی و خۆی بە خوا ئەزانی، خەڵکەکەیشی پارچە پارچەو بەش بەش کردبوو تا گوێڕایەڵی بکەن کۆمەڵێکیانی لاواز کردبوو کە بەنی ئیسرائیل بوون کە لەو کاتەدا باشترین ئوممەت بوون کوڕەکانی سەرئەبڕی، کچەکانیشیانی بۆ خزمەت کردن بەکار ئەهێنا بە دڵنیایی فیرعەون کەسێکی زۆر ئاشووبگێڕ بوو لەسەر زەویدا۝ ئەو کەسانەی کە لەسەر زەوی لاواز کرابوون کە بەنی ئیسرائیل بوون ئەمانەوێ نیعمەتی خۆمان بڕژێنین بەسەریاندا بیانکەین بە پێشەواو سەرکردە بۆ خەڵکی، ئەوان ببن بە میراتگری زەوی و ببن بە دەسەڵاتدار۝ لەسەر زەویشدا تەمکین و جێگیریان بکەین و دەسەڵاتیان پێ بدەین، نیشانی فیرعەون و هامان و سەربازەکانی بدەین کە ئەم خەڵکە لاوازەی کە ئەوان حەزەریان لێ ئەکەن و لێیان دەترسێن لەناوچوونیان لەسەر دەستی ئەمان دەبێت۝

لەناو گەلی ئیسرائیل بڵاوبوویەوە کە بەم نزیکانە پێغەمبەرێک دێت ڕزگاریان دەکات، لەسەر ئەم بنەمایە فیرعەون و قیبطییەکان ترسان و دەستیان کرد بە کوشتنی منداڵەکانیان. خوای گەورە هەواڵی دابوێ کە منەتی خۆی دەکات بە سەر زوڵم لێکراو و بێدەسەڵات و لاوازەکان دا و بەهێزیان دەکات و ئەوان دەبنە خاوەن دەسەڵات.

هۆکاری زانینی فیرعەون لەدەمی خودی گەلی ئیسرائیلەوە بووە، بۆیە کاتی هاتنی مووسای نەدەزانی، بۆیە بڕیاری دا هەر ئافرەتێک سکی هەیە بەمنداڵ دوای دانانی سکەکەی بکوژرێت.

هۆکاری کوشتنی مناڵانی گەلی ئیسرائیل بووە هۆکاری کەم بوونەوە و کەمکردنی هێزی کار لەوڵاتی میسردا، هەر بۆیە قیبطییەکان سکاڵایان بردەوە بۆلای فیرعەون کە گەلی ئیسرائیل ڕوو لەکەمییە، ئەگەر وا بڕوات هێزی کارکردن و بونیاد نانی ئەو هەموو هەرەم و بینایە کێ دروستی بکات، بەم هۆکارە فیرعەون بڕیاری دا ساڵێک منداڵان ئازاد بن بۆ لەدایک بوون، ساڵێکیش منداڵانی نەوەی ئیسرائیل بکوژرێن، ئەمەش دوا بڕیاری فیرعەون بوو لەمەڕ منداڵانی نێرینەی گەلی ئیسرائیل.

## لەدایکبوونی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ

خانەوادەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لە شاری (طيبة) کە ئێستا ناسراوە بە (الأقصر) یان لوکسور لەو شارەدا نیشتەجێ بوون کە بە شاری فیرعەونەکان ناسراوە لە پیاوان و ژنانی فیرعەونی خاوەنی دوو گۆڕستانی گەورە بوون بەناوی دۆڵی خانمانی فیرعەونی و دۆڵی فیرعەونییەکان، لە ئێستادا پێیدەوترێت (وادي الملكات، وادي الملك)، لەدوای مردنیان ئەمانە دەپەرستران و زۆرێک لە فیرعەونەکان مۆمیایی دەکران، پاشان مەوسمی پەرستنی ئەم فیرعەونانە لەبەهار و پاییزدا بوو.

ئەو شارە بە ئەرک و هێزو تواناکانی گەلی ئیسرائیل دروست کرا خەڵکی ئیسرائیل زوڵمی زۆریان لێدەکرا، هەندێکیش لە گەلی ئیسرائیل لەگەڵ فیرعەون دا هاوکار بوون، وەکو قاروون کە لە نەوەی ئیسرائیل بوو، بەڵام دژی گەلەکەی خۆی بوو.

لەناو ئەم خەڵکەدا خەڵکی خواناس و دینداری زۆری تێدابوو زانای گەورە و عابید و بنەماڵەی زۆر گەورەو بەڕێزی دیندار دەژیان، یەکێک لەو بنەماڵانە خێزانی عیمران بوو کە باوکی حەزرەتی مووسایە و دایکی حەزرەتی مووسا سکی پڕ بوو بە مووسا، قەدەری خوای گەورە وادەبێت دایکی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ یوکابد خانم هەرچۆن بووە پارێزگاری لە کۆرپەکەی ناو سکی دەکات و ناهێڵێت کەس بزانێت تا ئەو کاتەی حەزرەتی مووسا لەدایک دەبێت لەباسی یوسف دا زیاتر ڕۆڵی باوک نیشاندرا، بەڵام لێرەدا ڕۆڵی دایک نیشان ئەدرێت لەبەر دوو هۆکار، هۆکاری یەکەم منداڵ کە کۆرپەیە ڕۆڵی سەرەکی دایک دەبینێت تا گەورە دەبێت و لە کۆرپەلەیی دەچێتە قۆناغی منداڵی ئەم ڕۆڵەش تەنها دایک دەیبینێت تا گەورە دەبێت و لە کۆرپەلە دەچێتە قۆناغی منداڵی، ئەم ڕۆڵەش تەنها دایک تێیدا سەرەکییە، هۆکاری دووەم ڕۆڵی باوک لە منداڵدا لە تەمەنی ١٠-١٨ ساڵی سەرەکییە و منداڵ کەسایەتی باوک وەردەگرێت، بۆیە قورئان لە جیاوازی حاڵەت و ڕووداوەکاندا ڕۆڵە سەرەکییەکان نیشان ئەدات.

خوای گەورە لە قورئان دا دەفەرموێت: ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِيهِۖ فَإِذَا خِفۡتِ عَلَيۡهِ فَأَلۡقِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحۡزَنِيٓۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيۡكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ۝٧ فَٱلۡتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرۡعَوۡنَ لِيَكُونَ لَهُمۡ عَدُوّٗا وَحَزَنًاۗ إِنَّ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُواْ خَٰطِـِٔينَ ۝٨ وَقَالَتِ ٱمۡرَأَتُ فِرۡعَوۡنَ قُرَّتُ عَيۡنٖ لِّي وَلَكَۖ لَا تَقۡتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ۝٩﴾القصص

واتە: وەحی لێرە بەمانای ئیلهام دێت نەک سرووش، چونکە پێغەمبەران هەموویان پیاو بوونەو هیچ ئافرەتێک پێغەمبەر نەبووە، هەموویان مرۆڤ بوونەو کەسیان جنی نەبوون، ئیلهاممان بۆ دایکی مووسا ناردو خستمانە دڵیەوە کە دووگیان بوو بە مووسا کاتێک کە لە دایک دەبێت شیری پێ بدەکە ترسای لەسەربازەکانی فیرعەون بێن بیبەن بیخەرە ناو دەریای نیلەوە،

ماڵیان لە ڕۆخی دەریای نیل بوو دەیکردە ناو تابووتێکەوەو دەیکردە ناو دەریاکەوەو بە حەبلێک دەیبەستەوە تا سەربازەکان دەڕۆیشتن، ڕۆژێک فریا نەکەوت بیبەستێتەوەو ئاوەکە بردی، خوای گەورە فەرمووی ترست لێی نەبێت و نوقم نابێت و ئێمە ئەیپارێزین، خەفەتیش مەخۆ بە دوورکەوتنەوەی لە تۆ.لەبەر ئەوەی بە دڵنیایی ئێمە بۆت ئەگەڕێنینەوەو ئەیشیکەین بە پێغەمبەرو وەحی بۆ ئەنێرین﴿٧﴾ دەستی هەندێک لە ئافرەتە خزمەتکارانی فیرعەون کەوت و کە لە ڕۆخی دەریاکە ئیشیان دەکرد، ئەوانیش لە ترسا سەریان هەڵنەدایەوەو نەیانزانی چی تێدایەو بردیان بۆ (ئاسیا)ی خێزانی فیرعەون، کاتێک سەیری کرد بینی منداڵێکی یەکجار جوانی تیایەو سەرەنجی ڕاکێشا، نەیانزانی کە ئەمە لە داهاتووودا ئەبێ بە دوژمنیان و خەفەتباریان ئەکات بە دڵنیایی فیرعەون و هامان و سەرجەم سەربازەکانیان تاوانبارو سەرپێچیکار بوون لە هەموو وتەو کردەوەیەکیاندا﴿٨﴾ فیرعەون کە بینی ویستی بیکوژێت، خێزانەکەی فیرعەون وتی: ئەی فیرعەون ئەو منداڵە مەکوژە، چونکە ئەمە لە وڵاتێکی ترەوە ئاو هێناویێتی و زیانی بۆت نابێت و ئەبێتە هۆی ئەوەی کە هەردووکمان چاومانی پێ ڕۆشنا بێت لە داهاتووودا، یان بیکەین بە کوڕی خۆمان، لەبەر ئەوەی خۆیان منداڵیان نەئەبوو، بەڵام ئەوان هەستیان نەئەکرد کە تیاچوونی فیرعەون لەسەر دەستی ئەم منداڵە ئەبێت﴿٩﴾

خوای پەروەردگار دایکی مووسای ئاگادار کردەوە کە.منداڵەکەت تێر شیر بکە و لەناو شتێک داینێ و بیدە بە دەم ڕووباری نیلەوە کە نغرۆی ناو ڕووبارەکە نەبێت، جا بەلەمێکی بچووک یان تابوتە گرنگ ئەوەیە ئەو شتە نغرۆی ناو ڕووبارەکە نەبێت.

ئەم ئاگادار کردنەوەیە لە ڕێگای وەحییەوە بوو، جا وەحی جۆری زۆرە. هەرکەس وەحی بۆ کرا لەلایەن خوای گەورەوە بەواتای پێغەمبەرایەتی نایەت، زانای ڕاڤەکاری قورئان عەبدولڕەحمان سەعدی دەڵێت: وەحی دەشێت لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بکرێت، بەڵام جۆرەکانی وەحی زۆرن وەحی پێغەمبەران و چاکەخوازان و...هتد.

ئیبن حەزم دەڵێت: گوایە وەحی بۆ دایکی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ وەحی پێغەمبەران بووە واتا پێغەمبەری ئافرەتە، هەندێکی تر لەوانەی کە لە زانستی کەلامدا ڕۆچوون هەمان قسەیان کردووە.

لەڕاستیدا زانایانی ئەهلی سوننەت و جەمعە لەسەرو هەموویان ئەبو حەسەنی ئەشعەری دەڵێت: کە ئەوە وەحی پێغەمبەرایەتی نییە، بەڵکو ئاگادارکردنەوەی دایکی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بەو ئیلهام و هیدایەتی خوایە هەروەکو چۆن خوای گەورە ڕێگا نیشاندەری هەنگە بۆ هەنگوین دروست کردن و دەفەرموێت:

﴿وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ۝٦٨ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ۝٦٩﴾ النحل

واتە: وەحی لێرە بەمانای ئیلهام و ڕێنمایی دێت، پەروەردگار ئیلهامی نارد بۆ مێشهەنگ و ڕێنمایی کردن کە لە شاخەکان و لەناو دارەکان بۆ خۆتان ماڵ دروست بکەن لەو کوورەی هەنگەی کە مرۆڤەکان بۆتان دروست ئەکەن۝٦٨ پاشان لە هەموو بەرهەم و بەری گوڵێک بخۆن، ئەو ڕێگایەی کە خوای گەورە تێی گەیاندوون و فێری کردوون بیگرنە بەر لە شاخەکان و لەناو دارەکان، خۆتان ملکەچ بن و ئەو ڕێگایەشی بۆ ئاسان کردوون و بەئاسانی پێی ئەگەن و دەیدۆزنەوە لەناو سکی ئەم مێشهەنگانەش خواردنەوەیەک بۆ ئێوە هەیە کە هەنگوینە، ڕەنگی جیاوازی هەیە سپییە و هەیە سوورە و هەیە زەردە کە شیفای تیایە بۆ هەندێک لە نەخۆشییەکان بۆ خەڵکی بە دڵنیایی ئەمانە هەمووی بەڵگەو نیشانەن لەسەر تواناو دەسەڵات و تاک و تەنهایی خوای گەورە بۆ کەسانێک کە بیر بکەنەوە۝٦٩

نووسەر پێی وایە وەحی ئاراستەیە جا ئەگەر ئاراستەکە باش و چاکەخوازی بوو ئەوە لەلایەن خوای پەروەردگارەوەیە هەموو کەس خوای گەورە وەحی بۆ دەنێرێت بۆ چاکەکاری واتا ئاماژەی(سیگناڵی) خوایە، لە ڕێگای ئەقڵەوە بێت یان خەون و ئامۆژگاری پیاوچاکان و زۆر بواری تریش.

وەحی خراپە بوونی هەیەو خوای گەورە باسی وەحی شەیتانەکان دەکات بۆ مرۆڤ کە ئاراستە و سیگناڵی خراپ ئەدەنە مرۆڤەکان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ۝١١٢﴾الأنعام

واتە: بەم شێوازە بۆ هەموو پێغەمبەران ئێمە دوژمنمان داناوە کە دوژمنیان هەبووە لە کافران کە دژایەتیان کردوون بۆیە ئەی محمد ﷺ بەلاتەوە ئاسایی بێت دوژمنەکانیان لە شەیتانی مرۆڤ (فاڵچی و جادووگەرو سەرانی کافران) و شەیتانی جنین ئەمانە دوژمنی پێغەمبەران بوون کە هەندێک لە شەیتانە جنیەکان وەسوەسە ئەخەنە دڵی شەیتانە مرۆڤەکانەوە، وەحی لێرە واتە: وەسوەسە قسەکانیان بۆ ئەڕازێننەوەو بۆیان جوان ئەکەن بۆ ئەوەی کە پێی هەڵخەڵەتێن و لە خشتەیان ئەبەن، ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بوایە ئیشی

وایان نەئەکرد تۆ لێیان بگەڕێ و وازیان لێ بێنە چی بوهتان و درۆ هەڵبەستنێک ئەکەن با بیکەن زەرەرو زیانی تەنها بۆ خۆیانە.

کەواتە ئاگادار کردنەوەی دایکی مووسا لەلایەن خوای موتەعال دەشێت بە خەون بووبێت یان بە ئیلهام خستنە دڵی یاخود هەر شێوەیەکی تر، بەڵام دایکی مووسا پێغەمبەر نەبووە و پێغەمبەرایەتی لەناو ئافرەتانەوە نایەت نەک لەبەر ئەوەی ئەوان توانای گەیاندنی پەیامیان نییە، نا؛ بەڵکو لەبەر ئەوەی توانای هەمیشەیی بەندایەتی و دروشمەکانیان نییە، بەهۆکاری (فەسلەجەی) لاشەیان کە دەکەونە دۆخی خوێن دانان و پاکبوونەوەی ڕەحمیان و سک پڕی و منداڵ بوون، ئەم حاڵەتەش زۆر ئەستەمە و سەختە لەکاتی ئەو پرۆسە جەستەییەدا.

کەواتە وەحی پێغەمبەران جیاوازە هەموو وەحییەک وەحی پێغەمبەرایەتی نییە.

دایکی مووسا یوکابد خانم منداڵەکەی تێر شیر کردو خستییە ناو بەلەمێکی بچووک و تەوەکول بەخوا خستییە ناو ڕووباری نیلەوە، بەڵام دەیزانی خوای گەورە منداڵەکەی بۆ دەگەڕێنێتەوە، چونکە ئەستەمە دایک کۆرپەکەی خۆی لەناوبەرێت، ئەگەر ئیلهام و ئاراستەی خوای پەروەردگار نەبێت، دەشێت بە کۆرپەکەیەوە هەڵبێت و ڕابکات بۆ جێگایەکی دیکە، بەڵام ئاراستەی خوای گەورە ڕوون بوو بۆ دایکی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بۆیە خستییە ناو ڕووبارەکە ئەگەرچی دڵتەنگ و چاو بە گریان بوو، بەڵام خوای موتەعال بە وەحی ئاراستەی کردووە کە بێخەم بە و کۆرپەکەت بۆ دەگەڕێنینەوە، پاشان پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی پێدەبەخشن.

ئەمەش دڵنیایی تەواو بوو بۆ یوکابد خانم کە منداڵەکەی گەورە دەبێت و دەبێتە پێغەمبەر تا پەیامی خوای موتەعال بگەیەنێت و بانگەوازی بۆ بکات.

ماڵی دارودەستەی فیرعەونەکان گەڕەکەکانیان لەسەر ڕووبار دروست کردبوو خەڵکی ئەرستۆکرات هەمیشە بەدوای دیمەن و جوانی و ئەتێکێتەوەن و خەڵکی ڕەش و ڕووت دەچەوسێننەوە، لەسەر خوێن و توانای ئەوان دەژین بۆیە

بەلەمەکەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لە جێگایەک لەنگەری گرت بە فەرمانی خوایی کە بنەماڵەی فیرعەون ئەو منداڵەیان دۆزییەوە هەر ئەو منداڵە دەبێتە هۆکاری ئازار و ئەشکەنجە بۆ بنەماڵەی فیرعەون و خەم و ئازار دەکات بە دڵیاندا، چونکە فیرعەون کەناوی ڕەمسیس-٥ و وەزیرەکەی هامان لەگەڵ سەربازەکانیان هەموویان هەڵەکارن و پێ بە هەڵەی خۆشیاندا نانێن، هەر بۆیە خوای پەروەردگار تووشی سزا و ئازاریان دەکات.

پاشان ئەم مێژووە کە خوای موتەعال بۆمان دەگێڕێتەوە لە قۆناغی ماڵی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ دەچینە ناو قۆناغێکی تر یاخود دیمەنێکی تر لە ڕووداوەکان، ئەوەی مووسا هەڵدەگرێتەوە

دەڵێت لەناو تابوتێکی داخراودا بووە، ئەمەش ڕێگای تێدەچێت بۆ ئەوەی ئەگەر شەپۆلی ڕووبارەکە تابوتەکەی خستە سەرلایەک منداڵەکە نەکەوێتە ناو ڕووبارەکە و هەر لەناو تابوتە داخراوەکەدا بمێنێتەوە.

ئەو کەسەی کە هەڵیدەگرێتەوە خێزانی فیرعەونە، ئاسیا خاتوون منداڵی نییە، خودی فیرعەونیش خاوەنی منداڵ نییە، هەرچەندە لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە گوایە کچی فیرعەون بە دەستی باوکی کوژراوە. فەرموودەکە لاوازە و هەنێک بە هەڵبەستراو(مەوزوع)یان داناوە، ئیبن کثیر لە مێژووی پێغەمبەراندا دەڵێت کوڕی نەبووە فیرعەون، تەنها کچی هەبووە. کە ئاسیا خاتوون تابوتەکە دەکاتەوە خۆشەویستی دەچێتە سەری و بە فیرعەون دەڵێت بە گاڵتەوە: ئەمە ئەو منداڵەیە کە تۆ لێی دەترسیت! پاشان پێی دەڵێت: با بیکەینە کوڕی خۆمان و سوودێکمان پێ بگەیەنێت.

فیرعەون دەڵێت: من پێویستم پێی نییە، بەڵام تۆ ئازادی بۆ خۆت بەخێوی دەکەیت.

ناوی مووسا لەلایەن بنەماڵەی فیرعەونەوە هەڵبژێردراوە، ناوی مووسا واتا (درەخت) یاخود بە قیبطی بەواتای (منداڵ) دێت یان دەڵێن بەزمانی کۆنی میسری دوو وشەی لێکدراوە بەواتای (ئاو) و (درەخت) دێت، (مو) بەمانای ئاو، (شا) بەمانای درەخت.

خوای پەروەردگار ویست و ئیرادە و قەدەری وابوو لە دوژمنی فیرعەون لەناو بنەماڵەکەیدا گەورە بکات، ئەوەی فیرعەون نەیدەویست بە ویستی خوای گەورە ڕوویدا.

لەناو کتێبی پیرۆزدا هاتووە کە کچی فیرعەون مووسای هەڵگرتۆتەوە بەناوی (دربتة) ئەمەش بە دڵنیاییەوە دەستکاری کراوە، چونکە هیچ مێژوویەکی میسری کۆن نایسەلمێنێت کە ڕەمسیس کچی هەبووبێت.

پاشان دیمەنێکی تر دەست پێدەکات لە ژیانی مووسا ئەویش خوشکی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ دێتە ناو ڕووداوەکان، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَأَصۡبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًاۖ إِن كَادَتۡ لَتُبۡدِي بِهِۦ لَوۡلَآ أَن رَّبَطۡنَا عَلَىٰ قَلۡبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتۡ لِأُخۡتِهِۦ قُصِّيهِۖ فَبَصُرَتۡ بِهِۦ عَن جُنُبٖ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١١﴾ * وَحَرَّمۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَرَاضِعَ مِن قَبۡلُ فَقَالَتۡ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰٓ أَهۡلِ بَيۡتٖ يَكۡفُلُونَهُۥ لَكُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدۡنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَيۡ تَقَرَّ عَيۡنُهَا وَلَا تَحۡزَنَ وَلِتَعۡلَمَ أَنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٣﴾﴾القصص

واتە: دایکی بە خوشکەکەی مووسای وت: برۆ هەواڵێکی مووسام بۆ بێنەوە لای ماڵی فیرعەون، بەڵام ئەوان هەستیان نەکرد کە ئەم کچە خوشکی مووسایە و هاتووە بۆ هەواڵی موسی(١١) دوای ئەوەی کە مووسایان هەڵگرت چەندێک ئافرەت کە شیری هەبوو هێنایان بۆ ئەوەی شیری پێبدات، خوای گەورە قەدەغەی کرد شیری هیچ کەسیان بخوات و مەمکی هیچ ئەو ئافرەتانەی نەگرت تا شیرەکەیان بخوات، پێش ئەوەی کە بگەڕێتەوە بۆ لای دایکی هێنایان بۆ بازاڕ تا ئافرەتێکیان دەست بکەوێت شیری پێبدات، خوشکەکەی بینی و وتی: ئایا ڕێنمایتان بکەم بۆ ماڵێک کە ئەوان سەرپەرشتیاری بکەن و شیری پێ بدەن، ئەوان زۆر بەڕەحم و سۆزو ئامۆژگاری کار دەبن بۆی لە پەروەردەکردنیدا(١٢) گەڕاندمانەوە بۆ لای دایکی، هێنایان بۆ لای دایکی مەمکی گرت و شیرەکەی دایکی خوارد، ئەوانیش زۆریان پێخۆش بوو بۆ ئەوەی کە دایکی چاوڕۆشن بێت بە منداڵەکەی خۆی خەفەت نەخوات بە دوورکەوتنەوەی منداڵەکەی تا بۆی دەرکەوێ و بزانێت کە بە دڵنیایی بەڵێنەکانی خوای گەورە هەمووی حەقەو خوای گەورە بەڵێنی خۆی ئەباتە سەر، بەڵام زۆربەی خەڵکی لە بێئاگاییدان و ئەم شتە نازانن(١٣).

دایکی مووسا زۆر دڵی لای منداڵەکەی دەبێت، توانای خۆڕاگرتنی نامێنێت و هەموو بیروهۆشی لای کۆرپەکەیەتی، ڕاستەوخۆ خوای موتەعال دڵنیایی کردۆتەوە کە منداڵەکەی لەو پەڕی ئاسایش و ئارامیدا دەبێت بەڵام نازانێت ئارامی و ئاسایشەکە چییە، ئەویش پێغەمبەر نییە تا بتوانێت و هەموو قەدەرەکان لێکبداتەوە، بۆیە نەیزانی ئارامییەکەی مووسا و پاراستنی لەماڵی زاڵمترین کەسەوە دەبێت کە ماڵی فیرعەونە. هەر بۆیە خوشکەکەی مووسا ئاگادار دەکاتەوە کە بە نهێنی شوێن تابوتەکە بکەوێت، هەر بۆیە خوشکەکەی مووسای خستە شوێنی ئەویش لە لابەلاوە کەوتە شوێنی و کەس هەستی پێنەکرد، خوشکەکەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ زانی ماڵی فیرعەون منداڵەکەیان هەڵگرتۆتەوە.

قەدەرو ئیرادە و ویستی خوای گەورە وایە کە مووسا برسییەتی و دەگری، بەڵام لەسنگی کەس شیر ناخوات و مەمکی هیچ دایکێک یاخود ئافرەتێک ناگرێت، بۆیە ناچار لەناو خەڵکیدا گەڕان، بەڵکو کەسێک هەبێت ئەو منداڵە تێر شیر بکات. خوای گەورە ئیرادەی وابوو هەموو سنگی ئافرەتانی لێ قەدەغە کرد بێجگە دایکی خۆی، هەربۆیە خوشکەکەی ئەو کەسانەی ئاگادار کردەوە کە بەدوای کەسێکدا دەگەڕان بۆ شیردانی منداڵەکەو ماڵی خۆیانی نیشان دان، مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ گەڕایەوە سەر سنگی دایکی و بە دڵنیاییەوە پارە و موچە بۆ دایکی مووسا دەبڕێتەوە و دەچێتە ماڵی فیرعەون بۆ شیرپێدانی مووسا، بەم حاڵە ماڵی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ گوزەرانیان باش بوو. مووسا گەڕایەوە لای دایکی، بەڵام بە پارەو سەروەت و سامانی فیرعەون پەروەردە دەبێت و باشترین ژیان دەباتە سەر، بە دڵنیاییەوە پەروەردەی بەهێز دەبێت لە ڕووی

لاشەیی و بیروهزری سیاسییەوە بە هۆکاری ئەوەی لەناو خانەوادەی دەسەڵاتدا پەروەردە دەبێت.




لە ئبن کەثیردا هاتووە لە ئیبنو عەباسەوە کەوا پیاوانی فیرعەون گومان دەبەن بە خوشکەکەی مووسا کە ئەو چ پەیوەندی هەیە بە دۆزینەوە و شیرپێدانی ئەو منداڵەوە.

لەوەڵامدا دەڵێت: تەنها ئارەزوو ویستم ئەوەبووە کە سوود بە جەنابی پادشا (فیرعەون) بگەیەنم، کە هەواڵ ئەدەنە ئاسیا خاتوون و منداڵەکە دەبەنە لای دایکی مووسا (یوکابد خانم) داوای لێدەکەن کە لە کۆشی فیرعەون دا بمێنێتەوە، یوکابد خانم دەڵێت: من خاوەنی خێزان و ماڵ و مێرد و منداڵی ترم، هاروونی برای مووسا لەو ساڵەدا لەدایک بوبوو کە بڕیاری کوشتن نەیدەگرتەوە و ساڵێک لە حەزرەتی مووسا گەورەترە بۆیە وتی ناتوانم بێمە کۆشک و لەوێ بمێنمەوە، ئیتر مووسایان گەڕاندەوە ماڵی باوکی و لەوێ بەخێوکرا.[١٤]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٤] ئەم ڕیوایەتە لە ئیمام حاکمی نەیسابورییەوە هاتووە لە موستەدرەکەکەیدا، بەڵام لاوازە. ئیمامی زەهەبی دەڵێت: کەسێک لە ڕیوایەتەکەیدا هەیە کەس نایناسێت بەناوی (حەسان کوری ئەبی عابد).

کەواتە شیاوترە بڵێین مووسا لەناو کۆشکی فیرعەون دا گەورە بووە و چاوی کراوەتەوە بە هونەری سیاسەت و سەربازی و پاشان فێرکراوە، ڕیوایەتی مێژوویی زۆرە کە ئاسیا خاتوون مووسای زۆر خۆش ویستووە (هەردەبێت واش بێت، چونکە لە منداڵییەوە خۆی پەروەردەی کردووە)، بەدڵنیاییەوە خۆشی دەوێت، مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ زۆر هۆگری خاتوو ئاسیا بووە، بەڵام پێدەچێت لە منداڵییەوە زانیبێتی کە کوڕی ئەوماڵە نییە، چونکە لووتبەرزی فیرعەون وای کردووە کە دان نەنێت بە منداڵێکی عەبید و ئەو خۆشی لە ئەقباط بووە.

خوای موتەعالیش باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە وای کرد مووسا زۆر خۆشەویست بێت.

﴿وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴿٣٧﴾ إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ۚ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾﴾ طه

واتە: ئەوە جارێکی تریش ئێمە نیعمەت و فەزڵ و چاکەی خۆمان بەسەرتدا ڕژاند﴿٣٧﴾ کاتێک کە وەحیشمان بۆ دایکت نارد، لەسەرەتادا کە مووسا منداڵ بوو لەناو بێشکەکەدا لەو ساڵەدا لەدایک بوو کە بە بڕیاری فیرعەون ئەوەی کوڕ بوایە ئەیکوشت، خوای گەورە ئیلهامی خستە دڵی دایکی مووسا﴿٣٨﴾ کە بیخەرە ناو ئەو تابوت و سندوقەی کە لە دار دروست کرابوو ئەکەوتە سەر ئاو، شیری پێدەداو پاشان فڕێی دەدایە ناو دەریاکەوە کە دەریای نیل بوو، دەیبەستەوە نەوەکو کە ماڵان دەگەڕان بۆ کوڕ بیبەن و بیکوژن، ڕۆژێک پەتەکە لەدەستی بەر بوو ئاوەکە بردی پاشانیش دەریاکە فڕێی ئەداتە ڕۆخ و کەناری دەریاکە، ئەو منداڵەش کە لە ناو ئەو سندوقەدایە دوژمنی ئەو و دوژمنی من کە فیرعەونە ئەیبات، تۆمان خۆشەویست کردووە بۆ ئەوەی لە پێش چاوی خوای گەورە ئەم شتە دروست بکرێ و ڕووبدات، خوای گەورە خۆی چاودێری ئەکات و لە ماڵی پاشا گەورە دەبێت و خواردنی شاهانە دەخوات و خزمەتی شاهانە دەکرێت﴿٣٩﴾ کاتێک کە خوشکەکەی مووسا ئەگەڕا تەماشای تابوتەکەی ئەکرد تا بزانێت بۆ کوێ دەڕوات تا گەیشتە لای ماڵی فیرعەون و ئەوان هەڵیان گرت، وە دواتر بەدوای دایەنێکدا ئەگەڕان کە شیری پێ بدات، ئەویش مەمکی هیچ کەسێکی نەئەگرت، خوشکەکەی وتی: ئایا ڕێنماییتان بکەم بۆ کەسێک کە سەرپەرشتی بکات و شیری پێ بدات دواتر هێنایانی بۆ ماڵەوەو مەمکی دایکی خۆی گرت و شیرەکەی خوارد، خوای گەورە ئەفەرمووێ: تۆمان گەڕاندەوە بۆ لای دایکت تا چاوڕۆشناو دڵخۆش بێ بە گەڕانەوەی تۆتا خەفەت نەخوا تۆ کەسێکی قیبتیت

کوشت لە هۆزی فیرعەون بەڵام مەبەستی ئەوە نەبوو کە بیکوژێ بەڵکو بەهەڵە کوشتی، لەو غەم و پەژارەیە یان لەو ترسە کە ئەترسای سزات بدەن لەوەش ڕزگارمان کردیت جار لە دوای جار تۆمان ڕزگار کرد یان تۆمان تاقیکردەوە چەند ساڵێکیش لەلای خەڵکی مەدیەن مایتەوە، کە دە ساڵ بوو پاشان لە کاتێکی دیاریکراودا گەڕایتەوە لەو کاتەی کە بۆت دیاریکرا بوو لە قەزاو قەدەری خوای گەورە تا بتکەین بە پێغەمبەر﴿٤٠﴾.

خوای گەورە لە کۆتایی ئایەتی ٤٠دا دەفەرموێت: { وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا} بەواتای ئەو هەموو ئازار و ناڕەحەتی و دەربەدەرییەی کە لە کۆرپەلەییەوە بەسەریدا هاتووە هەتاوەکو کاتی وەفاتی، هەر بۆیە گەلی ئیسرائیل دەیانوت لەپێش ئەوەی بێیت، واتا بە پێغەمبەرایەتی و دوای کە هاتی ئێمەی گەلی ئیسرائیل بە هۆکاری تۆ ئازار دەدرێین، ئەمەش وتەی ئەو گەلانە بوو بەرانبەر بە پێغەمبەرێکی بەڕێز و ئولولعەزم، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ﴿١٢٩﴾﴾ الأعراف

واتە: پێش ئەوەی کە تۆ بێی ئێمە هەر لەلایەن فیرعەونەوە ئازار ئەدراین و کوڕانمان ئەکوژرا، دوای ئەوەی کە تۆش هاتوویت دیسان ئەوەتا ئێستا فیرعەون ئازارمان ئەدات و ئەمانکوژێت، مووسا فەرمووی: بەڵکو خوای گەورە دوژمنەکەتان لەناو بدات کە فیرعەونە و ئێوە بکات بە جێنشین لەسەر زەویدا تا خوای گەورە تەماشا بکات ئێوە چ کارو کردەوەیەک ئەکەن، ئایا وەکو فیرعەون و قەومەکەی زاڵم و ستەمکار ئەبن یاخود عیبادەتی خوای گەورە ئەکەن و خوای گەورە لە خۆتان ڕازی ئەکەن، واتە کە خوا نیعمەتی پێ بەخشین و ڕزگاری کردن سوپاسگوزاری بن﴿١٢٩﴾

دیمەنێکی تری ژیانی مووسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسۡتَوَىٰٓ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴿١٤﴾ وَدَخَلَ ٱلۡمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفۡلَةٖ مِّنۡ أَهۡلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيۡنِ يَقۡتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنۡ عَدُوِّهِۦۖ فَٱسۡتَغَٰثَهُ ٱلَّذِي مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِي مِنۡ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيۡهِۖ قَالَ هَٰذَا مِنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّهُۥ عَدُوّٞ مُّضِلّٞ مُّبِينٞ﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي فَٱغۡفِرۡ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ فَلَنۡ أَكُونَ ظَهِيرٗا لِّلۡمُجۡرِمِينَ﴿١٧﴾﴾ القصص

واتە: کاتێک کە مووسا باڵغ بوو و پێگەیشت و دروست کردنی ڕێک و دامەزراو بوو حوکممان پێی بەخشی واتە: پێغەمبەرایەتی، تێگەیشتن لە دین و زانیاریمان پێی بەخشی بەم شێوازە پاداشتی چاکەکاران ئەدەینەوە هەروەکو چۆن پاداشتی دایکی مووسامان دایەوە﴿١٤﴾ موسی هاتە ناو شاری میسرەوە دوای ئەوەی کە وەحی بۆ هات و بوو بە پێغەمبەر لە کاتێک کە خەڵکەکە بێ ئاگابوون، وتراوە: لە نێوان مەغریب و عیشادا، یان لە نیوەڕۆدا بە نهێنی خۆی کردە ناو شاردا بینی دوو پیاو شەڕیانە یەکەمیان بەنی ئیسرائیلییەو لە هۆزی خۆیەتی، ئەوەی تریشیان (قيبطي)یە لە هۆزەکەی فیرعەونە و دوژمنێتی، ئەوەی کە لە هۆزەکەی خۆی بوو کابرای بەنی ئیسرائیلی داوای فریاکەوتن و سەرخستنی لە مووسا کرد بەسەر دوژمنەکەیدا: ئەی مووسا فریام بکەوەو لەم دوژمنە ڕزگارم بکە، ئەیەوێ بە زۆر ئیشم پێ بکات و پارەم پێ نەدات، مووسا هەردوو دەستی کۆ کردەوە دای بە سینگی ئەو پیاوەدا، یاخود بە گۆچانەکەی لێیداو یەکسەر مردو کوشتی هەر چەندە بۆ ئەوەی نەبوو کە بیکوژێ بەڵام نەیزانی بەوە ئەمرێ! مووسا وتی: بەڕاستی شەیتان ئەم کردەوەیەی پێ کردم لەبەر ئەوەی فەرمانم پێ نەکرابوو بە کوشتنی بە دڵنیایی شەیتان دوژمنێکی گومڕاکاری ئاشکرایەو ئەیەوێ مرۆڤ گومڕا بکات﴿١٥﴾ یەکسەر مووسا پەشیمان بووەوەو وتی: ئەی پەروەردگار من زوڵم و ستەمم لە نەفسی خۆم کرد لێم خۆشبە، خوای گەورەش لێی خۆشبوو، بەڕاستی خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو بەبەزەییە بەتایبەتی بۆ کەسانێک کە داوای تەوبە و لێخۆشبوون لە خوا ئەکەن و بۆ لای خوا ئەگەڕێنەوە﴿١٦﴾ مووسا فەرمووی: ئەی پەروەردگار بەهۆی ئەو نیعمەتە زۆرانەی کە بەسەرمدا ڕژاندووتە لە پێغەمبەرایەتی و زانست و لێخۆشبوون لەمەودوا نابم بە یارمەتیدەری تاوانباران﴿١٧﴾

لەگەڵ زەمەندا حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ گەورە دەبوو، بەڵام هەندێک خوێندیان بە گوێی فیرعەون دا کە پێدەچێت ئەم منداڵە ئەو کەسە بێت کە تۆ لەناو دەبات، بۆیە فیرعەون بڕیاری دا کە بکوژرێت لە منداڵیدا!

خاتوو ئاسیا بەمەی زانی و توڕە بوو کە ئەوە منداڵە و هیچ نازانێت جیاوازی لە نێوان چاک و خراپدا ناکات، تەنانەت جیاوازی لە نێوانی کەرەستەکانی دەوروپشتی ناکات، چۆن دەتوانێت تۆ بکوژێت؟

فیرعەونیش حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ-ی تاقی کردەوە لە نێوانی خورما و پشکۆدا هەرچەندە لە ڕیوایەتی مێژوودا هاتووە کە ڕیشی فیرعەونی ڕاکێشاوە، ڕیشی فیرعەون لە شێوەی پەلکەدا بووە و ئازاری پێ گەیاندووە، حەزرەتی مووسا دەست بۆ پشکۆکە دەبات و لەتاو ئازاری دەستی دەیبات بۆ دەمی و لێوو زمانی دەسووتێت، ئەم هۆکارەش کاریگەری دەبێت لەسەر شێوەی قسەکردنی.

هەرچەندە جێگای باوەڕی (نووسەر) نییە هیچ سەرچاوەیەکی ڕاست و دروستمان دەست نەکەوتووە کە جێگای بڕوا بێت بۆ ئەم کارەساتە بەسەر مووسادا هاتبێت بۆ ئەوەی زمانی تەواو نەبێت، بەڵام من وای دەبینم کە مووسا لە نێوانی زمانی قیبطی و عیبری لە نێوانی (ش) و (س) و هەروەها چەند پیتێکدا توانای دەربڕینی نەبووبێت ئەمەش لەنێوانی دوو زماندا زۆر بە ئاسایی ڕوو ئەدات، لەکاتی خۆیدا زیاتر باسی دەکەین، فیرعەون ڕێگای نەئەدا گەلی ئیسرائیل بەئاشکرا بە زمانی عیبری ئاخافتن بکەن، دەبوو بە زمانی کۆنی میسری ئاخافتن بکەن.

مووسا گەورە بوو لەناو کۆشکی فیرعەون دا و دەیزانی کە لە گەلی ئیسرائیلە و ماڵی خۆیانی دەزانی هەموو شتێک لای ئاشکرا بوو و هیچی لێ نەشارابووەوە، هەستی دەکرد کە گەلەکەی زوڵم و زۆریان لێ دەکرێت، بەڵام لەناو کۆشکی فیرعەون دا گەورە بووە پارێزەر و حەصانەی خاتوو ئاسیا بوو، خاتوو ئاسیا خاوەنی بیروباوەڕی دامەزراو بوو. و فیرعەونیش سڵی لێدەکردەوە بە دوو هۆکار: یەکەم لە بنەماڵەی هیکسۆسییەکان بوو، لەهەندێک جێگا وەکو باکووری میسر دەسەڵاتیان هەبوو.

هۆکاری دووەم؛ فیرعەون کوڕی نەبوو یان هەر نەزۆک بوو و منداڵی نەبوو، بەڵام دەشێت منداڵی کچی هەبووبێت و کوڕی نەبووبێت، بۆیە زۆر ئیعتیباری بۆ قسەی خاتوو ئاسیا داناوە، تاکە کەسێک بوو لەناوکۆشک کە بە خوای نەزانیووە و گاڵتەی پێکردووە.

حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ گەورە بوو لانە و کۆشک و ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی ناو ئەو کۆمەڵگەیە، پەیوەندی تەواوی هەبوو لەگەڵ ماڵی باوکی و براکانی، بە بەڵگەی ئەوەی زانیویەتی برای هەیە ناوی هاروون-ە کە لەو ساڵەدا لەدایک بووە کە فیرعەون ڕێگای داوە و منداڵەکانی نەکوشتووە.

گەورە بوونی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لەناو ئەو کۆشکەدا حیکمەتی خوای گەورە بوو، لەو ڕێگایەوە خوای موتەعال فێری هونەری بەڕێوەبردن و ئیدارە و سەرکردایەتی کرد و زانستی زۆر فێر بوو، بەتایبەت زانستی ئایینی باووباپیرانی کە پێغەمبەر بوون، چونکە گەلی ئیسرائیل لە ناڕەحەتی و ناهەمواریدا بوون، بەڵام خوای گەورە وای ڕەخساندبوو بۆ مووسا کە هەموو ئەو زانستانە فێر بێت، ئەمەش پاداشتی خوایی بوو بۆ حەزرەتی مووسا و ئامادەکردنییەتی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەڵاتی زوڵم و زۆری فیرعەون و پاراستنی گەلەکەی لە جینۆساید و کارپێکردنیان.

لە نیوەڕۆیەکدا خۆی دەکات بە بازاڕدا کە زانایان باسیانکردووە، هەروەها هاتووە کەوا لەنێوان مەغریب و عیشادا هاتۆتە ناو بازاڕ، هەرچەندە هەردوو ڕیوایەتەکە لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە، بەڵام نووسەر ئەم ڕایەی پێ پەسەندە چونکە جوولەکە ڕەفتاریان وایە لە دوای مەغریب

دێنە دەرەوە و پێداویستی خۆیان ئەنجام دەدەن. هەرکامیان بێت هیچ لە بنەڕەتی باسەکە ناگۆڕێت، لەکاتی هاتنی دا دەبینێت دوو کەس شەڕ دەکەن کەوا یەکێکیان لە گەلی ئیسرائیلە و ئەوی تریش قیبطیە کە حەزرەتی مووسا دەبینێت قیبطییەکە زوڵم لە عیبرانییەکە دەکات مستەکۆڵەیەکی پێدا دەکێشێت بۆ لەیەک جیاکردنەوەیان یاخود بۆ سەلماندنی زوڵم لێکردنەکەی لە کەسە عیبرانییەکەی لە گەلی ئیسرائیلە، حەزرەتی مووساش مەبەستی کوشتنی نییە، بەڵکو پێداکێشانێکی ئاساییە و قبطییەکە دەمرێت و بەدەستی حەزرەتی مووسا عَلَيهِ السَّلَام دەکوژرێت. حەزرەتی مووسا لەناو میسرییەکان و ئیسرائیلییەکان وا ناسراوە کە هەوڵی چاکسازی و لە نێوەندگیری خەڵکی شاردایە بەگشتی، چونکە هەروا کوێرانە دەمارگیری گەل و هۆزی نییە بیر لە پشتگیری هۆزەکەی خۆی بکاتەوە، لێرەدا باسەکە لەوەدایە کە میسرییەکە زوڵمی کردووە، جیاکردنەوەی دوو گەلە جیاوازەکە بەهۆکاری دەسەڵاتداری یەکێکیان بووە، وەکو سەید قوطب دەڵێت: ئەو کەسە لە دەستەو پێوەندی کۆشکی فیرعەونی بووە.

پێدەچێت عیبرانییەکەش لە بازاڕدا خواردن و سەوزە و میوە فرۆش بووبێت، بەهۆکاری کڕین و فرۆشتن لەگەڵ میسرییەکدا تووشی دەمەدەمێ و شەڕکردن بووبن، هاوارکردنی عیبرانییەکەش بەو هۆکارە بووە کە مووسا لەدارودەستەی کۆشکی فیرعەونی بووە، بۆیە داوای هاوکاری و فریاکەوتنی لێدەکات، مووسا کەسێکی زاڵمی کوشت هەرچەندە نییەت و مەبەستی کوشتنی نەبوو قەدەری خوای گەورە بوو، دەست بەجێ مووسا لەکارەکەی پەشیمان بوویەوە، چونکە دەیزانی کوشتنی کەسێکی میسری هیچ لە ڕووداوەکان ناگۆڕێت، بەڵکو ئازار و ئەشکەنجە زیاتر دەبێت بۆ گەلی ئیسرائیل، ئەوەی کە کوژراوە کەسێکی ئاسایی ناو بازاڕ نییە، مووسا لەوە دەترسێت کە ڕەوشەکە زیاتر نائارام بێت لەلایەن فیرعەونەوە، بەهەرحاڵ لەو کارەی ئەنجامی داوە کە بە مستەکۆڵەیەک یان بە هەردوو دەستی لە توڕەبوونی خۆیدا کە زوڵمی لە عیبرانییەکە کردووە بەهێز و بازووی خۆی پێیدا کێشاوە و کوشتویەتی لێی دەرباز دەبێت و کەس بەو حاڵە نازانێت، تەنها ئەو کەسە نەبێت کە لە گەلی ئیسرائیلە بۆیە پەشیمانی دەردەبڕێت و داوای لێخۆشبوون دەکات لەخوای گەورە و خوای موتەعالیش لێی خۆش دەبێت، بڕیاریش ئەدات کە تاوانەکەی داپۆشێت و بێ دەنگ بێت لەوەی کردوویەتی تا بیانوو و هەنجەت نەدا بە دەستەوە بە پیاوانی فیرعەون.

مووسا عَلَيهِ السَّلَام بۆ ئەوەی بزانێت کەسێک لەدارودەستەی فیرعەون زانیویەتی دێتەوە هەمان جێگا، پێدەچێت تەرمی میسرییەکە لەو ناوە دوورخرابێتەوە بۆ جێگا و شوێنێکی دیکە، بۆیە ئەو کەسەی کە عیبرانییە لەو جێگایەدا ماوەتەوە و هیچ پرس و لێکۆڵینەوەیەکی لەگەڵدا نەکراوە، بەڵام شار پڕە لە پیاوانی فیرعەون بەدوای بکوژی چێشتلێنەرەکەی کوشک دا دەگەڕێن، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَأَصۡبَحَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا ٱلَّذِي ٱسۡتَنصَرَهُۥ بِٱلۡأَمۡسِ يَسۡتَصۡرِخُهُۥۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِيّٞ مُّبِينٞ ﴿١٨﴾ فَلَمَّآ أَنۡ أَرَادَ أَن يَبۡطِشَ بِٱلَّذِي هُوَ عَدُوّٞ لَّهُمَا قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقۡتُلَنِي كَمَا قَتَلۡتَ نَفۡسَۢا بِٱلۡأَمۡسِۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ رَجُلٞ مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلۡمَلَأَ يَأۡتَمِرُونَ بِكَ لِيَقۡتُلُوكَ فَٱخۡرُجۡ إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾ فَخَرَجَ مِنۡهَا خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢١﴾﴾القصص

واتە: لە کاتی بەیانیدا هاتە ناو شارەوە بەڵام ئەترسا و چاوی ئەگێڕاو چاودێری ئەکردو ئاوڕی دەدایەوە هەر ئەو پیاوە بەنی ئیسرائیلییەی کە دوێنێ داوای سەرخستنی لە مووسا کرد دیسانەوە لەگەڵ کەسێکی تری (قیبطي)دا شەڕێتی کە ئەو (قیبطي)یە دیسان ئەیەوێ بێگاری پێ بکات و بە زۆر ئیشی پێ بکات و پارەی پێ نەدات و زوڵمی لێ بکات، دیسان هاواری کردو داوای فریاکەوتنی لە مووسا کردو وتی: ئەی مووسا فریام بکەوەو سەرمبخە بەسەر ئەم (قیبطي)یەدا مووسا کە بینی هەمان پیاوە کە بەهۆی ئەوەوە دوێنێ کەسێکی کوشت، وتی : بەڕاستی تۆ کەسێکی زۆر گومڕایت و خراپەت ئاشکرایە، لەبەر ئەوەی بوویتە هۆی ئەوەی کە من دوێنێ کەسێک بکوژم، ئێستاش ئەتەوێ بێم کەسێکی تر بکوژم﴿١٨﴾ کاتێک کە مووسا ویستی بڕوات لەو (قیبطي)یە بدات کە ئەیەوێ زوڵم لە بەنی ئیسرائیلییەکە بکات کە بەنی ئیسرائیلییەکە داوای فریاکەوتنی لێ کرد کە (قیبطي)یەکە دوژمنی مووسا و دوژمنی کابرای بەنی ئیسرائیلیش بوو، مووسا چووە پێشەوە بۆی، کابرای بەنی ئیسرائیلی لە لاوازی و بێدەسەڵاتیدا وایزانی مووسا بۆ ئەم دێت و لەم دەدات، وتی: ئەی مووسا ئەتەوێ من بکوژی هەروەکو چۆن دوێنێ کەسێکت کوشت، لەوێدا یەکسەر ئاشکرای کرد کە ئەو کوژراوەی هۆزی فیرعەون دوێنێ کوژراوە مووسا کوشتوویەتی وتی: ئەی مووسا کە تۆ خەڵکی ئەکوژی و لە خەڵکی ئەدەیت تەنها مەبەستت ئەوەیە کە خۆت بەسەر خەڵکیدا زاڵ بکەی لەسەر زەوی تۆ ناتەوێ لەسەر زەویدا چاکسازی لە نێوان خەڵکیدا بکەیت﴿١٩﴾ دوای ئەوەی هەواڵ گەیشتەوە بە فیرعەون کە ئەو پیاوە (قیبطي)یەی دوێنێ کوژراوە مووسا کوشتوویەتی، ئەوانیش پیلانیان دانا بۆ ئەوەی مووسا بکوژن، پیاوێک لەوپەڕ و لە دوورترین شوێنی شارەوە بە خێرایی هات و ڕێگایەکی نزیکتری گرتەبەرو زووتر گەیشت وتی: ئەی مووسا ئەو دەسەڵاتدارانە ڕاوێژیان کردووەو پیلانیان داناوە بۆ کوشتنت تۆ لە میسر دەرچۆ من بەڕاستی ئامۆژگاریکارو دڵسۆزی تۆم﴿٢٠﴾ دیسان مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لە میسر دەرچوو بەڵام ئەترسا لە زاڵمەکان کە تۆڵەی لێ بسەننەوە، چاودێریشی ئەکردو ئاوڕی دەدایەوە نەوەکو بێن و پێی بگەن، وتی: ئەی پەروەردگار ڕزگارم بکە لەم قەومە زاڵم و ستەمکارانە﴿٢١﴾.

خوای گەورە سرووشتی مرۆڤی وا دروست کردووە کە ئەگەر هەڵەیەک بکات و کەس پێی نەزانێت ئەوا بەو جێگایەدا دەگەڕێت کە تاوان و هەڵەکەی تێدا ئەنجام داوە، حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لەو کاتەدا نەبووە بە پێغەمبەر تا بە وەحی ئاراستە بکرێت و گومانیش لەوەدا نییە کە مرۆڤ بووە دەرنەچووە لە جنسی مرۆیی خۆی بووە و هەموو ئیحساس و هەست و نەستەکانی هەبووە، جا کاتێک قورئان دەفەرموێت ﴿يَتَرَقَّبُ﴾ واتا گەڕایەوە ئەو جێگایەو مورافەقە و چاودێری دەکات تا بزانێت چ باسە، ترس و دڵەڕاوکێی پێوە دیارە لەناو شاردا، دەترسێت لەوەی فیرعەون بەکارەکە بزانێت ئەم ترسەش زۆر سرووشتییە، حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ مرۆڤە و دەبێت ئەو حاڵەتەی بۆ دروست ببێت.

لەلایەکی ترەوە کەسە عیبرانییەکە هەواڵی کوشتنی میسرییەکەی لەناو گەلی ئیسرائیل دا بڵاو کردەوە و خەڵکی شار زۆر دڵخۆش بوون کە کەسێکی میسری کوژراوە بەدەستی عیبرانییەک کە حەزرەتی مووسایە، هەموو شانازی دەکەن بەو کارەوە چونکە داخ لەدڵن.

لێرەو لەوێ دەنگۆ وا بڵاوبوویەوە کە مووسا کارەکەی ئەنجام داوە، ئەم هەواڵەش لای میسرییەکانی ناو بازاڕ بڵاوبۆتەوە حەزرەتی مووسا بۆ ڕۆژی دوایی دێتە ئەو جێگایەی دوێنێ کە میسرییەکەی تیا کوژراوە، لای کابرای بەقاڵ لەبازاڕدا چاودێری دەکات لەپڕ میسرییەکی تر دێت و بەهەمانشێوەی دوێنێ میسرییەکەی تر بیانوو بە عیبرانییە بەقاڵەکە دەگرێت و زوڵمی لێدەکات. حەزرەتی مووسا وەکو سەید قوطب دەڵێت: کەسێکی توڕە بوو ناحەقی پێقبوڵ نەکراوە بۆیە زوو هەڵدەچێت و دیسان پەلاماری میسرییەکە دەدات، میسرییەکەش لە هێزوبازووی مووسا دەترسێت و خێرا تاوانەکەی دوێنی ئەدات بەسەر مووسادا ، چونکە گوێی لێبووە کە عیبرانییەکان خۆشحاڵ بوون و درکاندوویانە، بۆیە دەڵێت بە مووسا دەتەوێت بمکوژی وەکو چۆن دوێنێ کەسێکت کوشت، تۆ دەبێت چاکەخواز و چاکساز بیت[١٥] کەچی زۆرداریت و دەتەوێت زۆرداری بکەیت.

هەرچەندە زۆرێک لە زانایانی ڕاڤەکار دەڵێن کە عیبرانییەکە ئەو قسەیەی کردووە ڕای زۆرینە لەسەر ئەوەیە کە وتەی کابرای عیبرانی بێت، بەڵام (نووسەر) ڕای ئەو ڕاڤەکارانە هەڵدەبژێرم کە میسرییەکە ئەو وتەیەی بە حەزرەتی مووسا وتووە.

زۆر دەگونجێت کاتێک عیبرانییەکە هاواری کردبێت بۆ مووسا لە ئەنجامی هاوارەکەی عیبرانییەکە بۆی ڕوون بووبێتەوە کە مووسا کەسەکەی دوێنێ کە کوژراوە کوشتبێتی، دەشێت

---

[١٥] موسا علیە السلام بەوە ناسرابوو کە هەوڵی چاکسازی ئەدات.

عیبرانییەکە بە نیازی خۆی تەنها وتبێتی ئەوە ئەمیش دەیەوێت دەستدرێژی و زوڵم بکات وەکو کەسەکەی دوێنێ و هاوارەکەی لە مووسا ئەم وتەیە بووبێت.

هەردوو تەفسیرەکان گونجاوە لە ئەنجامی ئەم درک و پێزانینە مووسا ئاشکرا دەبێت و فیرعەون فەرمانی دەستگیرکردنی ئەدات و خەڵکی خۆی یان سەربازەکانی دەنێرێت بۆ دەست بەسەرکردنی. گومانی تێدا نییە مووسا لەناو کۆشکی فیرعەون دا ژیاوە، بەدڵنیاییەوە خەڵکێکی هەیە خۆشیان دەوێت و کاری لەگەڵ دا دەکەن، بۆیە خێرا فەرمانی دەست بەسەرکردنی لەلایەن کەسێکی ناو کۆشک دەگات بە مووسا، ئامۆژگاری دەکات کە هەڵبێت و ناوچەکە بەجێ بهێڵێت، جارێکی تر بە وریایی چاودێری جەنابی مووسا دەیەوێت ڕزگاری بێت لە دەستیان، بۆیە سەرەتا ڕوو دەکاتە خوای پەروەردگار داوای ڕزگار بوون دەکات لەدەستیان.

حەزرەتی مووسا ڕێگای دوورو درێژ دەگرێتە بەر بە دەشت و شاخ و بیابان دا تا لەدەستی فیرعەون ڕزگاری ببێت، ڕوودەکاتە ناوچەی پێغەمبەرێک کە پێشتر بانگەواز و خواناسی ئایینی ئیسلامی حەنەفی ئیبراهیمی تێدا بڵاوە ئەویش شاری مەدیەنە.

خوای موتەعال دەفەرموێت:

﴿وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهْدِيَنِي سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ۝٢٢ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِۖ قَالَ مَا خَطْبُكُمَاۖ قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُۖ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ۝٢٣ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ۝٢٤﴾ القصص

واتە: کاتێک کە ڕووی کردە (مەدیەن) ڕێگای نەئەزانی، وتی: بەڵکو خوای گەورە ڕێگای ڕاستم نیشان بدا بۆ ئەوەی بگەم بە (مەدیەن) و ڕێگاکە ون نەکەم۝ کاتێک کە گەیشتە سەر ئاوێک کە لە (مەدیەن) بیریان هەبوو شوانەکان مەڕیان دەهێناو ئاویان دەدا خەڵکانێکی زۆری بینی لەوێ ئاو بە ئاژەڵەکانیان ئەدەن، لە دووریشەوە لە دوای هەموویانە دوو ئافرەتی بینی کە ڕێگری لە ئاژهەڵەکانیان ئەکەن و نایەڵن بچنە پێشەوە بۆ سەر ئاوەکە، مووسا عَلَيْهِ السَّلَام بەزەیی پێیاندا هاتەوەو پێی وتن: ئێوە چیتانە بۆ نایەلن ئاژەڵەکانتان بچێتە سەر ئاوەکەو ئاویان نادەن؟ وتیان: عادەتی ئێمە وایە ئاو بە ئاژەڵەکانمان نادەین و پەلە ناکەین تا خەڵکی هەمووی ئاو بە ئاژەڵی خۆیان ئەدەن و چۆڵ ئەبێ بۆ ئەوەی تێکەڵیان نەبین، باوکیشمان پیاوێکی بە تەمەن و بەساڵاچووەو توانای ئەوەی نییە کە ئاو بە ئاژەڵەکان بدات۝ ئاوی بە ئاژەڵەکانیان دا پاشان

چووە سێبەری دارێک و دانیشت فەرمووی: ئەی پەروەردگار خێرم پێ بکە من زۆر پێویستم بە خێرو چاکەی تۆیە(٢٤).

هەڵبەت مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ نەیدەزانی شاری مەدیەن لەکوێدایە و پێشتر پلانی بۆ دانەنابوو، بەڵکو زۆر بە ئاسایی ملی ڕێگای گرت و خوای گەورە ویستی وابوو کە بەرەو ئەو ناوچەیە بڕوات، چونکە پێشتر جێگای حەزرەتی شوعەیب بووە، نوێترین پێغەمبەرەو خەڵکی ئەو ناوچەیە شوێنکەوتووی ئایینی شوعەیین.

حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لە ڕێگای گرتە بەر داوای لە خوای گەورە کرد کە ڕێنوێنی بکات بۆ جێگایەکی باش و بتوانێت تێیدا بحەسێتەوە.

لەڕاستیدا ڕێگای مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ هەروا ئاسان نەبوو، بەڵکو زۆر سەخت بوو بەتەنها بێ دەلیل و چاوساغ، لەپڕ کەسێک لە کۆشکەوە ئاگاداری کردەوە ڕابکات و بێ توێشووی ڕێگاو زاد، لەکاتێکدا مووسا لەناو نازو نیعمەتی کۆشک دا ژیاوە وا ئێستا بەتەنها و بێکەس ملی ڕێگای دوورو درێژی بیابانی گرتۆتە بەر و بەرەو باشووری شام و باکووری حیجاز تا دەگاتە جێگایەکی ئاوەدانی، ئینجا دیمەنێکی زۆر سەرنج ڕاکێش و غەریب دەبینێت، لێرەوە کۆتای بە ئازار و ناڕەحەتی ڕێگاو سەختی دێت و دەگاتە ئاوەدانی.

لە ئاوەدانیدا دەبینێت پیاوانی شوانی دەڤەرەکە مەڕەکانیان ئاودەدەن، بەڵام دوو ئافرەت وەستاون و چاوەڕوانی تەواوبوونی ئەوانن، مووسا زۆری لا سەیر دەبێت چونکە خەڵکی خاوەن شەهامەت و عیزەت هەرگیز پێش ئافرەتان ناکەون، دەبوو ئافرەتەکانیان پێش بخستایە، مووسا بەم ڕەفتارە ڕازی نییە بۆیە خێرا دەپرسێت لە ئافرەتەکان بۆچی لێرەدا چاوەڕوانن؟

دوو خانمەکەش لە وەڵامدا وتیان: تێکەڵ نابین بە پیاوان و ئێمە شوانی ئەم مەڕانەین و باوکمان پیاوێکی پیرە و توانای کارکردنی نییە، یاخود توانای شوانی نییە و ئێمە کارەکە ئەنجام دەدەین، بەڵام تێکەڵ نابین و چاوەڕوانین تا شوانە پیاوەکان تەواو دەبن.

مووسا دەستبەجێ دەستی کرد بە ئاودانی مەڕەکانیان نە وتی ماندووم و برسیمە و هاوکاریم بکەن، بەڵکو بەئەرکی سەرشانی زانی و دوای تەواوبوونی چووە بن سێبەرێک و لێی دانیشت بۆ پشوودان، ئینجا پاڕایەوە لەخوای پەروەردگار کە برسییەو هەژارەو بێ دەرەتانە، بەوپەڕی زەلیلی و گەردن کەچییەوە، خوای گەورە لەماوەیەکی زۆر کەمدا و نزا و موناجاتەکەی گیرا کرد و لەپڕ ئافرەتێکی بەشەرم و شکۆ هات یەکێک بوو لە شوانەکان و بە مووسای وت، باوکمان بانگت دەکات تا پاداشتی ئەو کارەت بۆ بکات کە مەڕەکانت ئاوداوین، خوای گەورە دەرگای ڕەحمەتی لە حەزرەتی مووسا کردەوە، گومانی تێدا نییە کە بەگەڕانەوەی کچەکان بۆلای باوکیان

باسی شەهامەت و چاکەکاری ئەم لاوەیان کردووە بۆی، باوکیشیان بە ئەزموونی خۆی و ژیانی کەسی وا بەشەهامەت و خاوەن ڕێز پێویستە پاداشت بکرێت و کاری پێبدرێت.

بانگێشت و میوانداریيەکەی مووسا لە ئاستی چاکەی خۆیدابوو، خۆ ئەگەر ئەو کارە باشەی ئەنجام نەدایە بە دڵنیاییەوە وەکو هەموو پیاوانی تری دەڤەرەکە ناوی نەدەبوو و میوانداریش نەدەکرا، کەواتە (الجزاء من جنس العمل).

کاتێک مووسا عَلَيهِالسَّلَام گەیشتە لای پیاوە پیرەکە و دەردە دڵی خۆی بۆ گێڕایەوە و باسی ژیان و حاڵوگوزەرانی بۆ کرد، ئەویش گوێی بۆ گرتبوو (لە ڕیوایەتی ئەهلی کیتابدا هاتووە کە گوایە مووسا شەڕێکی گەورەی کرد لەگەڵ شوانەکاندا تا مەڕەکانی ئاوداوە، هێزو توانای مووسایان بۆ باوکیان باسکردووە پاشان باوکی کچەکان داوای لێ دەکات کە بەکرێی بگرێت و ببێتە شوانیان، بەڵام پێناچێت وابێت، چونکە ئاودانی مەڕ شەڕی ناوێت)، دەشێت هێزو بازووی مووسا سەرنجی کچەکانی ڕاکێشابێت و چاکەو پیاوەتی لێ وەشاوەتەوە ئەمانەیان بۆ باوکیان باسکردبێت، پێدەچێت باوکیشیان زۆر دەمێک بێت بەدوای پیاوێکی ئازا و چاپوک و بەهێزدا بگەڕێت بۆ ئەوەی بەکرێی بگرێت و شوانی پێبکات، لەدوای گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی یەکێک لە کچەکان زانی کە ئەم کەسە پێویستی بە کارکردن و خۆراک و جێگای مانەوە هەیە داوای کرد لە باوکی کە شیاوە بۆ ئەو کارەی ئەوان و بیری خستەوە کە زۆر دەمێکە بە شوێن کەسێکی وادا دەگەڕێت.

خودی ئەم شێخە پیرە و باوکی ئەم دوو کچە کەسێکی خواناس و لە بنەماڵەی پێغەمبەرانە، ناوی (یثرون/یەسرون)ە کوڕی برای حەزرەتی شوعەیب-ە، هەندێک دەڵێن گوایە خودی حەزرەتی شوعەیبە، ئەم وتەیە گونجاو نییە لە ڕووی مێژووییەوە و ناکرێت بنەماڵەی پێغەمبەرێک کە لە سەردەمی شوعەیب گەلەکەی لەناوچووە ئەم جیلە یەکەم جیل بێت، بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ پێغەمبەر و کچی پێغەمبەرەکەیاندا بکەن، بۆیە (نووسەر) لەسەر ڕای ئەو زانایانەیە کە پێیان وایە ئەو شێخە پیاوچاکێک بووە و پەیوەندی نەبووە بەسەر پێغەمبەرایەتی و حەزرەتی شوعەیبیش نەبووە.

باوکی دوو کچەکە یەسرون وتی: مووسا چیتر مەترسە!

چونکە چەندە پێویستی بە خۆراک و جلوبەرگ و شوێنی مانەوەیە ئەوەندەش پێویستی بە ئارامی و ئاسایشە، هەربۆیە دڵنیایی کردەوە کە فیرعەون و سەربازەکانی دەستیان ناگاتە مەدیەن و ئارام بە، ڕزگارت بووە لە دەستی زاڵمان و کەس ناتوانێت زەرەرو زیانت پێ بگەیەنێت، دیارە فیرعەون هیچ دەسەڵاتی لە ناوچەی مەدیەن دا نەبووە.

ئینجا دەنگی کچەکان بەرز دەبێتەوە چونکە زۆر گیرۆدە و سەختییان چەشتووە بەدەست شوانییەوە، یەکێک لە پیشە زۆر سەختەکان بووە، چەندە کارەکە سەخت بووە دوو ئەوەندە بۆ کچەکان سەختتر بووە کە پیاوانی تر شوان بوون ئەمانیش خۆیان لە تێکەڵاو بوونیان پاراستووە.

چونکە ئافرەتی پاک و بێگەرد ئافرەتی دڵساف و خواناس حەز بە تێکەڵاوی ناو پیاوان ناکات، چونکە بە سرووشتی پاکی فیطرەتی وایە تەنها بۆ هاوسەری ڕاوەستاو و خزمەتگوزار بێت، چیتر حەزیان بە کاری سەخت نییە، مادام خوای گەورە گەنجێکی بەهێز و بەڕەوشتی ناردووە پێویستە لەدەستیان دەرنەچێت، هەر ئەمەش وای کرد لەو کچە پاک و بەڕەوشتانە کە داوا لەباوکیان بکەن کە بەکرێ بیگرێت و بیکاتە شوانی مەڕەکان.

لە ئێستادا هەردوولایان پێویستیان بەیەکترە، بۆیە باوکەکە پێشنیاری کچەکەی لاجوان و پەسەند بوو، بۆیە خێرا داوای کرد کە مووسا بهێنێتەوە و کۆنتراکتی کارکردنی لەگەڵ بەست، هەندێک وا تەفسیری دەکەن گوایە ئەو کچە حەزی لە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ کردووە، بەو هۆکارە بووە داوای کردووە لەباوکی کە بهێنێتەوە، ئەم وتەیە هیچ بنەمایەکی نییە، چونکە کەسێکی غەریب و نەناسراو بووە، پاشان ئیبن عەباس دەڵێت: ئەو ماوەیەی کە لە میسرەوە بەڕێکەوت بۆ مەدیەن مووسا هیچ خواردنێکی پێنەبوو، گەڵای دارو گژوگیای دەخوارد، تەنانەت نەعلەکانی لە پێدا دڕا بوو بە پێی پەتی ڕێی دەکرد، موحتاجی لەتە خورمایەک بوو، هەر بۆیە دوعای کرد کە خوای گەورە یارمەتی بدات و بێدەرەتان و سک برسی و ڕووت و ڕەجاڵ و پێ پەتییە، ڕووداوەکە لە سەرنج ڕاکێشانەوە بووە گەنجێک بەو حاڵە و بەو شێوەیە خاوەنی عیزەتی نەفسە، سکی نووساوە بە پشتییەوە لە برسا بەڵام هاوکاری خەڵکی ترە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ قَالَتۡ إِنَّ أَبِي يَدۡعُوكَ لِيَجۡزِيَكَ أَجۡرَ مَا سَقَيۡتَ لَنَاۚ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيۡهِ ٱلۡقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفۡۖ نَجَوۡتَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٢٥ قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ٢٦ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ٢٧ قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَۖ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ٢٨﴾القصص

واتە: دوای ئەوەی کە دوو ئافرەتەکە ئەمڕۆ زوو گەیشتنەوە ماڵەوە باوکیان پرسیاری لێ کردن چۆن وا زوو هاتنەوە؟ بۆیان گێڕایەوەو وتیان :پیاوێک ئاوی ئاژەڵەکانی بۆ داوین، ئەویش ناردی بە شوێنیداو یەکێکیان بە شەرمەوە هاتەوە بۆ لای موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ وتی: بە دڵنیایی باوکم بانگت ئەکات تا پاداشتت بداتەوە لەسەر ئەوەی کە تۆ ئاوت بە ئاژەڵەکانمان داوە، کاتێک

مووسا عَلَيْهِ السَّلَامْ هات بۆ لای باوکیان چیرۆک و بەسەرهاتی خۆی بۆی گێڕایەوە کە لە میسر چی بەسەرهاتووە، باوکیان وتی: ئەی موسا عَلَيْهِ السَّلَامْ مەترسێ بەڕاستی تۆ لە قەومێکی ستەمکار ڕزگارت بووە کە فیرعەون کەسێکی زۆر ستەمکارە، وتراوە: ئەم پیاوە شوعەیب پێغەمبەر بووە -صلى الله عليه وسلم -کە ئەوە بۆچوونێکی تەواو نییە، چونکە شوعەیب پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامْ زیاتر لە چوارسەد ساڵ پێش مووسا عَلَيْهِ السَّلَامْ بووەو نزیک بووە لەسەردەمی ئیبراهیم پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامْ وتراوە: برازای شوعەیب بووە، و وتراوە: پیاوچاک و موسڵمانێک بووە لە عەشیرەتی شوعەیب و لەسەر ئایینی شوعەیب پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامْ بووە ﴿٢٥﴾ یەکێک لە کچەکان وتی: ئەی باوکە بە کرێی بگرە تا شوانیمان بۆ بکات بەڕاستی ئەمە باشترین کەسە کە تۆ بە کرێی ئەگری، لەبەر ئەوەی زۆر بەهێزو ئەمینە، باوکی وتی: چۆن دەزانیت؟ وتی: بەهێزە چونکە بینیمان چۆن بەردی سەر بیرەکەی لابردو لە بیرەکە ئاوی بۆمان دەرکردو ئاوی ئاژەڵەکانیدا، کەسێکی زۆر ئەمینیشە، لەبەر ئەوەی کە چووم بە دوایدا مووسا عَلَيْهِ السَّلَامْ لە پێشەوە ئەڕۆی و پێی وتم: ئەگەر ڕێیەکەم هەڵە کرد بەردێک تێگرە دەزانم و لەوێوە دەڕۆم، نەک کچەکە لە پێشەوە بڕوات و ئەم لە دوایەوە بڕوات، بۆیە وتی: کەسێکی زۆر ئەمینە﴿٢٦﴾ پیاوەکە وتی: ئەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامْ من ئەمەوێ یەکێک لەم دوو کچەی خۆمت لێ مارە بکەم تۆیش هەشت ساڵ شوانیم بۆ بکە ئەگەر دە ساڵیشم بۆ تەواو بکەی ئەوە لە چاکەی خۆتە، من نامەوێ تووشی مەشەقەو ناڕەحەتیت بکەم بڵێم ئیلا ئەبێ دە ساڵ شوانیم بۆ بکەی، ئەگەر هەشت ساڵ بکەی بەسە، ئەگەر دە ساڵیشت کرد ئەوە لە چاکەی خۆتە إن شاء الله ئەمبینی من کەسێکی چاک ئەبم و بە چاکە مامەڵەت لەگەڵدا دەکەم﴿٢٧﴾ مووساش عَلَيْهِ السَّلَامْ وتی: ئەمە بەڵێنێک بێت لە نێوان من و تۆدا هەر کام لەو دوو ماوەیەم بەسەر برد هەشت ساڵەکە یان دە ساڵەکەوە زوڵمم لەسەر نییە، واتە: داوای زیاترم لێ مەکە خوای گەورەش شاهیدو پارێزەرو ئاگادارە لەم مەرجەی کە دامانناوە﴿٢٨﴾.

خوای موتەعال کەباسی بە شەرم و حەیای ئەو کچە دەکات، هەروا لە بنەماڵەیەکی سادە پەروەردە نەبووە، ئەو حاڵوگوزەرانەی مووسا بۆتە هۆکاری بەزەیی هاتنەوە، بەڵام لەگەڵ باوکیان دادەنیشێت و خۆی پێدەناسێنێت، مووسا لە بنەماڵەی پێغەمبەرانە، ئیبن عەباس دەڵێت: برازای حەزرەتی شوعەیبە، پیاوێکی دەوڵەمەندی ناو شاری مەدینە، بەم پاوپێوەندە هەردوو لایان یەک بەرەبابن و دەچنەوە سەر ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامْ ئەگەر لە عیصۆ و یەعقوب دا جیاوازیان هەبێت، پێویستە لەسەر ئەم پیاوە پیرەی ناو شاری مەدیەن هاوکاری بکات، بۆیە داوای کارکردن و کۆنتراکتی ٨ ساڵ کارکردنی لێدەکات و ئەگەر مووسا ڕازی بوو بە ١٠ ساڵ کارکردن لەگەڵیدا، ئەو دوو ساڵە لە کەرەمی حەزرەتی مووسایە عَلَيْهِ السَّلَامْ.

ئەی ٨ ساڵ کارکردن پاداشتی چییە؟ مارەکردنی یەکێک لە کچەکانیەتی، هەردوولا بەم بڕیارە ڕازی بوون وا مووسا لە ڕووت و ڕەجاڵی بووە خاوەنی ماڵ وخێزان و کار و کەسابەت.

کۆنتراکتەکە لە نێوانیاندا بەستراو خوای گەورە بە شاهید و پارێزەر لەنێوانیاندا بوو، لە فەرموودەدا هاتووە کە مووسا ١٠ ساڵ کاری کردووە لە مەدیەن، بوخاری لە فەرموودەدا هێناویەتی لە خانەی پەیمان بردنە سەر، بەڵام گوایە مووسا بە نانەسکی کاری کردووە و وتوویەتی پیشەی من هەڵگرتنی بەردو شکاندنی بەردە و ڕێگای دروست کردووە بۆ ئەو پیاوە پیرەی مەدیەن، جۆری زیخ و چەوی بۆ جیاکردۆتەوە بۆ ئەوەی بە دەنگی زیخ و بەردەکاندا ڕێگاکە بناسێتەوە، ئەو وتانە هەموو (ضعیف، مجهول و موضوع)ن بنەمای ڕاستی نییە.

ئەو ماوەیە مووسا لەناوچەی مەدیەن مایەوە خەریکی کارکردن و پێکهێنانی خێزان و داڕشتنەوەی کەسایەتی خۆی بوو، ئەو زەمەنە بۆ مووسا زۆر گرنگ بوو چونکە ماوەی پێغەمبەرایەتی لەوێوە دەست پێدەکات.

## کۆی گشتی باس پێش پێغەمبەرایەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ

هەروەکو لە سەرەتای کتێبەکەدا ئاماژەمان پێداوە کە ژیانی پێغەمبەران لەیەک دەچن، هەموو ئازار و ناڕەحەتی زۆریان چەشتووە بەگشتی، دەربەدەر کراون لە زێد و مەڵبەندی خۆیان هەڵکەندراون ئەمەش حیکمەتی تێدایە، بۆ ئەوەیە کە شوێنکەتوانیان وەکو ئەوان ئارامگربن، هەنجەتیان نەبێت بڵێن پێغەمبەران لە خۆشی و شادی و ناڕەحەتیدا بوون، بۆیە دەبێت شوێنکەتووانیان لە ئازار و ناڕەحەتیدا بن.

هیچ پێغەمبەرێک نەبووە کە ئازار و ناڕەحەتی نەچەشتبێت، جا لە دەربەدەری و منداڵ و کەسوکار مردن، برسێتی و دووربوون هیجرەت و ڕاوەدوونان...هتد. مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ هەر لە کۆرپەلەییەوە لە ئازار و ناڕەحەتی دابووە، دەربەدەر و دوورکەوتوە بووە، حیکمەتی ئەم ئازار و ناڕەحەتیانە بۆ ئەوەیە خوای گەورە ڕایدەهێنێت بۆ ئەرکی گەورەتر تا بتوانێت زیاتر بەرگەی ناڕەحەتی و ئازار و دەربەدەری بگرێت.

کەواتە لەوانەی ژیانی پێش پێغەمبەرایەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ دەبێت موسڵمان هەروا هەوانتە و هەڕەمەکی نییە، بەڵکو مرۆڤ نابێت لە ئازار و دەربەدەری و زیندان و ڕاوەدوونان بترسێت، چونکە بە دڵنیاییەوە پەروەردەی خواییە بۆکاری گرنگتر، خوای گەورە موسڵمانان تووشی ناڕەحەتی و فیتنە دەکات تا ڕاستگۆ و سەر ڕاستەکان دەربکەون، دەفەرموێت:

﴿أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ۝ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ۝﴾ العنكبوت

واتە: ئایا خەڵکی وا گومان ئەبەن و وا حساب ئەکەن کە وازیان لێ بهێنین تەنها بەوەی کە بڵێن ئیمانمان هێناوەو تاقی نەکرێنەوە، واتە :ئەوە گومان بردنێکی هەڵەیەو ئیلا تاقیتان ئەکەینەوە﴿٢﴾ بەدڵنیایی ئوممەتانی پێش ئێوەیشمان تاقیکردۆتەوە ئەوانەی کە بە زمانیان ئەڵێن: ئێمە ئیمانمان هێناوە تا دەربکەوێ و خوای گەورە ببینێت کە کێ ڕاستگۆیەو کێ درۆزنە، تا عوزرو بیانوویان نەمێنێت بۆ قیامەت﴿٣﴾.

کەواتە ناڕەحەتی و ناسۆر و دەردەسەری سوننەتی پێغەمبەرانە و هەروەها نزیک بوونەوەیە لە خوای پەروەردگار، خوای گەورە وەڵامی نزا و موناجاتی مووسای دایەوە کە برسی و پێپەتی و ڕووت و ڕەجاڵ بوو، مرۆڤ لەخۆشیدا بوو زۆر دوورە لە خوا کە لەناسۆر و ناڕەحەتیدا بوو زۆر نزیکە لە پەروەردگاری بە ئیخلاص دوعا دەکات، بە نیەتی ساف و پاک بەندایەتی و درووشمەکان ئەنجام ئەدات. یەکێکی تر لە وانەی ژیانی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بریتییە لە پشتگیری لاوازو هەژار و زوڵم لێکراوەکان، مووسا لە پلەوپایەی زۆر گەورەدا بوو لە کۆشکی فیرعەونی و جوانترین و باشترین جلوبەرگ و خواردنی دەخوارد، بەڵام لەئاستی زوڵم و زۆردا خۆی پێنەگیرا، مرۆڤ کە خواناس بوو هەرگیز ناچێتە بەرەی زاڵمان بەڵکو لەگەڵ مەزڵومدایە، ئایینی خوایی ڕۆحی شۆڕشگێڕی دەکات بە بەرگی خواناسان دا چابوک و ئازا و چاونەترسیان دەکات، ئەم ڕۆحی شۆڕشگێڕییە لە ئادەمە وە تا خاتەم دەبینرێت.

سەرەتای هاتنی ئیسلام شۆڕش بوو لە ئاسمان و زەوی دا، شۆڕشیش واتا لابردنی سیستەمێک و لە جێگایدا سیستەمێکی تر دابنرێت، بۆیە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ پێش پێغەمبەرایەتی ڕۆحی کۆشش و شۆڕشگێڕی تێدا بوو، هەوڵی ئەوەبوو کە چاکسازی زوڵم نەهێڵێت.

لێرەدا وانەیەکی تر بەدی دەکرێت ئەویش کارکردنی ئافرەتە، ئافرەت هاوشانی پیاو دەتوانێت کاری تر بکات لە دەرەوەی ماڵەکەی، بەو مەرجەی تێکەڵاوی زۆر ناپەسەند ڕوونەدات، وەکو ئەوەی کە لە ئێستادا دەبینرێت، لە حاڵەتێکدا ئەگەر خانەوادەو خێزانەکان پێویستیان بەوە بوو کە ئافرەتان کار بکەن، ئافرەتیش دەتوانێت پلەو پایە و مەنصەبەکان ببڕێت پاشان هاوسەرگیری بکات و خێزان دروست بکات کە ئەرکێکی پێویستە بۆ هەموو کەس بە تایبەت بۆ بانگخواز و ئەوانەی کە ئەرکی زیاتری بانگەوازیان لەسەرشانە، چونکە هاوسەرەکانیان ئارام تر و لەناو کۆمەڵگەدا پەسەندتر دەبن کە سەنەد و پشتیوانییەکی زۆر گرنگە بۆ هەردوولا.

هەروەکو بنەماڵەکان دەگەڕێن بە دوای کەسی باشدا بۆ کوڕەکانیان، بە پێچەوانە دەبێت خانەوادەی کچەکانیش بگەڕێن بەدوای خانەوادەی باشدا تا کچەکانیان بدەن بە شوو، هەروەها زۆر گرنگە ڕەزامەندی بە شوودەر و بەشوودراو و هاوسەرگیر لەو ئێوەندەدا هەبێت.

خاوەن ڕەوشتی تەندروست و بەرز بدۆزنەوە و بەشوێنیدا بگەڕین، پاشان دەستگیرۆیی لێ قەوماو و بێکەسەکان و دۆزینەوەی مەئوا و دامەزراندنیان لەسەر کار و پیشە و یارمەتی دانیان بۆ دروستکردن و پێکهێنانی خێزان و دامەزراندن و پێگەیاندنی بۆ باشە وچاکسازی تا ببێتە کەسێکی باش لەناو کۆمەڵگەدا و سوود دەبەخشێت نەک وازی لێبهێنرێت بە بیانووی ئەوەی کەس نایناسێت و پەراوێز بخرێت، کەسێکی زیان بەخشی لێدەربچێت و کۆمەڵگە گیربخوات بە دەستییەوە و خەریکی ئەنجامدانی تاوان بێت.

## قۆناغی ژیان و پێغەمبەرایەتی مووسا عَلَيهِ السَّلَامُ

قۆناغی بوون بە پێغەمبەر لەدوای دە ساڵ ژیانی لەناوچەی مەدیەن دەست پێدەکات، مووسا لە تەمەنی ڕووشدایە ٣٥-٤٠ ساڵ، خاوەن خێزان و منداڵ و سەروەت و سامان و مەڕوماڵاتە، پەیمانی خۆی بردە سەر لەگەڵ پیاوەپیرەکەی مەدیەن، لەگەڵ ئەوەی کە زاوای ئەو بنەماڵەیە، بیری کەسوکاری دەکات ئارەزووی گەڕانەوەی هەیە، جا ئەم ئارەزووە بە نهێنییە یاخود ئاشکرا، ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕی کردووە کە مووسا عَلَيهِ السَّلَامُ لە شاری لوکسور ئەنجامی داو میسرییەکی کوشت.

ئێستا پلانی گەڕانەوەی داناوە پێدەچێت بیەوێت بە نهێنی بگەڕێتەوە تەنها بۆ سەردانێک بێت، ئەم وتەیە کە لە مێژوودا هاتووە، چونکە سیمای دەموچاوی گۆڕاوە تا ڕادەیەک و لەوانەیە و ئەگەری زۆرە میسرییەکان نەیناسنەوە یان پێدەچێت خاتوو ئاسیا لەلایەن فیرعەونەوە عەفوی بۆ وەرگرتبێت و لەتاوانەکەی خۆشبوبن.

هەموو ئەم ئارگۆمێنتانە (بیانوو) دەشێت ڕاست بێت، بەڵام لە ڕێگادا کە بەرەو میسر دەگەڕێتەوە هەموو هاوکێشەکان هەڵدەوەشێتەوە، شتێک ڕوودەدات کە مووسا بیری لێنەکردۆتەوە ئەویش پێغەمبەرایەتییە.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿۞ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلْوَادِ ٱلْأَيْمَنِ فِي ٱلْبُقْعَةِ ٱلْمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٠﴾ وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ۚ يَٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ ۖ إِنَّكَ مِنَ ٱلْءَامِنِينَ ﴿٣١﴾

ﭐسۡلُكۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖ وَٱضۡمُمۡ إِلَيۡكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهۡبِۖ فَذَٰنِكَ بُرۡهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ﴿٣٢﴾﴾القصص

واتە: کاتێک کە موسی ماوەکەی تەواو کرد تامەزرۆی وڵات و کەسوکاری بوو، ویستی بە نهێنی بگەڕێتەوە بۆ میسر، و هەندێک مەڕیشی پێ بوو کە خەزووری پێیدا بوو هێنایەوە بۆ میسر، خێزانەکەیشی پێبوو لەشەوێکی زستانی ساردی باراناوی تاریکدا، چەندێک هەوڵی دەدا ئاگری بۆ نەکرایەوە، لەلای کێوی (طور)ەوە لە دوورەوە ئاگرێکی بینی بە خێزانەکەی وت ئێوە لێرە بمێننەوە بە دڵنیایی من ئاگرێکم بینیوە ئەچمە سەر ئەو ئاگرە بەڵکو ئەگەر کەسێکی لێ بوو هەواڵێکتان بۆ بێنمەوە، چونکە ڕێگایان ون کردبوو یاخود پشکۆیەک لە ئاگرەکە دێنم، بەڵکو ئاگری پێ بکەینەوەو خۆمانی پێ گەرم بکەینەوە﴿٢٩﴾ کاتێک هاتە لای ئاگرەکە بینی دارێکی سەوزەو ئاگری گرتووە دەدرەوشێتەوەو نووری خوای گەورەیە لە کەناری دۆڵەکە لەلای ڕاستەوە خوای گەورە بانگی لە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ کرد لەو پارچە زەوییە پیرۆزە لای دارەکە کە لە کەنارەکەدا ڕوابوو، خوای گەورە فەرمووی: ئەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەوەی قسەت لەگەڵ دەکات منم الله پەروەردگاری هەموو جیهان﴿٣٠﴾ ئەو گۆچانەی بەدەستتەوەیە فڕێی بدە تا موعجیزەیەکت نیشان بدەم، کە فڕێی دا بوو بە مارێکی زۆر گەورە، کاتێک بینی ئەو مارە ئەجووڵایەوە زۆر بەخێرایی و زۆر گەورە بوو وەکو جنی، ئەگەیشت بە هەر تاوێرو بەردێکی گەورە قوتی دەدا مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەوەی بینی یەکسەر ڕایکردو پشتی هەڵکردو ڕۆیی ئاوڕی نەدایەو نەگەڕایەوە لە ترسا، خوای گەورە فەرمووی: ئەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ وەرە بگەڕێرەوەو مەترسێ، تۆ ئەمێنی و هیچ زیانێک بە تۆ ناگات﴿٣١﴾ دەستت بخەرە ناو باخەڵتەوە دەستت دەرئەکەی زۆر سپی و جوانەو وەکو مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە، ئەمەیش موعجیزەیەکی ترە بەبێ ئەوەی کە بەڵەک یاخود گەڕوگول بێت، کە ترسایت هەردوو دەستت کۆبکەوەو بیخەرە سەر دڵت ترست نامێنێت و دڵئارام دەبیت ئەمە دوو بەڵگەو حوجەو موعجیزەیە لە پەروەردگارتەوە بۆ تۆ تا بڕۆی بۆ لای فیرعەون و دەسەڵاتداران، بەڕاستی ئەوان قەومێک بوون لە گوێڕایەڵی خوای گەورە دەرچوو بوون﴿٣٢﴾

لەدوای تەواو بوونی ماوەی پەیمانی کۆنتراکتی کارەکەی، مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بڕیاری دا سەردانی کەسوکاری بکات، هەندێک لە ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن: بڕیارەکەی کە بۆ گەڕانەوە دای بڕیاری دا بە نهێنی کەسوکاری ببینێت، بەنیازی ئەوە نەبووە لە وڵاتی میسر بمێنێتەوە، ئەویش دەشێت بەهۆکاری ئەوە بووبێت کە کەسێکی لێ کوشتوون، پاشان فیرعەون لەسەر دەسەڵاتە و خاوەن تواناو هێزە، بەڵام خۆشەویستی و فیطری خانەوادە و خێزان و عەشیرەت هۆکاری سەرەکی گەڕانەوەیەتی، هەرچەندە لە دەستی زاڵم ڕایکردووە، ڕاکردنیش لەدەستی زاڵمان سوننەتی پێغەمبەرانە، واتای ترسنۆکی نییە، بەڵکو واتای خۆ پاراستنە لەدەستی زوڵم و زۆرداریان، وا

مووسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ بە شەودا کەوتۆتە ڕێگا و لەگەڵ خێزان و ئەوانەی کە لەگەڵیدان لەو دۆڵە بەرفراوانە لای ڕاستی تاکە دارێک بەدی دەکات و لای دارەکە ئاگر و ڕۆشناییەکەی دیارە. ئەو سەردەمەش پێداویستی خەڵک بووە بۆ ئاگرکردنەوە، ئاگر لەجێگای ترەوە بخوازن بۆ پێداویستی چێشتلێنان، کردنەوەی ئاگر زۆر سەخت بووە، وەکو پێداویستی سەرەکی بووە لای خەڵکی بەهەرحاڵ مووسا کەسوکاری ئاگادار دەکاتەوە کە چاوەڕوانی بکەن تا دەچێتە لای ئەو ئاگر و ڕۆشناییە، بەڵکو (چزویەک لە ئاگر)، کورد پێی دەڵێت (چزووی ئاگر) لە کۆندا شقارتەو چەرخ نەبووە، چوونەتە ماڵە دراوسێ چزووی ئاگریان هێناوە واتا دارێکی گڕاوی، مووساش عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ بە دوای ئەو چزووە ئاگرەدا گەڕاوە بۆ چێشت لێنانی خێزانەکەی و پشوودانیان لەو دۆڵە بەرفراوانە.

ئینجا مووسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ وتی: لەگەڵ خۆمدا هەواڵێک دەهێنمەوە، دیارە ئەو هەواڵە پێی مەبەستی ڕەوشی وڵاتی میسر بووە، یاخود نیشاندانی ڕێگا بووە بەرەو شاری (طيبة) یاخود لوکسور.

مووسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ کە نزیک بوویەوە لەدارەکە بینی دارەکە نوورە و ئاگرێکی بێ دووکەڵە، لەپڕ لەو دۆڵە کەناوی دۆڵی (طوا/طوى) دەنگێک هاتوو فەرمووی مووسا من خوای بەرز و پیرۆزی تۆم، خوای زانا و حەکیمی تۆم، ئەو دۆڵە بەو دەنگە موبارەک بوو، نەعلەکانی مووسا لەپێستی گوێدرێژ بوو، یاخود هەندێک لەزاناکان دەڵێن نەعلەکانی پیسی پێوە بووە، گومانی تێدا نییە خوای پەروەردگار پاکە و پاکیشی خۆش دەوێت، داوای کرد لە مووسا نەعلەکانی دابکەنێت، پاشان خوای پەروەردگار دەفەرموێت بە مووسا لەناو خەڵکیدا هەڵمبژاردوویت کە پەیامی زاتی من بگەیەنیت، گوی بگرە بۆ ئەوەی بزانیت پەیامەکە چییە، زاتی بەرزی من (الله) یە و هیچ خوایەک و پەرستراوێکی تر نییە بێجگە زاتی بەرزی من، دەبێت هەر زاتی من بپەرستیت و بەندایەتی بۆ هیچ کەس و شتێکی تر نەکرێت، نوێژ بکەن بۆ ئەوەی هەمیشە منتان لە یاد بێت بە هۆکاری نوێژو یادی خواتان سەربەرز دەبن، پاشان قیامەت دێت و هەموو نەفسێک بە گوێرەی کردەوەی چاکەی خۆی پاداشت وەردەگرێت، خۆ ئەویشی سەرپێچی و لاڕێی کرد و ئیمانی نەهێنا و بێ باوەڕ بوو شوێن هەواو ئارەزوو حەزەکانی کەوت ئەوە بە دڵنیاییەوە سەرکەش و لاڕێ و ڕێگای لێ ون بووە، ئەم بەشە لە سورەتی (طه) دا خوای گەورە پەیامەکەی کورت کردەوە بۆ مووسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ.

﴿فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ﴿١٢﴾ وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ

ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا تَسْعَىٰ﴿١٥﴾ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرْدَىٰ﴿١٦﴾﴾ طه

واتە: خوای گەورە بانگی کرد ئەی مووسا﴿١١﴾ نەعلەکانت دابکەنە لەبەر ئەوەی تۆ لەم کێوە پیرۆزە پاککراوەی کە (طُوًى) ناوی دۆڵەکەیە لە زەوی (سەیناء)﴿١٢﴾ من هەڵمبژاردوویت بۆ پێغەمبەرایەتی و پەیام گوێ بگرە بۆ ئەو وەحیەی کە لەلایەن منەوە بۆت دێت و خۆتی بۆ ئامادە بکەو لێی تێبگە﴿١٣﴾ من (الله) م کە بانگت ئەکەم هیچ پەرستراوێک بە حەق نییە شایەنی پەرستن بێ تەنها من نەبێ تاک و تەنهاو بێ شەریکم تۆ بەتاک و تەنها من بپەرستە نوێژیش بکە بۆ ئەوەی یادی منت بکەوێتەوە، هەر کاتێک یادت کەوتەوە نوێژ بۆ من ئەنجام بدە﴿١٤﴾ دڵنیابە کە قیامەتیش دێت و نزیکە لە هەموو کەسێکی بشارمەوە، یاخود تەنانەت لە خۆیشمی بشارمەوە ئیتر ئێوە چۆن دەیزانن، تا هەموو کەسێک پاداشتی خۆی وەرگرێ بەهۆی ئەو کردەوانەی کە لە دونیا کۆششی بۆ کردووەو هەوڵی بۆ داوە﴿١٥﴾ با ئەو کەسانەی کە ئیمان بە ڕۆژی دوایی ناهێنن و شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتوونە، بەهیلاک ئەچن تۆ لانەدەن لە ئیمان هێنان پێی﴿١٦﴾

کورتکردنەوەی پەیامی ئایینی لە تەوحید و پەرستن و هاتنی قیامەت بۆ حەزرەتی مووسای باسکرد لە سێ ئایەت دا، کاری بانگەوازەکەی بۆ ئەو سێ توخمە سەرەکییە دەبێت، بانگەواز دەکات بۆ یەکتاپەرستی لە زاتی بەرزی (الله) هیچ کەس و دروستکراوێک نییە شایەنی خوایەتی بێت و لە هەمانکاتدا هیچ شتێک نییە کە هاوشێوەی خوای پەروەردگار بێت، کە مادام ئەم دەسەڵات و بێ هاوشێوەییە نییە جگە زاتی (الله) خۆی کەواتە دەبێت پەرستنی بۆ بکرێت و بەندایەتی نوێژ و زکر هەر بۆ ئەو زاتە بێت، خوای گەورە لە کەرەم و سەخاوەتی خۆی کە شایستەی خوایەتییە، بە هۆکاری ئەم پەیامە هەرکەس وەریگرت و کاری پێکرد ئەوا ڕۆژێک هەیە کە ڕۆژی قیامەتە و پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، ئەمەش پوختەی پەیامی خوای پەروەردگارە لە هەموو کات و ساتێک دا.

پاشان خوای گەورە هێز و توانا دەبەخشیت بە حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ چونکە فیرعەون خاوەن دەسەڵات و حەشەم و خەدەمە، بۆیە خوای پەروەردگار لە مووسا دەپرسێت ئەوە چییە بە دەستی ڕاستەوە، بە دڵنیاییەوە خوا دەزانێت چییە، بەڵام بۆ ئەوەی کە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ دڵنیا بکاتەوە توانای خوای پەروەردگار بێ وێنەیە و هیچ مەخلوقێک ئەو توانایەی نییە، مووسا فەرمووی: ئەوە گۆچانەو مەڕەکانمی پێ بەڕێوە دەبەم و گەڵای داری پێ ئەتەکێنم و لە ڕێگا

بڕینمدا هاوکارمە، چەند کاری تریشی پێ دەکەم وەکو پاراستنی خۆم لە ئاژەڵی دڕندە و لێکردنەوەی بەروبوومی درەخت...هتد.

لێرەدا پرسیارەکە لە شێوەی لێکۆڵینەوەیە کە پەروەردگار دەیکات لە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ.

پاشان خوای پەروەردگار دەفەرموێت: گۆچانەکەت فڕێ بدە مووسا، مووساش گۆچانەکەی فڕێ دا و بووە مارێکی زەبەلاح فیشکەی دەهات و دەلەرزی وەکو هەموو مارێکی تری گەورە و زەبەلاحی تری ترسناک.

مووسا توانی لە ئاستی دەنگەکەدا خۆی بگرێت، بەڵام کە مارەکەی بینی ترسا و ڕایکرد، ئەمەش سرووشتی مرۆڤە لەهەموو دڕندەیەک دەترسێت ماریش زۆر ترسناکە، خوای پەروەردگار بانگی کردەوە و فەرمووی:

مەترسە مارەکە بگرە و بەدەست تێوەردانت مارەکە دەبێتەوە گۆچان.

دیارە ئەو خاسییەتەی پێ بەخشیووە خوای پەروەردگار کە مووسا فڕێی بدات دەبێتە مار و دەستی بۆ بەرێت دەبێتەوە گۆچان، خوای گەورە فەرمووی: دەچێتەوە سەر شێوە و شکڵی یەکەم جار کە گۆچانە، پاشان پەروەردگار فەرمووی: بێ ترس بەو زیانی نییە بۆ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ.

هۆکاری ئەم موعجیزەیە کە خوای گەورە بەخشییە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لەبەر ئەوەی فیرعەون جادووبازی زۆر بوو، خوای گەورە لە ڕێگای موعجیزە و جادووباز زەلیل و سەرشۆڕ دەکات.

پاشان پەروەردگار فەرمووی دەست بخەرە ژێر باڵت یان بەواتایەکی تر گیرفانت، کە ئەو کارەی ئەنجام دا دەستی ڕووناکی و شەوقێکی (بلاجیکتۆری) پێوە دیار بووە یان مەبەست ئەوەیە کەی ترسای لە دەستە و سەربازی فیرعەون و گەلەکەی، خوای گەورە فەرمانی بە مووسا کرد کە ڕووبەڕوویان بێتەوە.

مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ داوای کرد لە خوای گەورە کە ڕێگا نیشاندەری بێت بەوەی کە لە گەلی فیرعەون کەسێکی لێ کوشتوون، پاشان هاوکاری تری دەوێت کارەکە هەروا ئاسان نییە، بۆ گەیاندنی پەیامەکەش خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿٣٣﴾ وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِيٓ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَٰنًا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٣٥﴾﴾ القصص

واتە: مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی پەروەردگار من کاتی خۆی کەسێکم لێ کوشتوون لەوە ئەترسێم کە ئەوانیش من بکوژنەوە و تۆڵەم لێ بسەنن﴿٣٣﴾ هاروونی برام زمانی لە من پاراوترە لەبەر ئەوەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ گیرییەک لە زمانیدا هەبوو، هاروونی برام لەگەڵمدا بنێرە و بیکە بە پێغەمبەر بۆ ئەوەی ببێتە یارمەتیدەرم و ئەوەی من دەیڵێم بۆیان ڕوون بکاتەوە تا بەڕاستم دابنێن، لەبەرئەوەی من لەوە ئەترسێم کە بە درۆم بزانن﴿٣٤﴾ خوای گەورە وەڵامی دایەوەو فەرمووی: بەڵێ بەهێزت ئەکەین بە هاروونی برات بەڵگەی بەهێزیشتان پێ ئەدەین ئەوان ناگەنە ئێوەو ناتوانن هیچ ئازارێکتان بدەن، بەهۆی ئەو ئایەت و موعجیزانەش کە پێتان ئەدەین ئێوەو شوێنکەوتووانتان زاڵ و سەرکەوتوو دەبن و ئەوان تێکئەشکێن﴿٣٥﴾

لەدوای بینینی دوو موعجیزەی گەورە و هاوکاری کردنی بە براکەی کە هاروونی ناوە، ئەویش دەبێتە پێغەمبەر لەگەڵیدا هاوکات و هاوکارە لەگەڵیدا بۆ گەیاندنی پەیامەکە، لێرەدا شتێکی تر ڕوونەدات کە زۆر ڕووداوێکی کتوپرە بۆ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەویش بە هیچ شێوەیەک گەلی فیرعەون و دەسەڵاتی هیچ توانای زەرەر و زیانێکیان نییە بەرانبەر بە مووسا و هاروونی برای، لێرەوە هاروونی برای مووسا کە یەکێکە لە پێغەمبەرانی گەلی ئیسرائیل لە شانۆ و گۆڕەپانی ڕووداوەکان دا بوونی هەیە و بەشێکە لە ڕووداوەکان.

## پێغەمبەرایەتی هاروون عَلَيْهِ السَّلَامُ و هاوکاری بۆ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ

حەزرەتی هاروون برا گەورەی مووسایە سەلامی خوا لەهەردووکیان بێت، لەو ساڵەدا لەدایک بووە کە فیرعەون بڕیاری دابوو منداڵە کوڕەکان نەکوژرێن، هاروون ٢٠ جار ناوی لە قورئاندا هاتووە، ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە لەگەڵ مووسای برایدا ڕەوانە کراون بۆ گەلی ئیسرائیل و گەلی میسر و جیهان بە گشتی لەو سەردەمەدا.

کاتێک خوای گەورە فەرمان دەکات بە حەزرەتی مووسا بۆ ئەوەی بانگەواز بکات و پاشان گەلی ئیسرائیل ڕزگار بکات لەدەستی طاغوتی گەورە فیرعەون، بۆ ئەم مەبەستە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ چەند نزایەکی کرد، خوای گەورە لە قورئاندا بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت:

﴿ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِي صَدْرِي﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِيٓ أَمْرِي﴿٢٦﴾ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا۟ قَوْلِي﴿٢٨﴾ وَٱجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي﴿٣٠﴾ ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِي﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِيٓ أَمْرِي﴿٣٢﴾ كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا﴿٣٥﴾ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ﴿٣٦﴾﴾ طه

واتە: ئەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ تۆ نێردراوی ئێمەی بڕۆ بۆ لای فیرعەون لەبەرئەوەی ئەو سەرکەشی و کوفری کردووەو سنووری بەزاندووە لە کوفردا﴿٢٤﴾ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی پەروەردگار سینگم فراوان بکە بۆ ئەوەی کە بتوانم باری قورسی پێغەمبەرایەتی و ئازاری خەڵکی هەڵبگرم﴿٢٥﴾ کارم بۆ ئاسان بکە﴿٢٦﴾ گیرییەک لە زمانمدایە بیکەرەوە﴿٢٧﴾ تا بتوانم تێیان بگەیەنم و لە قسەی من تێ بگەن﴿٢٨﴾ لە کەسوکاری خۆیشم کەسێک بکە بە یارمەتیدەرم تا هاوکاریم بکات لە هەندێک کاروبارمدا﴿٢٩﴾ ئەو کەسەش با هاروونی برام بێت﴿٣٠﴾ تا خۆمی پێ بەهێز بکەم﴿٣١﴾ ببێ بە هاوبەشم لە هەڵگرتنی پەیامداو وەکو من ببێ بە پێغەمبەر﴿٣٢﴾ تا هەردووکمان زۆر تۆ بە پاک ڕابگرین و زیکری تۆ بکەین﴿٣٣﴾ زۆر زیکری تۆ بکەین﴿٣٤﴾ کە تۆش خۆت زۆر بینای بە ئێمەو ئاگات لە ئێمە هەیە﴿٣٥﴾ خوای گەورە فەرمووی: ئەوەی کە داوات کرد هەر هەموویم پێ بەخشیت و هاروونیشمعَلَيْهِ السَّلَامُ کرد بە پێغەمبەر لەگەڵتدا﴿٣٦﴾

لەپاش ئەوەی خوای پەروەردگار هەموو دوعاکانی گیرا کرد داوای هەرچی کرد پێی بەخشی، پاشان هاروون نەیزانی کە بووە بە پێغەمبەر، تەنها لە ڕێگای مووساوە زانیویەتی کە بووە بە پێغەمبەر، هەر وەحییەکی بۆ بهاتایە لە ڕێگای مووساوە پێی دەوترا، واتا فریشتە لەنێوان پێغەمبەر هاروون و خوای پەروەردگاردا نەبووە، بەڵکو مووسا لە نێوان خوای پەروەردگار و هاروون دا بووە. [١٦]

کەواتە هاروون هاوکات پێغەمبەر بووە لەگەڵ حەزرەتی مووسا لە ڕێگای پێغەمبەر مووساوە وەحی بۆ هاتووە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا﴿٥٣﴾﴾ مَرۡيَمَ

واتە: لە ڕەحمەتی خۆمان براکەیشی کە هاروون بوو کردمان بە پێغەمبەر کاتێک کە داوای کردو تکای لە خوای گەورە کرد کە هاروونم لەگەڵدا بنێرەو بیکە بە پێغەمبەر﴿٥٣﴾.

لە ژیانی ئەم دوو پێغەمبەرەدا جۆرێک لە سیاسەتی جیاوازتر لە پێغەمبەرانی ڕابردوو دەبینرێت، بۆ نموونە سیاسەتی نوح، صاڵح، هود و شوعەیب سەلامی خوا لە هەموویان بێت،

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٦] ئەمەش لە طەبەری و لە مێژوو و تەفسیرەکەیدا هاتووە لە سورەتی القصص ١١-٧٧، هەروەها ئیبنو کەثیر لە تەفسیرەکەیدا باسی کردووە، پاشان ئیبنو جەوزی لە کتێبی (المنظم)بەرگی ١ لاپەڕە ٣٤٢ باسی کردووە، هەروەها لە زۆربەی مێژووەکاندا هاتووە لەوانە الكامل في التأريخ-ی ابن كثير.

**سیاسەتی ئیصلاح طەڵەب بوو، سیاسەتی یوسف عَلَيْهِ السَّلَام جیاواز بوو کە سیاسەتی هاوپەیمانی و ئیئتیلاف بوو، بەڵام سیاسەتی مووسا سیاسەتێکی ئۆپۆزسیۆن بوو، بەرهەڵستکاری بوو لەبەرانبەر فیرعەون دا.**

**خوای گەورە لە دووبارەکردنەوەی ئایەتەکانی قورئان دا لە باسی مووسا دا هەرجارە و گۆشەنیگایەکیمان نیشان دەدات، لە سورەتی (طه)دا باسی دوعاو پاڕانەوەی مووسایە کە داوای هاوکاری دەکات لە سورەتی (القصص) هەر هەمان ئایەتە بەڵام دیمەن و گۆشەیەکی تر دەبینین باسی زمان پاراوی هاروون و کوشتنی کەسێک دەکات لە گەلی میسر، لە سورەتی (الشعراء) دا خوای گەورە باسی داواکردنی گەلی ئیسرائیل دەکات، هەر هەمان ئایەتە بەڵام ئەوەی تریش نمایشی وەحییە لە ڕوویەکی ترەوە.**

**کەواتە تا ئێستا مووسا هەر لە دۆڵەکەیدایە، مەدهۆش و حەیرانە لە خۆشی ئەو دەنگە، کە زانایان دەڵێن تەنها خۆی گوێی لێ بووە، هیچ کەسی تر گوێ لێ نەبووە، هەڵبەت زانایانی دیکەش پێچەوانەی ئەو بۆچوونەن.**

**مووسا عَلَيْهِ السَّلَام بە نهێنی گەڕایەوە ناو خێزانەکەی، هاروونی برای ئاگادار کردەوە کە بۆتە پێغەمبەر کارەکەی ڕوونکردەوە بۆ هاروونی برای کە دەبێت بانگەواز بکەن و گەلی ئیسرائیل لەبن دەستی فیرعەون دەربهێنن و بانگەوازی جیهان بکەن، خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴿١٠﴾ قَوْمَ فِرْعَوْنَۚ أَلَا يَتَّقُونَ﴿١١﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدْرِى وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِى فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَٰرُونَ﴿١٣﴾ وَلَهُمْ عَلَىَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ﴿١٤﴾ قَالَ كَلَّاۖ فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴿١٦﴾ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴿١٧﴾﴾ الشعراء

**واتە: پەروەردگارت بانگی لە مووسا عَلَيْهِ السَّلَام کرد بڕۆ بۆ لای ئەو قەومە ستەمکارە کە قەومی فیرعەونە﴿١٠﴾ قەومی فیرعەونە کە تەقوای خوای گەورە ناکەن، پێیان بڵێ: ئایا بۆ لە سزای خوای گەورە ناترسێن﴿١١﴾ مووسا عَلَيْهِ السَّلَام فەرمووی: ئەی پەروەردگار من لەوە ئەترسێم کە بە درۆم بزانن﴿١٢﴾ دڵم تەنگ بێ زمانم نەکرێتەوە بۆ قسە کردن، پەیام بنێرە بۆ هاروونی برام و بیکە بە پێغەمبەر تا لەگەڵمدا بێت وەکو یارمەتیدەرێک﴿١٣﴾ ئەوان تاوانێکیان لەسەر منە کە کاتی خۆی یەکێکم لێ کوشتن لە (قیبطي)ەکان لە هۆزی فیرعەون کە نەمزانی و مەبەستم کوشتنی نەبوو لەوەش ئەترسێم کە ئەوان بمکوژن و تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، کە ئەم ترسە ترسێکی سرووشتیەو**

ئاسایەو دروستە﴿١٤﴾ خوای گەورە فەرمووی: نەخێر برۆ مەترسێ ناتکوژن خوای گەورە وەڵامی دایەوەو هاروونی برای کرد بە پێغەمبەرو فەرمووی هەردووکتان بەیەکەوە برۆن بە موعجیزەکانم پشتیوانیتان دەکەم، مەترسێن منیش لەگەڵتاندام ئەبیستم، بە بیستن و بینین و تواناو دەسەڵات و پاراستن و سەرخستن لەگەڵتاندام﴿١٥﴾ برۆن بۆ لای فیرعەون بڵێن ئێمە نێردراو و پێغەمبەری پەروەردگاری هەموو جیهانین﴿١٦﴾ بە فیرعەون بڵێن کە بەنی ئیسرائیلی کردووە بە کۆیلە با ئازادیان بکات و لەگەڵ ئێمەدا بیان نێرە﴿١٧﴾.

لای ئەهلی کیتاب هاتووە مووسا دەگەڕێتەوە میسر و ڕێکخستنێکی سەرەتای دروست دەکات لە لاو و گەنجەکانی دەوروپشتی خۆی و پاشان چەکیان بۆ پەیدا دەکات بۆ هاوکاری کردنی، بەڵام بە نهێنی دوای بانگەواز کردنیان خۆی ئاشکرا دەکات لە فیرعەون و دارودەستەکەی لەگەڵ هاروونی برایدا مەشقی سەربازی فێری ئەو کەسانە دەکات کە لەگەڵیدان بۆ پاراستی پلانی تۆکمە دادەڕێژێت کە چۆن ڕووبەڕووی فیرعەون ببنەوە.

خوای گەورەش ٩ موعجیزە دەبەخشێت بە حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ، ئەم موعجیزانەش بریتین لە:

یەکەم: گۆچانەکەی دەستی، دووەم: دەستی موبارەکی مووسا خۆی کە ڕووناکی درەوشاوە دەبێت، سێیەم: گرانی و قاتوقڕی، چوارەم: بۆق، پێنجەم: کوللە، شەشەم: خوێن، حەوتەم: طۆفان، هەشتەم: ئەسپێ و ڕشک، نۆیەم: دوو کەرت بوونی دەریا بۆی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَـٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَـٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَـٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا﴿١٠٢﴾﴾ الإسراء

واتە: بە دڵنیایی ئێمە نۆ موعجیزەی ئاشکراو ڕوونمان بە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بەخشی وەکو بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی لەوانە زریانەکەو کوللەو ئەسپێ و بۆق و خوێن و گۆچانەکەی و دەستی و وشکە ساڵی و کەمی لە بەروبوومدا، موعجیزەی تریشی پێبەخشرا بوو وەکو بە گۆچانەکەی دەستی لە بەردەکەی داو ئاوی لێهەڵقوولا، و هەوری سپی سێبەری بۆ کردن، سوێسکەو گەزۆیان بۆ دابەزی، بەڵام لێرە باسی نۆ موعجیزە کراوە چونکە ئەم نۆیە فیرعەون و قەومەکەی بینیان و بەڵگە بوو بەسەریانەوە، کاتێک کە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ چوو بۆ لایان فیرعەون وتی: ئەی مووسا من گومان ئەبەم کە تۆ سیحرت لێکرابێت و عەقڵت لەدەست دابێت، یاخود

ساحیرو جادوگەر بیت ﴿١٠١﴾ مووسا فەرمووی: ئەی فیرعەون بە دڵنیایی تۆ ئەزانی ئەم نیشانەو موعجیزانە کەس داینەبەزاندووە تەنها پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی نەبێ کە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرایەو بەچاو ئەبینرێت من یەقینم هەیە ئەی فیرعەون کە تۆ بەهیلاک چوویت و زەرەرمەندی﴿١٠٢﴾.

## چوون بۆلای فیرعەون

فەرمانی خوای موتەعال دابەزی بۆ حەزرەتی مووسا و هاروون کە بڕۆنە لای فیرعەون و بانگەوازی بکەن بۆلای ئایینی خوای پەروەردگار، کەواتە مووسا و هاروون خۆیان ئامادەکرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی فیرعەون، بۆ مووسا ئاسان بوو بگەڕێتەوە ناو کۆشکی فیرعەون، چونکە خۆی لەوێ گەورە بووە و پەروەردەکراوە، پیاوانی فیرعەون ناتوانن ڕێگای لێ بگرن، دیارە مووسا پێش چوونی بۆلای فیرعەون کەسەکانی لەناو کۆشک ئاگادار کردۆتەوە، فیرعەون بۆیە ناتوانێت ڕاستەوخۆ داوای گرتن و کوشتنی بکات و فەرمانی بۆ دەربکات، چونکە گفتوگۆی درێژخایەن ڕوونەدات و مووسا چەند جار کۆشک جێ دەهێڵێت و دەگەڕێتەوە بۆ گفتوگۆو دانوستان لەگەڵ فیرعەون، ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە مووسا هێزی هەبووە تا سڵی لێ بکاتەوە فیرعەون، سەرەتا ناوەندی هێزی مووسا، بێگومان پاش خوای پەروەردگار لێرەدا مەبەست هۆکار و هێزی ماددییەکەیە مووسا پێشتر ئامادەی کردووە، ئەویش خاتوو ئاسیا و ڕێکخستنی نهێنی ناو گەلی ئیسرائیل و پێدەچێت لەناو گەلی میسریشدا هێز و توانای هەبووبێت، بە بەڵگەی ئەوەی خوای گەورە باسی ئیماندارانی ناو گەلی فیرعەون دەکات.

مووسا چووە لای فیرعەون، فیرعەون بە لووتبەرزی و تەکەبوری داواکردنی خوایەتی بۆ خۆی و زاڵم و زۆرداری، پێغەمبەر مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی:

﴿وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰفِرۡعَوۡنُ إِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ قَدۡ جِئۡتُكُم بِبَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَرۡسِلۡ مَعِيَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾﴾ الأعراف

واتە: مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی فیرعەون من پێغەمبەرێکم لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوە نێردراوم﴿١٠٤﴾ حەقی خۆیەتی و شایەنی ئەوەیە و پێویستە لەسەرم و من سوورم لەسەر ئەوەی کە هیچ شتێک نەڵێم و بەناوی خوای گەورەوە قسە نەکەم تەنها حەق نەبێ، من بە دڵنیایی لەلایەن پەروەردگارەوە بەڵگەم بۆتان هێناوە کە من پێغەمبەری خوام، تۆ بەنی ئیسرائیلم لەگەڵدا بنێرە با بگەڕێینەوە بۆ (بيت المقدس) و خوای گەورە بپەرستن و چیتر مەیانچەوسێنەرەوە﴿١٠٥﴾

مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ ڕاستەوخۆ چووە ناو باسەکەی و داواکەی، سەرەتا دەبێت بزانێت مووسا ئەو مووسا منداڵە نییە کە ئەوان پەروەردەیان کردووە، ئێستا بووە بە پێغەمبەر، مادام پێغەمبەرە گومانی تێدانییە پەیامی پێیە، داواکارییەکەش ئەوەیە کە گەلی ئیسرائیلی بداتێ بۆ هاوپشتی و بانگەواز بە شار و وڵاتان دا تا ئایینی خوای گەورە بڵاوکاتەوە لەدەستی زوڵم و زۆری فیرعەون و فیرعەونەکانی تری دنیا، گەلی ئیسرائیل و خەڵکی بەگشتی ڕزگاریان بێت.

مووسا بە پەیامەکەی کە لە لایەن خواوەیە لە حەق و ڕاستی داوای شتێکی تری نەکردووە لە فیرعەون، بۆیە لە وتەکانیدا جەخت و سوور بوون دیارە لە داواکەی و سوورە لەسەر داواکەی.

حیوار و وەڵامی فیرعەون چییە لەگەڵ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ؟

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِي فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكْمًا وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾﴾ الشعراء

واتە: کاتێک کە چوون بۆ لای فیرعەون و بە نەرمونیانی قسەیان لەگەڵدا کردو پێیان وت، فیرعەون وتی: ئەی مووسا ئایا بە منداڵی ئێمە بەخێومان نەکردیت و لە ماڵی ئێمەدا گەورە نەبوویت لە کاتێکدا منداڵانی ترمان ئەکوشت تۆمان نەکوشت؟ چەندەها ساڵ لە لای ئێمە مایتەوە ئێستا خۆت کردووە بە پێغەمبەر لە ئێمە﴿١٨﴾ ئەو کردەوە خراپەیشت کرد کە کوشتنی (قیبطي)ەکە بوو، تۆ کەسێکی کە نکوڵی و کوفرانەی ئەو نیعمەتانەی ئێمە ئەکەی بەسەرتەوە﴿١٩﴾ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: بەڵێ من ئەو پیاوە (قیبطي)ەم کوشت، بەڵام من ئەو کاتە کەسێکی نەزان و وێڵ بووم لەبەر ئەوەی هێشتا وەحیم بۆ نەهاتبوو و پێغەمبەر نەبووم﴿٢٠﴾

بۆیە لە ئێوە ڕامکرد بۆ (مەدیەن) کاتێک کە لێتان ترسام تۆڵەی خۆتان بسەنن، پەروەردگارم حوکم و پێغەمبەرایەتی پێ بەخشیم منی کرد بە یەکێک لە پێغەمبەران و نێردراوانی خۆی، ئەم نیعمەتەیش کە تۆ منەت ئەکەی بەسەر مندا کە منت بە منداڵی گەورە کردووە﴿٢١﴾ بەڵام باسی ئەوە ناکەی کە هەموو بەنو ئیسرائیلت کردووە بە عەبدو کۆیلەی خۆت و دەیانچەوسێنیتەوە کە هەر ئەمەیش وای کرد دایکم لە ترسی ئەوەی تۆ نەمکوژیت منی هەڵدایە ناو ئاوەکەوەو کەوتمە ژێر دەستت ئێستاش منەت ئەکەی بەسەرمدا﴿٢٢﴾

لێرەدا فیرعەون دەیەوێت هەڵوێستی مووسا لاواز بکات لەبەرچاوی دارودەستەکەی، بۆیە منەتی ئەوەی بەسەردا دەکات کە تەمەنێکی لەناو کۆشک و ناوماڵی فیرعەون بەسەر بردووە، لەجیاتی ئەوەی هاوکاری دەسەڵاتەکە بێت کەچی داوای بەرهەڵستکاری و پاشان گەورەترین هێزی کارکردن دەکات لەو دەسەڵاتەدا.

فیرعەون بەمەشەوە ناوەستێت ڕاستەخۆ تاوانەکەی کۆنی دەخاتەوە بیرو بەکافر مووسا ناوزەد دەکات، لێرەدا کوفر کردن واتای ئینکاری کردنی نازو نیعمەتەکانی فیرعەونە.

مووسا هەمان شێوەی گفتوگۆی هەڵبژاردووە هەڵوێستی فیرعەون لاواز دەکات و دەفەرموێت: ڕاستە کاتێک لەناوتاندا بووم ئەو کارە هەڵەم ئەنجامدا و سەرم لێ شێوا بوو، پاشان سزاکەی باس دەکات کە چەشتویەتی، دەفەرموێت: ڕامکرد و ١٠ سال لە کەسوکارم دوورکەوتمەوە لەتاو ترسی ئێوە و زوڵمتان، تا خوای گەورە لێم خۆش بوو، دەسەڵات و هێزی پێ بەخشیم و کردومیەتە پێغەمبەر، ئینجا مووسا باسی عیللەتی کارە ناپوخت و ناپەسەندەکەی بۆ دەکات و دەفەرموێت: منەتی چی دەکەیت بەسەرماندا، تۆ هەموو گەلی ئیسرائیلت کردۆتە کۆیلە و زوڵمیان لی دەکەیت، لەهەمان کاتدا هۆکاری کوشتنەکەیش کە مووسا کوشتویەتی لە پیاوانی کۆشک، واتا بیری دەخاتەوە خۆ کوشتنەکە هەروا لە خۆوە نەبووە، بەڵکو لە زوڵم و زۆری تۆ و داروەدەستەکەتە.

فیرعەون وەڵامی پێنییە و ناتوانێت لەبەرانبەر بەڵگەی(حوججەی) بەهێزی مووسادا بوەستێتەوە، بۆیە ناچار پرسی گەلی ئیسرائیل دەگۆڕێت بۆ پرسێکی تر، دەیەوێت بەوە ڕێگری لە قسە و وتەی مووسا بگرێت:

پرسەکەش زۆر گرنگە فیرعەون داوای خوایەتی دەکات و دەڵێت دەبێت بمپەرستن، ئەمە لە ئێستادا بیروباوەڕی خەڵکی میسرە، بەڵام مووسا دەڵێت من پێغەمبەرم و خوای پەروەردگار ناردوومی کە خوای هەموو جیهانە!

ئەمەش زۆر ترسناکە لە دەسەڵاتی فیرعەون دا چونکە ئاسایشی نەتەوەی فیرعەونی دەخاتە مەترسی!

مووسا زۆر بەهێمنی و لەسەرخۆییەوە ئاخافتن لەگەڵ فیرعەون دا دەکات خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ۝٤٣ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ ۝٤٤﴾ طه

واتە: بڕۆن بۆ لای فیرعەون لەبەر ئەوەی سنووری بەزاندووە لە کوفرو تاوان و سەرکەشی کردندا﴿٤٣﴾ قسەی لەگەڵدا بکەن بە قسەیەکی نەرم کە ڕەقی و توندوتیژی تیا نەبێ و پێی بڵێن من لە لێبوردن و لێخۆشبوونەوە نزیکترم وەک لە توڕە بوون و سزادان، بەڵکو بیر ئەکاتەوەو دەستهەڵدەگرێت و دەگەڕێتەوە لە کوفرو گومڕایی، یاخود لە سزای خوای گەورە ئەترسێت و گوێڕایەڵی دەکات﴿٤٤﴾

هۆکاری ئەو نەرمونیانییە دەگەڕێتەوە بۆ سەرنج ڕاکێشانی دەوروپشتی فیرعەون، هیچ حوججە و بیانو نادات بەدەستەوە کە هەڵوێستی مووسا لاواز بکات، ئەگەری زۆریشی هەیە بگەڕێتەوە بۆلای خوا و ترسی خوای گەورە بڕواتە ناودڵی.

ئینجا جەولەی دووەمی (موناقەشەی) فیرعەون دەست پێ دەکات لەگەڵ حەزرەتی مووسا، دەیەوێت لێرەوە لەم باسەوە هەڵوێستی مووسا زۆر لاواز بکات بەو جۆرە قسە سیاسی و یاساییانە لەو سەردەمەدا و لەدەسەڵاتەکەی دا دەیەوێت مووسا بخاتە ناو چاڵێک و لێی دەرنەچێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾﴾ الشعراء

واتە: فیرعەون وتی: ئەو پەروەردگاری هەموو جیهانەی تۆ باسی ئەکەی چیە و کێیە؟﴿٢٣﴾ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: پەروەردگاری هەر حەوت ئاسمانەکەو هەر حەوت زەوییەکەو ئەوەی لە نێوانیاندایە خوا بەڕێوبەرو هەڵسوڕێنەری هەموویەتی، ئەگەر ئێوە دڵنیایی و یەقینتان هەیە﴿٢٤﴾ فیرعەون وەکو سووکایەتی و گاڵتە پێکردن بەوانەی دەوروپشت و دەست پێوەندەکانی خۆی وت ئایا نابیستن و پێتان سەیر نیە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ چی ئەڵێ؟﴿٢٥﴾ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: الله پەروەردگاری ئێوەو پەروەردگاری باوک و باپیرانی پێشینەیشتانە﴿٢٦﴾ فیرعەون وتی: بەڕاستی ئەم پێغەمبەرەی کە نێردراوە بۆ لای ئێوە کە مووسایە کەسێکی شێتە، گاڵتەی پێئەکرد﴿٢٧﴾ مووساش عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: پەروەردگاری من پەروەردگاری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو ئەوەی لە نێوانیاندایە، هەمووی موڵکی خوای گەورەیەو خۆی هەڵی ئەسووڕێنێ ئەگەر ئێوە عەقڵتان هەیەو بیر ئەکەنەوە﴿٢٨﴾ فیرعەون کە دەمکوت کرا بە بەڵگە و قسەی نەما پەنای برد

بۆ هێزو دەسەڵاتی و هەڕەشەی لێ کردو وتی: ئەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَام ئەگەر جگە لە من خوایەکی تر بۆ خۆت بڕیار بدەی ئەوە ئەتخەمە بەندیخانەوە﴿٢٩﴾

پێدەچێت فیرعەون وا پەی بردبێت ناوی سەرۆکی وڵاتێک دەڵێت مووسا عَلَيْهِ السَّلَام کە خوای هەموو جیهانە، فیرعەون دەیویست لە ڕێگایەوە خەتا بکاتە ملی مووسا وتی: خوای هەموو جیهان کێیە و چییە؟

مووسا فەرمووی: خوای دروستکاری زەوی و ئاسمان و ناوەندیانە، دڵنیابن کە خالقێک دروستی کردووە جا ئیمان بهێنن بەو خالقە یەقینتان پێی هەبێت.

فیرعەون و ئەوانەشی لە دوروپشتی دان، دەڵێن گوێتان لێیە چی دەڵێت، بەشێوەیەکی گاڵتە ئامێز وەکو ئەوەی کە پرسیاری فیرعەون وەڵامەکەی هاوشێوە و تەواو نەبووە، بۆیە بە دارودەستە و وەزیر و حەشەم و خەدەمی دەڵێت گوێتان لەم کەسەیە خۆشی لەخۆی تێناگات و شێتانە قسە دەکات، ئینجا مووسا عَلَيْهِ السَّلَام سەرنجیان ڕادەکێشێت دوای خالقی بۆ زیندوویێتی هەتاهەتایی، ئەفەرموێ خوای پەروەردگارم خوای باوک و باپیران و هەموو خەڵکە لەسەرەتاوە، ئینجا فیرعەون دەیەوێت بە شێت مووسا بداتە قەڵەم، ئەمەش موعجیزەی پێغەمبەرانە هەموو دوژمنەکانیان نازناوی شێتیان لکاندووە بە پێغەمبەرانەوە، بەڵام هیچ پێغەمبەرێک لەوەڵامی ئەواندا نەیفەرموو خۆتان شێت، چونکە بانگەواز لەسەر شێت هەڵدەگیرێت و تەکلیفی لەسەر نییە و هیچ بەندایەتییەک بکات، بۆیە پێغەمبەران لە گەیاندنی بانگەوازیاندا زۆر وریا و دەقیق بوون لە قسەیاندا.

﴿قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ﴿٥١﴾ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى فِى كِتَٰبٍ ۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّى وَلَا يَنسَى﴿٥٢﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ﴿٥٣﴾ كُلُوا۟ وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَٰمَكُمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ﴿٥٤﴾ ۞ مِنْهَا خَلَقْنَٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ﴿٥٥﴾﴾ طه

واتە: فیرعەون لەبەر ئەوەی خۆی بە خوا ئەزانی وتی: ئەی مووسا پەروەردگاری ئێوە کێیە؟﴿٤٩﴾ مووسا عَلَيْهِ السَّلَام وتی: پەروەردگاری ئێمە ئەو خوایەیە کە هەموو شتێکی دروست کردووە، پاشان ڕێنمایی کردوون بۆ ئەو شتەی کە سوودو بەرژەوەندی خۆیانی تێدابێت﴿٥٠﴾ وتی: ئەی باشە دەنگوباس و هەواڵ و بەسەرهاتی ئوممەتانی پێشتر چییە ئەوانەی کە بتیان پەرستووەو

بە بت پەرستی ڕۆیشتوونە﴿٥١﴾ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: زانیاری و بەسەرهاتی ئەوان لای خوای گەورە پارێزراوە و لە کتێب و پەڕاوێکە کە خوای گەورە لێی تێکناچێ و هەڵە ناکات و لە بیرو یادی ناچێت﴿٥٢﴾ ئەو خوایەی کە زەوی وەکو بێشکە بۆ ڕاخستوون کە بە ئاسانی لەسەری بژین و جێگیر بن جۆرەها ڕێگاشی تیادا داناوە بۆ ئاسانکاری ئێوە، لە ئاسمانیشەوە بارانی بۆ دابەزاندوون، خوای گەورە بەهۆی ئەو بارانەوە لە هەموو ڕووەکێک جووتێکی جوانی لێک جیاوازی بۆ دەرکردوون﴿٥٣﴾ خۆیشتان بخۆن لەو ڕزق و ڕۆزییەی خوای گەورە، ئاژەڵەکانیشتانی لێ بلەوەڕێنن بە دڵنیایی ئەمانە هەمووی نیشانەیە لەسەر تاک و تەنهایی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە بۆ کەسانێک کە خاوەنی عەقڵ و ژیری بن و هۆشمەند بن﴿٥٤﴾ لەو زەوییە لەو خۆڵە دروستمان کردوون، واتە: ئادەم بنچینەو ئەسڵی لە خۆڵ بووە، پاشانیش ئەتانگەڕێنینەوە بۆ ناو زەوی کاتێک کە ئەمرن، لە ڕۆژی قیامەتیش جارێکی تر لە زەوی دەرتان ئەکەینەوەو زیندووتان ئەکەینەوە﴿٥٥﴾

ئینجا لەم دیمەنەدا شیکاری زیاتری سورەتی الشعراء-یە، لێرەدا هەموو میحنەتەکان دەخاتە بەرچاوی فیرعەون و مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ، بە شیکاری وردەکاری بە جوانترین شێوە، لەم حاڵەتەدا فیرعەون توانای خۆگرتنی نامێنێت. پێشتر دەیویست هەڵوێستی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لاواز بکات، وا ئێستا خۆی هەڵوێستی لاواز بووە و توڕە بووە هێزی فیزیکی بەکاردەهێنێت.

فیرعەون دەڵێت: بێجگە لە خوایەتی من هەر خوایەکی تر هەڵدەبژێریت ئەوا زیندانیت دەکەم ﴿... لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾﴾ الشعراء.

لێرەدا وا دەبینرێت مەبەست خوایەتی فیرعەون حوکم و یاسا و دەسەڵاتەکەیەتی، مووسا دەیەوێت حوکمی خوا پیادە بکات، فیرعەون یاسا و حوکمی خۆی سەردەخات، خوایەتیەکەی لێرەوە سەرچاوەی گرتووە، مووسا بۆ ئەم مەبەستە دەیەوێت بە تەواوەتی سەرشۆڕی بکات.

فیرعەون کە مووسای ترساند بە زیندانی کردن، مووسا لە بەرانبەریدا بەڵگە و حوجەتی پێغەمبەرایەتی بەکارهێنا تا فیرعەون دەمبەست بکات، خوای گەورە بۆمان دەگێڕیتەوە و دەفەرموێت:

﴿قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴿٣١﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ﴿٣٣﴾﴾ الشعراء

واتە: مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئایا من بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەو ئاشکرام بۆت نەهێناوە کە ئاشکرایە لەسەر ڕاستگۆیی من(٣٠) فیرعەون وتی: ئەگەر ڕاست ئەکەی موعجیزەو شتێکی ئاشکرام بۆ بێنە(٣١) مووساش عَلَيْهِ السَّلَامُ گۆچانەکەی دەستی هەڵداو بوو بە مارێکی گەورەو ئاشکراو دیار کە دەبینرا(٣٢) دەستی خستە بن باڵی و دەریهێنا، دەستی زۆر سپی و پرشنگدار بوو وەکو مانگی چواردە ئەدرەوشایەوە هەموو بە چاوی خۆیان بینیان(٣٣).

فیرعەون وتی: دەی باشە ئەگەر ڕاست دەکەیت بزانین بەڵگەی پێغەمبەرایەتی چییە؟ حەزرەتی مووسا گۆچانەکەی فڕێدا بووە مار و مەجلیسەکەی فیرعەون هەموو ترسان و پاشان دەستی خستە ناو باخەڵی و دەریهێنا وەکو ڕۆژی درەوشاوە بوو.

مەجلیسەکە بەتەواوەتی لەتاو ترسی مارەکە و ڕۆشنایی ئەو شەوقەی دەستی چاویان بەر شەوارە کەون هیچیان نەدەبینی، فیرعەون کە ئەو ڕەوشەی بینی، خۆی پێ نەگیرا خێرا بەوانەی دەوروپشتی وت: ئەمە چییە ڕوونەدات؟ ئەوانیش بۆیان تەفسیر کرد بە سیحر یان بە پێچەوانەوە خێرا فیرعەون تەفسیری کرد بۆ ئەوان کە ئەمەی مووسا سیحر و جادووبازییە، (قال للملإ حوله إن هذا لساحر عليم)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ(٣٥) قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ(٣٦) يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ(٣٧) فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ(٣٨) وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ (٣٩)﴾ الشعراء

واتە: فیرعەون لە جیاتی ئەوەی ئیمانی پێ بێنێت بە دەسەڵاتدارانی دەوروپشتی وت: بەڕاستی ئەمە جادووگەرێکی زۆر زانایە(٣٤) ئینجا فیرعەون خەڵکی لێ هانداو وتی: مووسا مەبەستی ئەوەیە بەم سیحرەی سەرنجی خەڵکی ڕاکێشێت و شوێنکەوتووانی زۆر بکات و زاڵ بێت بەسەر ئێوەداو لە شاری خۆتان دەرتان بکات و دەست بگرێت بەسەر وڵاتەکەتاندا بۆ ئەوەی زیاتر سەرنجیان ڕاکێشێ وتی: ئێوە فەرمانتان بە چیەو چی ئەڵێن؟(٣٥) وتیان: ئیشی خۆی و براکەی دوابخە، بنێرە بە شارەکاندا بگەڕێن و خەڵکی هەر هەمووی کۆ بکەنەوە(٣٦) بگەڕێن هەرچی جادووگەری زۆر زاناو شارەزایە هەر هەمووی کۆ بکەنەوەو بیانهێنن(٣٧) هەرچی ساحیرو جادووگەری بەناوبانگ و زانا هەبوو هەموویان کۆکردەوە بۆ کاتێکی دیاریکراو کە ڕۆژی جەژن بوو(٣٨) بە خەڵکی وترا یان هانی خەڵکی درا کە هەموویان کۆببنەوە بۆ ئەوەی ئەم شتە ببینن لە نێوان مووسا و ساحیرەکاندا(٣٩).

لەدوای تەفسیرکردنی موعجیزەکانی مووسا بە سیحر، ئینجا پرس و ڕاوێژی فیرعەونی ڕێکخرا بۆ ئەوەی بزانن چی بکەن لەگەڵ مووسا و هاروونی برایدا، ناتوانن بیانگرن هەڵوێستیان لاواز نییە و مەوقیفیان زۆر بەهێزە، گرتنی مووسا و هاروون تەڕەفی فیرعەون لاواز دەکات، فیرعەونیش دەترسێت لە شۆڕشی گەلی ئیسرائیل! نایەوێت هیچ شتێکی نەخوازراو ڕووبدات، بۆیە کە دڵنیا بووەوە کە کارەکەی مووسا سیحرە ئەویش خۆی خاوەنی دەزگایەکە لە ساحیرەکانی، لەو دەزگایەدا خەڵکی دەترسێن و چاوبەستی دەکەن. بۆیە فیرعەون داوای کرد لە سەنتەری شار یاخود جێگای کۆبوونەوەی خەڵکی کە چەند مەیدانێکە کات دابنێ بۆ مووسا و هاروون و ساحیرەکانی خۆی داخۆ کێ سەرکەوتوو دەبێت، بۆیە هەڵسان بە ڕێکخستنی ئەو میهرەجانە لەناو مەیدانی شاردا و خەڵکیان لێ ئاگادار کردەوە و ڕیکلامیان بۆ دەکرد و بانگەوازیان بۆ کرد کە هەموو خەڵک لە ڕۆژی (زینە) کۆببنەوە.

خوای گەورە دیمەن و گۆشەنیگایەکی ترمان لەم ڕەوشە لە قورئان دا نیشان ئەدات و دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ۝٥٦ قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ۝٥٧ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانًا سُوًى۝٥٨ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى۝٥٩﴾ طه

واتە: هەموو نیشانەو موعجیزەکانمان نیشانی فیرعەون دا بەڵام ئەو هەر مووسایعَلَيهِ‌السَّلَامُ بەدرۆ زانی و ڕەتی کردەوە کە ئیمانی پێ بێنێ۝٥٦ وتی: ئەی مووساعَلَيهِ‌السَّلَامُ تۆ بەم سیحرانەی کە کردت ئەتەوێ ئێمە لە زەوی خۆمان دەربکەی و زەوییەکەمان لێ داگیر بکەی؟۝٥٧ وتی: تۆ سیحرت هەیە ئێمەش ساحیرمان هەیەو سیحرێکی هاوشێوەی سیحرەکەی تۆ دێنین، مەوعیدو کاتێکی دیاریکراو دابنێ لە نێوان هەردووکماندانە ئێمەو نە تۆش وەعدە خیلاف نەکەین و لە کاتی خۆیدا ئامادە بین لە شوێنێکی ڕێکدا کە هەموو شتێک لە خەڵکی دیار بێت، یان مام ناوەند لە نێوان هەردوو لاماندابێت۝٥٨ مووساشعَلَيهِ‌السَّلَامُ فەرمووی: مەوعیدو ڕۆژی بەیەکگەیشتنمان ڕۆژی جەژن بێ لەبەر ئەوەی خەڵک هەمووی خۆی ئامادە ئەکات و هەمووی ئەیبینێت با لە چێشتەنگاودا بێت کە دونیا ڕووناکە نەک لە شەودا بێت و خەڵک گومانی هەبێ لە موعجیزەکەیدا۝٥٩.

لێرەدا فیرعەون بە درۆزن و لووتبەرز نیشان ئەدات، چونکە ئەشێت زانیبێتی کە ئەو کارەی مووسا سیحر نییە، بەڵکو موعجیزەیە، پاشان ڕاستییەکان دەشێوێنێت و دەڵێت: ئەتەوێت بە جادووبازی لەخاکەکەماندا دەربکەویت هەروەکو بەرپرسەکانی ئەمڕۆی وڵاتی خۆمان کە هەڵوێستیان لاواز دەبێت باسی کوردایەتی دەکەن، فیرعەونیش لەڕووی سۆزدارییەوە

دەیانجوڵێنێت دژی مووسا و هاروون بە داگیرکار نیشانیان دەدات، لەکاتێکدا مووسا داوای گەلەکەی دەکات بۆ دەرچوون لەو وڵاتەدا.

ئینجا خۆی وا نیشان دەدات کە زۆر خاوەن مەبدەئو هەڵویستە و کات و ژوان دادەنێت و هیچ کەس نابێت دوابکەوێت لەو ژوانە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُواْ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ۝٤٠ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُواْ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ۝٤١ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ۝٤٢ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ۝٤٣ فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُواْ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ۝٤٤ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ۝٤٥﴾ الشعراء

واتە: وتیان: بەڵکو ئێمە شوێن ساحیرەکان بکەوین ئەگەر ئەمان سەرکەون و بیبەنەوە۝٤٠ کاتێک کە ساحیرەکان هاتن بە فیرعەونیان وت: ئەی فیرعەون ئەگەر ئێمە زاڵ بین و بیبەینەوە ئایا هیچ ئەجرو پاداشتێکمان بۆ هەیە؟۝٤١ فیرعەون وتی: بەڵێ، ئێوە ئەکەمە کەسە نزیکەکانی خۆم، واتە: پلەو پایەتان ئەدەمێ۝٤٢ مووسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ فەرمووی: چیتان پێیە هەڵی بدەن و جادووی خۆتان بکەن۝٤٣ حەبل و گۆچانەکانیان هەڵدا وتیان: بەعیززەت و تواناو دەسەڵات و گەورەیی فیرعەون بە دڵنیایی ئێمە زاڵ ئەبین و ئەیبەینەوە، مووسایش عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ گۆچانەکەی هەڵدا۝٤٤ ئەو ئیفک و درۆیەی کە ئەوان هەڵیانبەستبوو لە سیحرو جادوو ئەمەی مووسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ هەموو ئەوەی ئەوانی قووتداو نەیهێشت۝٤٥.

مەبەستی فیرعەون زیاتر لەوە بوو کە ساحیرەکانی کۆکردەوە کەس شوێنی ئایینی مووسا نەکەوێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە شوێن ساحیرەکان بکەون، چونکە ساحیرەکان لەسەر ئایینی فیرعەونن و فیرعەون بە خوا دەزانن.

کاتێک کە ساحیرەکان دڵنیایی سەرکەوتنیان دایە فیرعەون داوایان کرد لە فیرعەون داخۆ پاداشتەکەیان چی دەبێت؟

کاتێک ساحیرەکان هاتن لەگەڵ فیرعەون دا، ئیبن عەباس دەفەرموێت: ٧٠ کەس بوون، ٤٠ کەس لە ساحیرەکان هەر لە گەلی مووسا بوون واتە بەنی ئیسرائیل بوون، ئینجا مووسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ لێرەدا کە ئەو کۆمەڵە ساحیرەی بینی پێی وتن: درۆ بەدەم خواوە مەکەن قوڕتان بەسەر کۆتاییتان سەرشۆڕییە، ئینجا کەوتنە مقۆ مقۆ و چپە چپ لە نێوان خۆیاندا وتیان: ئەم وتەیە لە وتەی ساحیر ناچێت.

خوای گەورە دیمەنی ئەو دڵە ڕاوکێیەی ساحیرەکان و دڵنیایی مووسامان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت:

﴿فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴿٦٠﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ ﴿٦١﴾ فَتَنَٰزَعُوٓاْ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجْوَىٰ ﴿٦٢﴾ قَالُوٓاْ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ ﴿٦٣﴾ فَأَجْمِعُواْ كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُواْ صَفًّا ۚ وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ ﴿٦٤﴾﴾ طه

واتە: فیرعەونیش ڕۆیشت و نەخشە و پلانی خۆی کۆ کردەوەو پاشان هەموو ساحیرەکانی هێناو هات بۆ شوێن و کاتی دیاریکراو﴿٦٠﴾ مووسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ بە فیرعەون و ساحیرەکانی وت: هاوار بۆ خۆتان درۆ هەڵمەبەستن بۆ خوای گەورەو شەریک بۆ خوا دامەنێن چونکە خوای گەورە بێ شەریکە لەبەرئەوەی خوای گەورە سزایەکی واتان ئەدات ڕەگ و ڕیشەتان دەرئەکات و کۆتاییتان پێ دێنێ و دواتان دەبڕێ، ئەوەیشی درۆ بۆ خوای گەورە هەڵبەستێ و سەر لە خەڵکی بشێوێنێت زەرەرمەندو خەسارەتمەند دەبێت﴿٦١﴾ ساحیرەکانیش کاتێک کە گوێیان لە قسەی مووسا بوو لەناو یەکدا گفتوگۆو ڕاوێژیان کردو کێشە کەوتە نێوانیان و هەندێکیان وتیان ئەمە قسەی ساحیر نیەو قسەی پێغەمبەرە بە چپە چپ لە نێوان خۆیاندا قسەیان کرد﴿٦٢﴾ ویستیان خەڵکیان لێ هان بدەن و وتیان: ئەم دووانە (مووسا و هاروون) دوو ساحیرن بەهۆی ئەم سیحرەی کە ئەیکەن ئەیانەوێ لە زەوی خۆتان دەرتان بکەن، ئەم ماڵ و سەروەت و سامانەی کە ئێمە بە سیحر کۆمان کردۆتەوە ئەمان بۆ خۆیان ببەن و لێمان بسەنن و بەسەرماندا زاڵ بن﴿٦٣﴾ ئێوە نەخشەو پلانی خۆتان کۆبکەنەوە پاشان هەمووتان بە یەک پۆل وەرن ئەوەی ئەمڕۆ زاڵ بێت و بیباتەوە ئەوە سەرفرازو سەرکەوتوو ئەبێت﴿٦٤﴾

وا نمایشی ساحیرەکان دەست پێ دەکات و بەڕیز وەستاون، بە مووسایان وت: تۆ دەست دەکەیت بە سیحر و هەڵدانی کەرەستەکانت یاخود ئێمە، ئەمەش لای خۆیانەوە بە هێز بوونی خۆیان بۆ مووسا نیشان ئەدەن، مووسا ساحیر نییە بەڵکو پێغەمبەرە چاوەڕوانی بەتاڵکردنەوەی سیحری ئەوانە، بۆیە فەرمووی: ئێوە کەرەستەکانتان هەڵبدەن من چاوەڕوانتانم، ئەوانیش هەر یەکە فرت و فێڵ و حەبل و پەتی خۆیان هەڵدا.

بە عیزەت و توانای فیرعەون سوێندیان دەخوارد، لێرەدا دەشێت فیرعەون خۆی گەورەی ساحیرەکان بووبێت لە سیحرکردن دا بەواتای ئەوەی خۆی زانیاری دابێتە جادووبازەکان، چونکە ئە وحەبل و پەت و دار و کەرەستانە لەبەرچاوی خەڵکیدا دەبوونە مار و باڵندە و...هتد.

لەڕێگای چاوبەستی و سەرلێشێواندن و پاشان جنۆکە و شەیتانەکان، بۆ دڵنیابوون لە سەرکەوتن جادووبازەکان بە هێزی فیرعەون پشتیان بەستو فیرعەونیش بە پشتی ئەوان قسەی دەکرد.

لەدوای نمایشی جادووبازی ئەوان، داواکرا لە مووسا کە سەرەی ئەوە، حەزرەتی مووسا ﷺ جادوو ناکات، بەڵکو موعجیزەیە بەڵام کە ئەوانی بینی و مووساش بە چاوی خۆی سیحرەکانی ئەوانی بینی ترسی لێ نیشت، خوای گەورە ئاگاداری کردەوە کە نەترسێت و بەڵکو سەرکەوتوو دەبێت.

﴿قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَلۡقَىٰ ۝٦٥ قَالَ بَلۡ أَلۡقُواْۖ فَإِذَا حِبَالُهُمۡ وَعِصِيُّهُمۡ يُخَيَّلُ إِلَيۡهِ مِن سِحۡرِهِمۡ أَنَّهَا تَسۡعَىٰ ۝٦٦ فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ خِيفَةٗ مُّوسَىٰ ۝٦٧ قُلۡنَا لَا تَخَفۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡأَعۡلَىٰ ۝٦٨ وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلۡقَفۡ مَا صَنَعُوٓاْۖ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيۡدُ سَٰحِرٖۖ وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيۡثُ أَتَىٰ ۝٦٩﴾
طه

واتە: وتیان: ئەی مووسا ﷺ یەکەمجار یان تۆ سیحری خۆت بکە، یاخود ئێمە سەرەتا سیحری خۆمان ئەکەین۝٦٥ مووساش ﷺ وەکو بێ بایەخییەک فەرمووی: بەڵکو ئێوە دەست پێ بکەن و چیتان لە دەست دێت بیکەن، کاتێک کە ئەو حەبل و گۆچانانەی کە پێیان بوو هەڵیاندا سیحریان لە چاوی خەڵکەکە کردو خەڵکی وایانزانی کە ئەمە هەمووی بووە بە مارو هەژدیهاو بەخێرایی ئەڕوات۝٦٦ مووسا ﷺ کاتێک کە ئەو شتەی بینی لە نەفسی خۆیدا ترسا، ترسێکی سرووشتی ئەوەی لە سرووشتی مرۆڤدا هەیە لەوەی کە خەڵکی بەو جادووە هەڵبخەڵەتێن۝٦٧ خوای گەورە فەرمووی: ئەی مووسا ﷺ مەترسێ بە دڵنیایی هەر تۆی زاڵ و سەرکەوتوو و بەرزو بڵندو تۆ ئەیبەیتەوە بە ئیزن و پشتیوانی خوای گەورە۝٦٨ ئەوەی لە دەستت دایە کە گۆچانەکەیە هەڵی بدە هەموو مار و هەژدیهاکانی ئەوان قوت ئەدات کە خۆی لە حەقیقەتدا گۆچان و حەبلە، بەڵام لە پێش چاوی خەڵک بووە بە مارو هەژدیها ئەگەر نا نەبووەو حەقیقەتی نیە، ئەوەی ئەوان کردوویانە تەنها فڕوفێڵێکی ساحیرەو سیحرو جادووە هیچ شتێکی تر نییە تەنها خەیاڵە لە پێش چاوی خەڵکی وایان کردووە، ساحیریش هەرگیز سەرفراز نابێ بەو سیحرەی کە ئەیکات۝٦٩

مووسا ﷺ کە نۆرەی هات گۆچانەکەی فڕێدا و هەموو کەرەستەکانی ئەوانی قووت دا و هەڵیلوشی بە فەرمانی خوای گەورە، جادووبازەکان هەموو لێزان بوون لەکاری خۆیاندا، بەڵام کە ئەم دیاردەیان بینی زانیان ئەمە سیحر نییە، لێرەدا پێشبڕکێ و میهرەجان و یاخود جەنگەکە

لەسەر ڕاست و دروستی ئایینی خوایە، کام ئایین ڕاستە ئایینی فیرعەونی کە خۆی داوای خوایەتی دەکات، یان ئایینی مووسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ کە بانگەواز بۆ یەکتاپەرستی و قیامەت دەکات و دەڵێت من پێغەمبەرم، ئەگەر تەعبیرەکەم ڕاست بێت واتا گرەوەکە لەسەر دینداری کام لا ڕاستە.

بۆیە ساحیرەکان کە ئەم حاڵەتەیان بینی چیتر خۆیان پێ نەگیراو هەموو سوجدەیان برد بۆ خوای هاروون و مووسا سەلامی خوایان لێ بێت.

خوای گەورە ئەو دیمەنەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە چۆن ساحیرەکان لە کات و ساتێکی کەمدا لە سەربازگەی کوفر و زوڵمی فیرعەونییەوە، دەچنە ناو سەربازگەی ئیمان و خواناسی، چونکە کاری ئەوان خەیاڵ و چاوبەستی بوو، بەڵام کاری مووسا ڕاستی و دروستی حەق بوو. ئەوانیش خۆیان خاوەن پیشەی جادوو بن و لەهەموو کەس زیاتر ئاشنان بە کاری قیزەونی خۆیان، هەموو ناچار بوون سوجدە بۆ خوا بەرن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدٗا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ٧٠ قَالَ ءَامَنتُمۡ لَهُۥ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِي عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحۡرَۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ وَلَتَعۡلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابٗا وَأَبۡقَىٰ ٧١ قَالُواْ لَن نُّؤۡثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِي فَطَرَنَاۖ فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ ٧٢ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغۡفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكۡرَهۡتَنَا عَلَيۡهِ مِنَ ٱلسِّحۡرِۗ وَٱللَّهُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ٧٣ إِنَّهُۥ مَن يَأۡتِ رَبَّهُۥ مُجۡرِمٗا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ٧٤ وَمَن يَأۡتِهِۦ مُؤۡمِنٗا قَدۡ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ ٧٥ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ٧٦﴾ طه

واتە: کاتێک مووسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ گۆچانەکەی هەڵدا بووە مارێکی گەورەو هەموو مارو هەژدیهاکانی ئەوانی قووت دا کە ساحیرەکانیش ئەمەیان بە چاوی خۆیان بینی زانییان ئەوەی مووسا سیحر نیەو موعجیزەیەو لە لایەن خوای گەورەوەیە هەر هەموو ساحیرەکان موسڵمان بوون و کڕنووشیان بۆ خوای گەورە برد و ئیمانیان بە مووسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ هێناو وتیان: ئەوە ئێمە ئیمانمان بە خوای هاروون و مووسا هێنا٧٠ فیرعەون وتی: ئایا ئێوە ئیمانتان پێی هێنا پێش ئەوەی کە من مۆڵەتتان بدەم و ئیزنتان بدەم، مووسا گەورەو مامۆستاکەتان بوو کە فێرە سیحری کردن پاشان هەڕەشەی لێ کردن و ترساندیانی و وتی: ئەبێ دەستی ڕاست و پێی چەپتان ببڕمەوە، ئەبێ بەسەر ئەو دارخورمایانەوە هەڵتانبواسم و لە خاچتان بدەم ئەو کاتە ئەزانن سزای کاممان سەختترەو بەردەوامترەو ئەمێنێتەوە٧١ جادووگەرەکان کە موسڵمان بوون وتیان:

ئێمە ئەوەی کە بۆمان هاتووە لە بەڵگەی ڕوون و ئاشکراو یەقین و هیدایەت و موعجیزە لە لایەن مووساوە عَلَيْهِ السَّلَامُ نایگۆڕینەوە بەوەی تۆ، هەرگیز دەستبەرداری نابین و تۆ هەڵنابژێرین سوێند بێت بە خوای دروستکارمان، یاخود ئەو خوایەش کە ئێمەی دروست کردووە باوەڕمان بەو هەیە چیت لە دەست دێت بیکە، تۆ تەنها ئەتوانی لە دونیادا سزامان بدەی ئەوی تر بەدەست خوای گەورەیە و ئێمەیش مەبەستمان قیامەتە نەک دونیا﴿٧٢﴾ ئێمە ئیمانمان بە پەروەردگاری خۆمان هێنا تا خوای گەورە لە تاوانەکانی پێشترمان خۆش بێ لە کوفرو سیحر ئەو سیحرانەی پێشتر کە تۆ بە زۆر پێمانت کردووە تا خوای گەورە لێمان خۆشبێ بەتایبەتی ئەوەی کە ڕووبەڕووی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بووینەوە، خوای گەورە بۆ ئێمە باشترە لە تۆ، پاداشتیشی ئەمێنێتەوەو بەردەوامترە لەوەی تۆ﴿٧٣﴾ بە دڵنیایی هەر کەسێک بگات بە خوای گەورە بە تاوانەوە ئەوە ئەچێتە ئاگری دۆزەخەوە کە لەوێ نە مردن هەیە کە بمرێت و ڕزگاری بێت، نە ژیانیش هەیە کە ژیانێکی خۆش بێت بەڵکو زیندووەو هەمووی سزایە﴿٧٤﴾ بەڵام هەر کەسێک بگات بە خوای گەورە بە باوەڕداری و کردەوەی چاکی ئەنجام دابێت ئەمانە پلە بەرزەکانی بەهەشتیان بۆ هەیە﴿٧٥﴾ بەهەشتێک کە بۆ هەمیشەییەو ئەمێنێتەوە کە ئاو بە ژێر خانوو و دارو ماڵەکاندا تێ ئەپەڕێت بە نەمری و بۆ هەمیشەیی لەوێ ئەمێننەوە، ئەمەش پاداشتی کەسێکە کە خۆی لە کوفرو تاوان پاک بکاتەوە و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوەو بە تاک و تەنها خوای گەورە بپەرستێت﴿٧٦﴾.

سوجدەبردنیان سەری فیرعەونی شۆڕ کرد، چیتر فیرعەون نەیتوانی دان بەخۆیدا بگرێت، وتی: ئەمە فێڵە کردووتانە بۆ بەرزکردنەوەی ئابرووی خۆی و ئەوانەی لەگەڵیدان، ئینجا گەڕایەوە کۆشکەکەی و بڕیاری کوشتنی و لەسێدارەدان و بەخاچ هەڵواسین، سزای پێنج ئەستێرەی بۆ دانان قاچ و دەستی ڕاست و چەپیان دەبڕێت و هەڵیان دەواسێت بە پەلک و قەدی دارخورمادا، بەڵام هیچ کاریگەری نەبوو بۆ ساحیرە تۆبە کارەکان و ئەوان بڕیاری شەهیدبوونی خۆیان داوە و کاریگەری ترس و تۆقاندنی فیرعەون لەسەریان ئەرزشی (نرخی) نییە و چاوەڕوانی بەهەشتی خوای پەروەردگارن.

پاشان فیرعەون شکست لەدوای شکست دەیخوارد، هەرجارێک پلانی دادەنا بۆ لەناو بردنی مووسا و هاروون، خوای گەورە دیاردەیەکی سرووشتی دەنارد کە سەرقاڵی دەکردن بەو دیاردانەوە، لەوانە نەبوونی بەروبووم لەکاتێکدا خاکی میسر زۆر پڕ بیت و بەرەکەت و پڕ فەڕ بووە، فیرعەون و دارودەستەکەی داوایان کرد لە مووسا ئەگەر پێغەمبەری فەرموو بەروبوومەکانمان بۆ چارەسەر بکە، حەزرەتی مووساش دوعای کرد بەروبوومی خەڵکی بە گشتی پڕ پیت و بەرەکەت بوو، بەڵام فیرعەون هەر ملی نەدا، پاشان خوای گەورە باوبۆران و طۆفانیان

بۆ دەنێرێت جارێکی تر دێنەوە بۆلای مووسا و داوای لێدەکەن ئەگەر بتوانێت ئەو طۆفانە بوەستێنێت ئەوا گەلی ئیسرائیلی ئەداتێ کە لە وڵاتی میسر بڕۆن، مووسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ دیسان دوعا و نزا لە خوای پەروەردگار دەکات کە طۆفانەکە بوەستێنێت خوای گەورە طۆفان دەوەستێنێت. جارێکی تر پلان دادەنێتەوە فیرعەون بۆ لەناوبردنی مووسا و هاروونی برای خوای گەورە ئەو وڵاتە پڕ دەکات لە کوللە، تەنانەت ماڵەکانیشیان کوللە دەیگرێتەوە بەرووبوومیان لەناو دەچێت، ئەم جارەش دێنەوە بۆلای مووسا و دارودەستەی فیرعەون و خودی فیرعەون داوای لێ دەکەن کە نزا و دوعا بکات ئەو کوللە و نەهامەتییەیان لەسەر هەڵبگرێت.

فیرعەون ملهوڕترین کەس بووە ئەم هەموو موعجیزەیەی بینی، بەڵام دیسان کەوتەوە پلاندانان بۆ کوشتنی مووسا و گەلی ئیسرائیل، خوای موتەعال ئەمجارە ماڵەکانی پڕکردن لە ڕشک و ئەسپێ، تەنانەت ڕووباری نیلیش پاکی نەئەکردەوە، ئەمجارەش ناچار فیرعەون هاتەوە لای مووسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ و داوای لێکرد کە بەڵای ئەسپێ یان لەسەر هەڵبگرێت، مووسا هەڵسا بە دوعا و پاڕانەوە خوای گەورە لەسەری هەڵدەگرتن. فیرعەون بۆ ساتێکیش بیری لە پەشیمانی نەدەکردەوە، بەڵکو هەرجارە کەبەڵا و موصیبەتێکیان لەسەر لادەچوو هەموو شتێکی بیردەچووەوە، دیسان پلانی کوشتنی مووسا و هاروونی برای دادەڕێژێت، خوای گەورە ماڵ و قاپ و قاچاخی پڕ کردن لە بۆق، تەنانەت جێگاوبان و شوێنی خەوتنیان پڕ بوو لە بۆق و هەراسانی کردبوون، ئەمجارەش بەسەرشۆڕی فیرعەون داوای کرد لە حەزرەتی مووسا کە ئەو بۆقانە لەسەریان لابەرێت، ئەوا گەلی ئیسرائیلیان پێدەبەخشێت.

حەزرەتی مووسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ هەڵدەسێت بە پاڕانەوە دوعای کرد لە خوای موتەعال کە ئەم بەڵایەیان لەسەر لابەرێت، خوای گەورە ئاو خواردن و خۆراک و جلوبەرگ و ماڵیان دەکات بە خوێن، هەرچی دەخۆن و دەخۆنەوە لەناو دەمیاندا دەبێتە خوێن ڕووباری نیل و چەمەکانی هەمووی هەر دەبێتە خوێن!

ئەم جارەش بەسەرشۆڕی و ناچاری دێتە لای مووسا و داوای لێدەکات کە ئەم خوێنەیان لەسەر لابەرێت، حەزرەتی مووسا داوا لە خوای گەورە دەکات کە ئەو خوێنەیان لەسەر لابەرێت، خوای گەورە لەسەریان لادەبات و فەرمان بە حەزرەتی مووسا دەکات کە گەلی ئیسرائیل ئاگادار بکاتەوە لەگەڵ خۆیاندا بیانبات و چاوەڕوانی فەرمانی فیرعەون نەبێت.

گومانی تێدانییە کە گەلێکی ئاوا زۆر لە شەو و ڕۆژێکدا ڕێکناخرێت بۆ دەرچوون لەو وڵاتە، بۆیە ئەمەش کاری دەوێت، مووسا هەڵسا بە داڕشتنی پلانێک بۆ دەرچوونی گەلی ئیسرائیل.

## خۆ ئامادە کردن بۆ دەرچوون و خنکانی فیرعەون

لەدوای ئەو ڕووداوانە ڕوویاندا و زیاتر قیبطیبەکان بێ دین تر و ڕق ئەستوور تر دەبوون بەرانبەر بە مووسا و هاروون و گەلی ئیسرائیل بەگشتی وا هەموو ساحیرەکان موسڵمان بوون، ئەو هەموو موعجیزەیەی مووسایان بەچاوی خۆیان بینی، تا ئەم ساتە وەختەش داروودەستەی فیرعەون و خودی فیرعەون لە داڕشتنی پلاندان بۆ نەهێشتنی بەنی ئیسرائیل، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ ﴿١٢٧﴾ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٢٩﴾﴾ الأعراف

واتە: دەسەڵاتدارو گەورەکان لە قەومی فیرعەون وتیان: ئەی فیرعەون ئایا تۆ واز لە مووسا و قەومەکەی دێنی تا ئاشووب و ئاژاوەبگێڕن لەسەر زەویدا واز لە خۆت و پەرستنت بێنێت، یان واز لە خۆت و خوایەکەشت بێنێت، کە ئەڵێن: فیرعەونیش خوای هەبووە بتی هەبووە پەرستوویەتی، یان خۆری پەرستووە، یان ملوانکەی لە ملدا بووە کڕنوشی بۆ بردووە. فیرعەون وتی: کوڕانیان ئەکوژین و ئافرەتانیان ئەهێڵینەوە بۆ خزمەتکاری و ئێمە بەسەر ئەواندا زاڵ و باڵادەستین﴿١٢٧﴾ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بە قەومەکەی فەرموو ئێوە پشت بەخوای گەورە ببەستن و ئارام بگرن، بە دڵنیایی زەوی موڵکی خوای گەورەیە و خوای گەورە بە ویستی خۆی کەسانێک لە بەندەکانی خۆی ئەکات بە میراتگری، کە ئەمە موژدە بوو لە مووسا و قەومەکەی، سەرەنجام هەر بۆ ئەو کەسانەیە کە تەقوای خوای گەورە ئەکەن﴿١٢٨﴾ وتیان: ئەی مووسا (علیه السلام) پێش ئەوەی کە تۆ بێی ئێمە هەر لەلایەن فیرعەونەوە ئازار ئەدراین و کوڕانمان ئەکوژرا، دوای ئەوەی کە تۆش هاتوویتەوە دیسان ئەوەتا ئێستا فیرعەون ئازارمان ئەدات و ئەمانکوژێت، مووسا فەرمووی: بەڵکو خوای گەورە دوژمنەکەتان لەناو بدات کە فیرعەونە و ئێوە بکات بە جێنشین لەسەر زەویدا تا خوای گەورە تەماشا بکات ئێوە چ کارو کردەوەیەک ئەکەن، ئایا وەکو فیرعەون و قەومەکەی زاڵم و ستەمکار ئەبن یاخود عیبادەتی خوای گەورە ئەکەن و خوای گەورە لە خۆتان ڕازی ئەکەن، واتە کە خوا نیعمەتی پێ بەخشین و ڕزگاری کردن سوپاسگوزاری بن﴿١٢٩﴾

لەدوای ئەوەی ڕاوێژکارانی فیرعەون لەدوای چپاندنیان بە گوێی فیرعەون دا و هاندانی بۆکاری خراپە، بڕیاریاندا کە پیاوەکان بکوژن و ژنەکانیان بکەنە کۆیلە و کەنیزەک بە بیانووی ئەوەی دینەکەیان گۆڕیوە کاری فەسادی و گەندەڵی ئەنجام ئەدەن لە سەرزەویدا، ئەم بڕیارە

پێدەچێت لە ئەنجامی ئەو مەفرەزە بچووکانەوە بووبێت کە مووسا دروستی کردبوون بۆ پاراستنی خەڵکەکەی گەلی ئیسرائیل، چونکە دارودەستەی فیرعەون خۆیان بە بەهێزتر دەزانن لەوان.

بۆیە حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ هیچ چارەو دەسەڵاتێکی نەما بۆیە ناچار بوو بەوە کە پێیان بڵێت ئارام بگرن خوای گەورە دەرگای ڕەحمەت لە کەس داناخات و کۆتایی دەسەڵاتی سەر ئەم زەوییە بۆ خواناسان و خۆپارێزانە.

حیواری سێیەمی گەلی ئیسرائیل بەرانبەر مووسا قسە دەکات و دەڵێت هەمووی خەتای تۆیە، بە لەدایک بوونت بەهۆکاری تۆ ئازار ئەدراین، هەر بە گەڕانەوەت لە مەدیەن بەهۆکاری تۆ دووبارە ئازار دەدرێین، ئەم شێوە قسەکردنە ڕاستە ناڕەحەتی گەلەکەی پێوە دیارە، بەڵام حەزرەتی مووسا داوای هیچ شتێکی نەکردووە بۆ خۆی و بنەماڵەکەی پێش لە دایک بوونی مووسا ئەوان هەموو کۆیلە کرابوون، بەهەرحاڵ کارێکی زۆر نەشیاو بوو، ئەنجامیاندا بەرانبەر مووسا، مووساش وەکو سەرکردەیەکی لێ هاتوو موژدەی دانێ کە پێدەچێت بەم نزیکانە دوژمنەکەتان لەناوبچێت، ئێوە بڕۆنە جێگای لەسەر زەویدا ببنە خاوەن دەسەڵات.

لەکاتێکدا مووسا دەیتوانی وەڵامیان بداتەوە، بە پێچەوانەوە کە بە هۆکاری گەلی ئیسرائیل لەماڵ و کەسوکاری دوورخراوەتەوە، هەر بەهۆکاری پشتگیری لە هۆزەکەی ۱۰ ساڵ دەربەدەر بوو، وا هاتۆتەوە ڕووبەڕووی فیرعەون

بۆتەوە کە هیچ کەس لە بەنی ئیسرائیل ئەو توانا و جورئەتەی نەبووە، بەڵام وازی لەم قسانە نەهێنا و مژدەی سەرکەوتنی دانێ، پاشان دوعا و نزا و پاڕانەوەی واز لێ نەهێنا و فەرمووی:

﴿وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوْمِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ۝٨٤ فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ۝٨٥ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ۝٨٦﴾يونس

واتە: مووسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ فەرمووی: ئەی قەومی خۆم ئەگەر ئێوە ئیمانتان بەخوای گەورە هێناوە تەنها پشت بەخوای گەورە ببەستن و تەوەکول بکەنە سەر خوای گەورە و کارەکانتان بەخوای گەورە بسپێرن ئەگەر ئێوە موسڵمانن خوای گەورەتان بەسە۝٨٤ ئەوانیش موسڵمانان وتیان: تەنها پشتمان بەخوای گەورە بەست و کاری خۆمان بەخوای گەورە سپارد، خوایە مەمانکە بە فیتنە بۆ ستەمکاران و ئەوان زاڵ مەکە بەسەرماندا کە تووشی فیتنەمان بکەن و لە دینەکەمان پاشگەزمان بکەنەوە بە سزادانمان وابزانن ئەوان لەسەر حەقن و ئێمە لەسەر باتڵین بۆیە زاڵ

بوونە بەسەرماندا، یاخود خۆت سزامان مەدە وابزانن ئەوان لەسەر حەقن و ئێمە لەسەر باتڵین بۆیە تۆ سزات داوین﴿٨٥﴾ بەڕەحمەتی خۆت ڕزگارمان بکە لەم کەسە کافرانە﴿٨٦﴾.

دارودەستەی فیرعەون زۆر خراپەکار بوون لەوانە قاروون و هامان، هەرچەندە قاروون لەبەنی ئیسرائیل بوو، چونکە لەسەردەمی حەزرەتی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ دەبوو وەزیرێک لەبەنی ئیسرائیل بێت، جا فیرعەونیش وەکو پیشەی حکومەتەکانی ئەمڕۆ پۆستی وەزارەتی ماڵ و سامانی دابووە قاروون، خۆی کەسێکی گەندەڵ و خراپەکار بوو، تەنانەت لەبەر پلە و پۆستی وەزارەتی ئابووری فیرعەون دژی گەلەکەی خۆی بوو، لامان سەیر نەبێت زۆرن لەم جۆرە کەسانە لە کۆن و نوێ دا.

مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ تەنها بۆ خودی فیرعەون نەنێردرابوو، بەڵکو بۆ فیرعەون و هامان و قاروونیش، ئەوانیش دەسەڵاتدار بوون، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَقَارُونَ فَقَالُوا سَاحِرٌ كَذَّابٌ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا اقْتُلُوا أَبْنَاءَ الَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ وَاسْتَحْيُوا نِسَاءَهُمْ ۚ وَمَا كَيْدُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُ ۖ إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ ﴿٢٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ﴿٢٧﴾ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَانَهُ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ وَقَدْ جَاءَكُم بِالْبَيِّنَاتِ مِن رَّبِّكُمْ ۖ وَإِن يَكُ كَاذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُ ۖ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ الَّذِي يَعِدُكُمْ ۖ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ﴿٢٨﴾ يَا قَوْمِ لَكُمُ الْمُلْكُ الْيَوْمَ ظَاهِرِينَ فِي الْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِن بَأْسِ اللَّهِ إِن جَاءَنَا ۚ قَالَ فِرْعَوْنُ مَا أُرِيكُمْ إِلَّا مَا أَرَىٰ وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ﴿٢٩﴾﴾ غافر

واتە: بە دڵنیایی ئێمە بە کۆمەڵێک موعجیزەو بەڵگەی ڕوون و ئاشکراوە مووسامان علیه السلام نارد﴿٢٣﴾ بۆ لای فیرعەون و (هامان) کە وەزیری فیرعەون بوو، بۆ لای (قارون) کە دەوڵەمەندترین کەسی سەردەمی خۆی بوو، ئامۆزای مووسا علیه السلام بوو ئەمان وتیان: مووسا (علیه السلام) جادووگەرەو زۆر درۆزنە﴿٢٤﴾ کاتێک کە حەقی بۆ هێنان لەلایەن ئێمەوە ئەو هەموو موعجیزەیەی کە بە چاوی خۆیان بینیان وتیان: ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە لەگەڵ مووسادا کوڕەکانیان بکوژن ئافرەتانیان بهێڵنەوە بۆ خزمەتکاری، نەخشەو پیلانی کافران تەنها لە گومڕایی و وێڵی و تیاچووندایە﴿٢٥﴾ فیرعەون وتی: وازم لێ بێنن و لێمگەڕێن با مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بکوژم و

ئەویش با بانگی پەروەردگاری بکات ئەگەر ڕاست ئەکات با خوایەکەی بێت من بێباکم و گوێ نادەم و بەلامەوە ئاساییە، من لەوە ئەترسێم کە مووسا عَلَيْهِ السَّلَام ئایینی ئێوە بگۆڕێ یاخود لەسەر ڕووی زەویدا ئاشووب و گەندەڵی بڵاو بکاتەوەو ناکۆکی بنێتەوە﴿٢٦﴾.

وا داروودەستەکەی ناساند پێمان خوای پەروەردگار پلانەکەشیان دیارە، بەڵام لەناودار و دەستەی فیرعەون دا کەسێکی ئیماندار کە کار بۆ مووسا دەکات لانی کەم زوڵم و زۆرداریيان بیردەخاتەوە، ڕق ئەستووریيان هێمن دەکاتەوە لە بەرانبەر مووسادا، زۆر بەسادەیی پێیان دەڵێت کەسێک دەکوژن کە دەڵێت خوای من (الله سبحانه و تعالی)یە واتا لەسەر ئەم وشەیە ئەی کوا ئازادی ڕادەربڕین؟ کوا مافی مرۆڤ؟ ئەوانەی کە زۆر باسی مافی مرۆڤ و ئازادی دەکەن دڵنیا بن ئەوە زۆر فیرعەونیانە بیردەکاتەوە دەشێت ئازادی بۆ بەرەڵایی زۆر بێت و پەرەبسێنێت، بەڵام ئازادی بۆ خواناسی نییە، چونکە پڕۆژەی فیرعەونەکان دەخاتە مەترسی.

هەر بۆیە ئەو کەسە بیریان دەخاتەوە کە دەسەڵاتی فیرعەون بەهێز و بەتوانا و حوکمڕانە و خاوەنی وڵاتی میسرە، لەنێوان تەرغیب و تەرهیب دا، وتەکەی خۆی خستە بەردەم فیرعەون. هەرچەندە هەڵوێستی ئەوانی لاواز کرد و فیرعەون وتەکەی پێ خۆش نەبوو، وەکو هەموو سەرکردەیەکی ئەمڕۆ کە هاوشێوەی فیرعەونە وتی: ئەوەی من فەرمانی پێ دەکەم و دیدوبۆچوونی منە، ئەوە باشترین ڕێگا و پێگەیشتوترین و ڕێنمونیترین بۆچوون و ڕێگایە.

هەروەکو چۆن لە ئێستادا سەرۆک هەرچی وت لە وڵاتاندا ئیتر ئەوە وتەی هەموو گەلە، پێویست ناکات گەل بیربکاتەوە، زەعیم و سەرۆک بیرمان بۆ دەکەنەوە.

ئینجا فیرعەون دەستی کرد بە وتاردان بۆ گەلی قیبطییەکان، بەوپەڕی لووتبەرزی و خۆبەزلزانی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِۦ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴿٥١﴾ أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٌ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ﴿٥٢﴾ فَلَوْلَآ أُلْقِيَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ﴿٥٣﴾ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ﴿٥٤﴾ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْءَاخِرِينَ﴿٥٦﴾﴾الزخرف

واتە: فیرعەون لەناو قەومەکەیدا بانگی کرد وتی: ئەی قەومی خۆم ئایا موڵکی میسر هەمووی هی من نییە؟ ئەم ڕووبارانەی (نیل)یش لە ژێر کۆشک و تەلارو دەسەڵاتی مندا ئەڕوات، ئایا نایبینن کە بزانن من چەند بەهێزم و مووسا عَلَيْهِ السَّلَام چەند لاوازو بێدەسەڵاتە بۆ شوێنی ئەکەون﴿٥١﴾ بەڵکو من باشترم لەم کەسە بێڕێزو سووک و بێنرخە، نزیکیشە لە قسەی تێ

نەگەی﴿٥٢﴾ وتی: باشە ئەگەر پێغەمبەری خوایەو کەسێکی گەورەیە بۆچی نەڕازێندراوەتەوە بە خشڵ و ئاڵتوون؟ یان بۆچی فریشتەکان لەگەڵیدا نایەن پێکەوەو شایەتی بۆ بدەن ئەگەر ڕاستگۆیە؟ با بە چاوی خۆمان ببینین، بەمە گومانی بۆ خەڵکی دروست ئەکرد﴿٥٣﴾ بۆیە ئەم سووکایەتی بە عەقڵی قەومەکەی کردو ئەوانیش گوێڕایەڵیان کرد بە دڵنیایی ئەوان قەومێک بوون لە گوێڕایەڵی خوا دەرچوو بوون و فاسق بوون﴿٥٤﴾ خوای گەورە ئەفەرمووێ: کاتێک ئەوان ئێمەیان تووڕە کرد ئەوپەڕی تووڕە بوون بەهۆی کوفرو شەریک دانان و وەڵام نەدانەوەی پێغەمبەر مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ تۆڵەمان لێ سەندن، فیرعەون و شوێنکەوتووانی هەموویانمان لەناو دەریاکەدا نوقم کرد﴿٥٥﴾ کردمانن بە پێشینەو پەندو عیبرەت بۆ کافرانی دوای خۆیان تا پەندو عیبرەت وەربگرن و کوفر نەکەن و وەڵامی پێغەمبەران بدەنەوە﴿٥٦﴾

هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَأَرَىٰهُ ٱلۡأٓيَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴿٢٠﴾ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدۡبَرَ يَسۡعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلۡأٓخِرَةِ وَٱلۡأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةً لِّمَن يَخۡشَىٰٓ ﴿٢٦﴾﴾ النازعات

واتە: مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ موعجیزە هەرە گەورەکەی نیشاندا بۆ ئەوەی کە ئیمان بێنێ و موسڵمان بێ، مەبەست لە موعجیزەکە گۆچانەکەی بووە، یاخود کە دەستی دەرکردایە سپی ئەبوو دەدرەوشایەوە، یاخود حوجەو بەڵگەی بۆ هێنایەوە بۆ ئەوەی کە موسڵمان بێت﴿٢٠﴾ بەڵام فیرعەون لە جیاتی ئەوەی ئەو حەقە بەڕاست دابنێ بەدرۆی زانی، سەرپێچی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ-ی کردو هیچ سوودێکی لە بانگەوازی مووسا نەبینی﴿٢١﴾ پاشان پشتی لەو حەقە هەڵکردو وەڵامی نەدایەوەو هەوڵ و کۆششی کرد بۆ کۆکردنەوەی ساحیران﴿٢٢﴾ ئەو کاتە سەربازەکانی کۆکردەوە، یاخود هەموو ساحیران و جادووگەرانی کۆکردەوەو بانگی کردن: هەر هەمووتان کۆببنەوەو ئامادەبن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مووسا، خەڵکەکەیشی کۆکردەوە﴿٢٣﴾ وتی: من پەروەردگاری هەرە بەرزی ئێوەم، نەمزانیوە جگە لەمن پەروەردگارو خوایەکی ترتان هەبێت﴿٢٤﴾ خوای گەورەش تۆڵەی لێ سەندو لە دونیاو قیامەتدا کردی بە پەندو عیبرەت بۆ هەموو ستەمکاران و کافرانی تر﴿٢٥﴾ بەڕاستی ئەمە پەندو ئامۆژگارییە بۆ هەر کەسێک کە بترسێ و ترسی خوای گەورەی لەدڵدا بێت﴿٢٦﴾

پاشان لە وتارەکەیدا ڕوودەکاتە هامان وەزیری سەربازی دەڵێت: هامان هەرەم و قەڵایەک یان بورجێکم بۆ دروست بکە تا بەرە و ئاسمان بڕۆم و بزانم خوای مووسا لە کوێیە، هەرچەندە درۆ دەکات!

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِي صَرْحًا لَّعَلِّيٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ۝٣٦ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًاۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ۝٣٧﴾غافر

واتە: فیرعەون بە هامانی وەزیری وت: ئەی هامان کۆشکی بەرزم بۆ دروست بکە لە خشتی سورەوە کراو بەڵکو بگەمە ڕێگاو دەرگاکانی ئاسمان و بیگرمەبەر۝٣٦ تا سەرکەوم ڕێگاو دەرگاکانی ئاسمان بگرمە بەرتا خواکەی موسی ببینم لەبەر ئەوەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ وتی: خوای من لە ئاسمانە هەر چەند من گومان ئەبەم کە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ درۆزن بێت و ئاسمان هیچ خوایەکی لێ نەبێ بەم شێوازە شەیتان کوفرو کردەوەی خراپی بۆ فیرعەون ڕازاندبووەوە ڕێگری لێ ئەکرد لە ڕێگای ڕاستی خوای گەورە نەخشەو پیلان و فڕوفێڵی فیرعەون هیچ شتێک نییە تەنها لە زەرەرمەندی و تیاچووندا نەبێت۝٣٧

لەم جۆرە گوتارانەی فیرعەون دا بەشێکی سیاسییە، بەشێکی گوتاری ئایینییە، بەشێکی گوتاری چەواشەکارییە بۆ هەڵخڵەتاندنی گەلەکەی و شوێنکەوتووانی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ، بەشێکی تری درۆکردنە لەگەڵ خۆی و چوار دەورەکەی، مووسا لەبەرانبەر فیرعەون و بانگەوازەکەیدا، ئەویش بانگەوازی دەکرد و گوتاری ئایینی و ڕاستی و دروستی دەگەیاند بە گوێی خەڵکیدا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿۞ وَيَٰقَوْمِ مَا لِيٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ ۝٤١ تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِي بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ۝٤٢ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِي ٱلدُّنْيَا وَلَا فِي ٱلْأٓخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۝٤٣ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْۚ وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ۝٤٤ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ۝٤٥ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّاۚ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ۝٤٦﴾غافر

واتە: ئەی قەومی خۆم ئەوە چییە من بانگتان ئەکەم بۆ ڕێگای ڕزگاری کە بریتییە لە پەرستنی خوای گەورە بە تاک و تەنها و بەڕاستدانان و شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی، بەڵام ئێوە

بانگم ئەکەن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، بۆ شەریک دانان بۆ خوای گەورە﴿٤١﴾ ئێوە بانگی من ئەکەن بۆ ئەوەی کە کوفر بکەم بە خوای گەورەو شەریکی بۆ دابنێم بەنەزانی و بەبێ بەڵگە، چونکە من هیچ زانیارییەکم نییە کە خوای گەورە شەریکی هەبێت لە کاتێکدا من بانگتان ئەکەم بۆ لای خوای گەورە کە خوایەکی زۆر بەعیززەت و لێخۆشبووە﴿٤٢﴾ درۆ نییەو گومانی تیادا نییەو ڕاستی و حەقیقەت وایە ئەوەی کە ئێوە منی بۆ لا بانگ ئەکەن لە بتەکانتان لەوانەی کە جگە لە خوای گەورە ئەیانپەرستن ناتوانن وەڵامی بانگەوازی هیچ کەسێک بدەنەوە نە لە دونیاو نە لە قیامەت، چەندێک خەڵکی لێیان بپاڕێتەوەو سوودو زیانیان بەدەست نییە، گەڕانەوەی ئێمەو شوێنی گەڕانەوەمان لە ڕۆژی قیامەتدا هەر بۆ لای خوای گەورەیە ئەو کەسانەیش کە زیادەڕەویان کردووە لە کوفرو شیرک و تاواندا ئەوانە بە دڵنیایی هاوەڵی ئاگری دۆزەخن﴿٤٣﴾ لە داهاتوویەکی نزیکدا بیر ئەکەنەوە لەو قسانەی من کە پێتانی ئەڵێم و ئەزانن کە من چەندێک ئامۆژگاری ئێوەم کردووەو دڵسۆزتان بوومەو پەشیمان دەبنەوە بەڵام لە کاتێکدا کە پەشیمانی سوودی بۆ کەس نابێت، من کارەکانی خۆم تەنها بە خوای گەورە ئەسپێرم و خۆم تەسلیمی خوای گەورە ئەکەم بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر بینایە بە بەندەکانی و هەموو شتێکیان ئەبینێ﴿٤٤﴾ خوای گەورە لە دونیادا ئەم باوەڕدارەی پاراست لەو نەخشەو پیلانە خراپانەی کە بۆیان داناو ویستیان بیکوژن، ڕۆژی قیامەتیش لە ئاگری دۆزەخ پاراستی و خستییە بەهەشتەوە کەسوکار و شوێنکەوتووانی فیرعەونیش تووشی خراپترین سزا بوون لە دونیادا بە نقوم بوون و لە قیامەتیشدا بە ئاگری دۆزەخ﴿٤٥﴾ هەموو بەیانیان و ئێوارانێک فیرعەون و دارودەستەو شوێنکەووتوانی بە ئاگر سزا ئەدرێن لەناو گۆڕەکانیاندا کاتێکیش کە ڕۆژی قیامەت دێت خوای گەورە ئەفەرمووێ: فیرعەون و شوێنکەوتووانی بخەنە ناو سەختترین سزاوە کە سزای ئاگری دۆزەخە﴿٤٦﴾

هەروەها ئیماندارانێک کە لەگەڵ مووسادا بوون ئەوانیش دەستیان کرد بە بانگەواز لەناو گەلی ئیسرائیل دا لەتاو ئەو هەموو ناڕەزایەتییەی دەریا دەبڕی لە بەرانبەر حەزرەتی مووسادا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ أَهۡدِكُمۡ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴿٣٨﴾ يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ﴿٣٩﴾ مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةٗ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَاۖ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ يُرۡزَقُونَ فِيهَا بِغَيۡرِ حِسَابٖ﴿٤٠﴾﴾غافر

واتە: باوەڕدارەکەی قەومی فیرعەون وتی: ئەی قەومی خۆم شوێن من بکەون ڕێگەی ڕاست و ڕێگای بەهەشتتان نیشان ئەدەم﴿٣٨﴾ ئەی قەومی خۆم ئەم ژیانی دونیایە چەند ڕۆژێکی کەمەو تیایدا ڕائەبوێرن و بەسەری ئەبەن و کۆتایی دێت پێی هەڵمەخەڵەتێن، بەڵام ڕۆژی دوایی شوێنی مانەوەی هەمیشەییە کە کۆتایی نایەت گرنگی و بایەخی پێبدەن﴿٣٩﴾ هەر کەسێک لە دونیادا خراپەو تاوان بکات ئەوا سزا نادرێتەوە تەنها بە هاوشێوەی ئەوە نەبێت، واتە: خراپە یەک بەرامبەر یەکە، هەر کەسێکیش کردەوەی چاک بکات و باوەڕدار بێت ئیتر ئەگەر نێر بێ یان مێ، ژن بێ یان پیاو بەمەرجێک باوەڕدار بێ ئەو کەسانە ئەچنە بەهەشتەوە، خوای گەورە لە بەهەشتدا ڕزق و ڕۆزیان ئەدات بەبێ ژمارەو یەکجار زۆر﴿٤٠﴾

بانگەوازی هەردوولا بەردەوام بوو حەق و باطڵ لەدوای ئەوەی ئەو هەموو موعجیزەیە ڕوویدا لەسەر دەستی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ، بەڵام فیرعەون سەرباز و دارودەستەکەی ملیان نەئەدا و تووشی ئینکاری و نەخۆشی لووتبەرزی بووبوون.

لەدوای تووشبوونی ئەو هەموو پیس و خراپەکارییە مووسا بەفەرمانی خوا ڕزگاری کردن، ئینجا کاتژمێری سفر دانرا بۆ دەرچوون لەو وڵاتە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ ٱلرِّجْزُ قَالُوا۟ يَٰمُوسَى ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ ۖ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلرِّجْزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ﴿١٣٥﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَٰفِلِينَ﴿١٣٦﴾﴾الأعراف

واتە: کاتێک کە سزاکە ڕوویدا بەسەریاندا و خوای گەورە بەم شتانە سزایدان وتیان :ئەی مووسا دوعا بکەو لە پەروەردگارت بپاڕێرەوە بەو بەڵێنانەی کە بەتۆی داوە ئەگەر ئەم سزایانەی خوای گەورەمان لەسەر هەڵبگری ئەوە ئێمە ئیمانت پێ دێنین بەنی ئیسرائیلیشت لەگەڵدا ئەنێرین و وازیان لێ دێنین لەگەڵتدا بێن بۆ قودس﴿١٣٤﴾ کاتێک کە خوای گەورە ئەم سزایانەی لەسەریان هەڵگرت تا کاتێکی دیاریکراو ئەوان بەڵێنەکەیان هەڵوەشاندەوەو بەنی ئیسرائیلیان لەگەڵ مووسادا نەناردو ئیمانیشیان پێی نەهێنا﴿١٣٥﴾ کاتێک کە بەڵێن و پەیمانەکەیان شکاند تۆڵەمان لێ سەندن و لەناو دەریاکە نگرۆمان کردن، لەبەر ئەوەی ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆزانی و بێئاگابوون لێی﴿١٣٦﴾.

بە حەزرەتی مووسایان دەوت ساحیر، هەرچەندە ناوی ساحیر لەو سەردەمەدا عەیبە نەبوو چونکە گەورە زاناکانی میسر هەموو ساحیر بوون، بەڵام بەرانبەر مووسا شیاو نەبوو، چونکە ئەو

پێغەمبەرە نازناوی ساحیریان لەویش دەنا کە داوای لابردنی ئەو ناڕەحەتیانەی لەسەریان بوو، وەکو کوللە و خوێن و ئەسپێ و بۆق، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَقَالُواْ يَـٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهۡتَدُونَ۝٤٩ فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابَ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ۝٥٠﴾ الزخرف

واتە: وتیان: ئەی ساحیر، لێرە مەبەست پێی زانایە، ئەی زانا ئەی پێغەمبەری خوا دوعا بکەو داوا بکە لە پەروەردگارت بەو بەڵێنەی کە پێی داوین ئەگەر ئێمە ئیمان بێنین سزامان لەسەر لائەدا، ئەوە ئێمە ئیمانمان هێناو ڕێگای هیدایەتمان گرتە بەر با خوای گەورە ئەو سزایانەی کە ناردوویەتییە سەرمان لایبدات۝٤٩ کاتێک کە مووسا دوعای کردو لە خوا پاڕایەوە خوای گەورە سزای لەسەر لابردن، لە وشکەساڵی و نەبوونی و بێ پیت و بەرەکەتی و ناردنی زریان و ئەسپێ و بۆق و خوێن، بەڵام ئەوان بەڵێن و پەیمانیان هەڵوەشاندەوەو گەڕانەوە بۆ سەر کوفرو شەریک دانان بۆ خوای گەورە۝٥٠.

مووسا بڕیاری دەرچوونی دا لەو وڵاتەدا لەگەڵ گەلی ئیسرائیل، هەموو بە شەودا دەرچوون بەرەو دۆڵێک کە ناسراوە بە (وادی النخیل) لەوێوە هێز و سەربازی فیرعەون کەوتنە شوێنیان و خوای گەورە دەریای سووری بۆ کرد بە دوو بەش و پێیدا تێپەڕ بێت و فیرعەون و سەربازەکانی شوێنیان کەوتن و هەموو لەناوچوون.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَا بَيِّنَـٰتٖ قَالُواْ مَا هَـٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّفۡتَرٗى وَمَا سَمِعۡنَا بِهَـٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ۝٣٦ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَـٰقِبَةُ ٱلدَّارِۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ۝٣٧ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَـٰهٍ غَيۡرِي فَأَوۡقِدۡ لِي يَـٰهَـٰمَـٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَـٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَـٰذِبِينَ ۝٣٨ وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ۝٣٩ فَأَخَذۡنَـٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَـٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۝٤٠ وَجَعَلۡنَـٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَـٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ۝٤١ وَأَتۡبَعۡنَـٰهُمۡ فِي هَـٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَـٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلۡمَقۡبُوحِينَ۝٤٢﴾ القصص

واتە: کاتێک کە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەو موعجیزە ئاشکراو ڕوونانەی بۆ فیرعەون و دەسەڵاتدارانی برد، ئەوان وتیان: ئەمە هیچ شتێک نییە تەنها جادوویەکەو هەڵبەستراوەو خۆت داتهێناوە، ئێمە لە باوک و باپیرانی پێشینمان شتێکی وامان نەبیستووە کەسێک ئاوا بێت و بانگەشەی

پێغەمبەرایەتی بکات و بڵێت بە تاک و تەنها خوا بپەرستن و شەڕیکی بۆ دامەنێن﴿٣٦﴾ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: پەروەردگارم زاناترە بەو کەسەی کە هیدایەتی هێناوە لەلایەن خوای گەورەوە سەرەنجام و سەرکەوتن بۆ کێ دەبێت بە دڵنیایی خوای گەورە کەسانی ستەمکارو هاوبەش بڕیاردەر سەرناخات﴿٣٧﴾.فیرعەون وتی: ئەی پیاوماقووڵان و خانەدانان من نەمزانیوە ئێوە جگە لە من خوایەکی ترتان هەبێت، ئەی هامان (کە وەزیرو ڕاوێژکاری بوو) ئاگر لەو قوڕە بەردەو قوڕم بۆ سوورکەوە، واتە: خشتی سوورەوە کراوم بۆ دروست بکە کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە بۆ ئەوەی بچمە سەر کۆشکەکە تا سەرکەوم بۆ لای خوایەکەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ کە دەڵێت خوایەکەی من لە ئاسمانە هەر چەندە من گومان ئەبەم کە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ درۆ بکات و هیچ خوای نەبێت﴿٣٨﴾ فیرعەون و سەربازانی بە ناحەق خۆیان بەگەورەزانی لەسەر ڕووی زەویدا لە میسر، گومانی وایان ئەبرد کە بۆ لای ئێمە ناگەڕێنەوەو زیندوو بوونەوە نییە﴿٣٩﴾ فیرعەون و سەربازەکانیمان بردەوە فڕێمان دانە ناو دەریاکەوەو نوقمان کردن، تۆ تەماشا بکەو بزانە سەرەنجامی ستەمکاران چۆن ئەبێ﴿٤٠﴾ ئەوانمان کردە پێشەوا بۆ شوێنکەوتووانیان، بەڵام بانگی خەڵکیان ئەکرد بۆ ئاگرو پێشەوای خراپ بوون لە ڕۆژی قیامەتیش کەس نییە سەریان بخات و لە سزای خوای گەورە بیانپارێزێت﴿٤١﴾ لە دونیایشدا لەعنەتمان لێ کردن و لە ڕەحمەتی خۆمان دەرمان کردن لە ڕۆژی قیامەتیشدا دیسانەوە دەرکراو ئەبن لە ڕەحمەتی خوا، یاخود بوغزێنراو ئەبن لەلایەن خوای گەورەوە، یاخود لەناو ئاگردا شێوەیان ئەشێوێنین بە سووتاندن﴿٤٢﴾

## کۆتایی سەردەمی فیرعەون و سەرەتایەکی نوێ بۆ گەلی ئیسرائیل

لەدوای ئەوەی مووسا و هاروون چەند ماڵێکیان جیاکردەوە بۆ کۆبوونەوە و ڕۆیشتنی خەڵکی ئیسرائیل لە وڵاتی میسردا و پێشتر هەندێک ماڵیان هەبوو کە بەندایەتی و خواپەرستیان تێدا دەکرد، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوۡمِكُمَا بِمِصۡرَ بُيُوتٗا وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴿٨٧﴾﴾ يونس

واتە: خوای گەورە وەحی بۆ مووسا و هاروونی برای نارد لە میسر بۆ قەومەکەی خۆتان ماڵ دروست بکەن و ماڵەکانتان بکەن بە مزگەوت و ڕووی بکەن لە قیبلە کە (بيت المقدس) بووە، یاخود وتراوە: کەعبەی پیرۆز بووە، چونکە لە فیرعەون دەترسان فەرمانیان پێکرا لە ماڵەکانیان نوێژ و عیبادەتی خوای گەورە بکەن، یان کاتێک کە بەڵاو سزایان سەخت بوو فەرمانیان پێ کرا

بە نوێژ کردن چونکە دڵنەواییەو هۆکارە بۆ لابردنی بەڵاو غەم و خەفەت، نوێژەکانتان بکەن و مۆژدە بدە بە باوەڕداران بەپاداشتی زۆرو سەرکەوتنی نزیک﴿٨٧﴾

ئینجا مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ دوعای کۆتاجاری کرد لە فیرعەون دارو دەستەکەی کە لەوپەڕی ئازار و ئەشکەنجەدانی مووسا و گەلەکەیدا ئەو دوعایەی لێکردن، خوای گەورە لەسەر زمانی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ دەفەرموێت:

﴿وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ ۖ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَٱسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴿٨٩﴾﴾ یونس

واتە: کاتێک کە فیرعەون و دەسەڵاتدارانی حەقیان وەرنەگرت و بەردەوام بوون لەسەر کوفرو ستەم و تاوان مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ دوعای لێکردن و فەرمووی: ئەی پەروەردگار تۆ جوانی و ماڵی دونیات بە فیرعەون و دەسەڵاتدارانی بەخشیووە لە هەموو شتێک کە بەهۆی ئەم جوانی و ماڵەوە لە ژیانی دونیادا خەڵکیان ئاوا گومڕا کردووەو لە ڕێگای ڕاستی تۆ خەڵکیان لاداوەو زاڵ بوونە بەسەر خەڵکیدا، یاخود خەڵکی پێیان دەخەڵەتێت وادەزانن تۆ خۆشت دەوێن بۆیە دونیات پێ بەخشیوون خوایە ماڵیان لەناو بدە دڵیان توند بکە و مۆری لێبدە کە حەق وەرنەگرێت و بۆ ئیمان نەکرێتەوەو ئیمان نەهێنن تا سزای بەئێش و ئازاری تۆ نەبینن کە ئەو کاتەیش ئیمان سوودی نییە﴿٨٨﴾ خوای گەورە فەرمووی: ئەی مووسا و هاروون ئەوە دوعای هەردووکتانم قەبووڵ کرد، کە مووسا دوعای ئەکردو هاروون ئامینی ئەکرد، ئێوە دامەزراو بن لەسەر دین و شوێن ڕێچکەو ڕێبازی ئەو کەسە نەزان و نەفامانە مەکەون﴿٨٩﴾

لێرەوە پرۆسەی لەناوچوونەکەی فیرعەون کۆتایی دەسەڵاتی دێت خوای موتەعال دەفەرموێت:

﴿۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ ۖ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآ ۖ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ﴿٦٢﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ ۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ ٱلْءَاخَرِينَ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيْنَا

مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴿٦٧﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦٨﴾﴾ الشعراء

واتە: خوای گەورە وەحی بۆ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ نارد کە بە شەو بەنی ئیسرائیلی بەندەکانی من دەربکە لە میسر چونکە فیرعەون و سەربازەکانی شوێنتان ئەکەون، ئەویش بەشەو بەنهێنی دەری کردن﴿٥٢﴾ فیرعەون کە بینی بەنی ئیسرائیل ڕۆیشتوون و نەماون تورە بوو بەناو شارەکاندا خەڵکی ناردو شوێنکەوتووان و سەربازەکانی خۆی هەر هەمووی کۆ کردەوە﴿٥٣﴾ بە دڵنیایی ئەمانە کەسانێکی نزم و بێڕێزو کەمن﴿٥٤﴾ ئەمانە هەمیشە ئێمە دڵ تەنگ و تورە ئەکەن و خەفەتمان ئەدەنێ﴿٥٥﴾ ئێمە لەوپەڕی ئامادەباشیداین بۆ شوێن کەوتنی بەنی ئیسرائیل و لەناو بردنیان﴿٥٦﴾ خوای گەورە ئەفەرمووێ: فیرعەون و سەربازەکانیمان دەرکرد لە شوێنێکدا کە باخ و بێستان و کانی و ڕووبارو سەرچاوەی ئاویان هەبوو﴿٥٧﴾ کەنزو ئاڵتوون و خشڵیان هەبوو، شوێن و کۆشکی چاکیان هەبوو﴿٥٨﴾ بەو شێوازە بەنی ئیسرائیلمان کرد بە میراتگریان ئەواغان لەناوبردو بەنی ئیسرائیل چوونە شوێنیان﴿٥٩﴾ لە کاتی بەرەبەیان و ڕۆژهەڵاتندا فیرعەون و وەزیرو دەسەڵاتداران و سەربازانی هەموویان شوێنی مووسا و موسڵمانان کەوتن﴿٦٠﴾ کاتێک کە هەردوو کۆمەڵەکە ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوەو یەکتریان لێ دەرکەوت و یەکتریان بینی هاوەڵانی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ وتیان: ئەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەوە فیرعەون پێمان گەیشت و پێشمان ئاوەکەیەو دواشمان فیرعەون و سەربازەکانێتی﴿٦١﴾ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: نەخێر ئەوان بە ئێمە ناگەن بە دڵنیایی من پەروەردگارم لەگەڵدایە بەزانیاری و بیستن و بینین و تواناو دەسەڵاتی، ئەو سەرمان ئەخات و ڕێنماییمان ئەکات و ڕزگارمان ئەکات﴿٦٢﴾ خوای گەورە ئەفەرمووێ: وەحیمان بۆ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ نارد بەو گۆچانەی بە دەستتەوەیە بیدە بە دەریاکەدا دەریاکە لەت بوو، بوو بە زەوییەکی وشک بە ئیزنی خوای گەورە ئاوەکە بەرز بووەوەو هەر شەپۆلێکی وەکو پارچە شاخێکی گەورە لە ئاسمان ڕاوەستا و بوو بە دوانزە ڕێگا، لەبەر ئەوەی دوانزە هۆز بوون بۆ ئەوەی هەر هۆزێک بە ئیسراحەت بپەڕنەوە، نێوانی ئاوەکەیش خوای گەورە بای ناردو وشکی کردو بەناو وشکانیدا تێ ئەپەڕین، تاق و کەلێنی لە نێوان ئاوەکاندا کردەوە تا لە یەکتری دیار بن و دڵنیا بن هەموویان ڕزگاریان بووە﴿٦٣﴾ ئالەوێدا فیرعەون و سەربازەکانیمان نزیک کردەوە لە دەریاکە تا چوونە ناو دەریاکەوە ئەوانیش بە دوایاندا ڕۆیشتن﴿٦٤﴾ مووسا و ئەوانەی لەگەڵیاندا بوون هەموومان ڕزگار کردن و لە دەریاکە پەڕینەوە﴿٦٥﴾ پاشان فیرعەون و سەربازو وەزیرو دەست و پێوەندیمان

هەمووی لەناو ئاوەکەدا غەرق کردو کەسیان ڕزگاریان نەبوو﴿٦٦﴾ کە ئەمە بەڕاستی ئایەت و موعجیزەیەکی گەورەیەو تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە دەرئەخات بەڵام زۆربەیان ئیمانیان نەهێنا تەنها کەمێکیان نەبێ﴿٦٧﴾ پەروەردگاری تۆ بەڕاستی زۆر باڵادەست و بە عیزەتە، زۆر بەڕەحم و بەزەییە بۆ باوەڕداران﴿٦٨﴾.

خوای گەورە فەرمانی کرد بە حەزرەتی مووسا کە بەشەودا گەلەکەی هەموی بخاتە ڕێ، دەبێت ئەوەش بزانن کە فیرعەون شوێنتان دەکەوێت دیارە خوای گەورە ئیرادە و ویستی وایە کە فیرعەون شوێنیان بکەوێت. پلانەکەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ وابوو کە بەناوی جەژنێکەوە هەموو گەلەکەی بردە دەرەوە بە شەودا، گەلی ئیسرائیل زۆر بوون لە نێوان هاتنی گەلی ئیسرائیل لەگەڵ یەعقوب دا عَلَيْهِ السَّلَامُ تا حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ (٤٠٠) ساڵ نێوانیان بووە، زانایانی تەفسیر ئەمەیان باسکردووە ئیبن کەثیر گواستویەتیەوە، لە جێگایەکی تردا دەڵێت نێوانی هاتنی گەلی ئیسرائیل لەگەڵ ئیسرائیل دا کە مەبەستی حەزرەتی یەعقوب-ە، لەگەڵ حەزرەتی مووسا عَلَيْهِمَا السَّلَامُ (٤٢٦) ساڵی شەمسی بووە.

هەربۆیە ژمارەیەک هاتووە لە ڕووداوی پێغەمبەران کە بە (چیرۆکی پێغەمبەران)ی ئیبن کەثیر ناسراوە، گوایە گەلی ئیسرائیل (٦٠٠) هەزار کەس بوون.[١٧]

هەروەها بۆ سەربازی فیرعەون بە یەک ملیۆن و (٦٠٠) هەزار مەزەندە کردووە، گوایە ئەوانەی کە سوار بوون (١٠٠) هەزار سوارەی سەربازی لەگەڵ بووە، واتا خاوەن ئەسپ.[١٨]

فیرعەون کە ئەم هەواڵەی بیست خێرا لە مەیدانەکانی شاردا سوپا زۆرەکەی کۆکردەوە و ڕاوێژکارەکانی وتیان با شوێنیان بکەوین، چونکە ئەوان زۆر کەمن لەچاو سوپای ئێمەدا.

خوای گەورە هەموویانی دەرپەڕاند لەناو باخ و بێستانیان کە لە لێواری ڕووباری نیل دا بوون، هەموو ئاڵتون و زیو و کۆشک و مەجلیسی خۆیان بەجێهێشت و شوێن گەلی ئیسرائیل کەوتن.

لەبەرەبەیاندا گەیشتنە سەر گەلی ئیسرائیل کە بەرەو وڵاتی شام ڕێگایان دەبڕی، گەلی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ کە هێز و سوپای فیرعەونیان بینی وتیان تەواو هەموو لەناوچووین، بە مووسادا هەڵشاخان. حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ دڵنیای کردنەوە کە خوای گەورە ڕێگا نیشاندەریەتی، چونکە لەو دۆڵەدا تەنها دەریای سوور ڕێگایان بوو، هەر بۆیە خوای پەروەردگار فەرمووی بە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٧] هەرچەندە ئەم ژمارەیە زۆر زۆرە و جێگای سەرنجە/نووسەر.

[١٨] ئەمەش جێگای بڕوا نییە، والله اعلم/نووسەر.

گۆچانەکەت بکێشە بە دەریای سووردا، هەر بە پێداکێشانی ڕووبارەکە لە هەردوولاوە وەستاو شەپۆلەکانی بەرزبوەوە وەکو شاخ بۆ ئاسمان و ڕێگایەک لەناو دەریاکە کرایەوە بۆیان، کە وشکانی بوو هەموو پێیدا پەڕینەوە بە خۆیان و ماڵومنداڵ و مەڕوماڵات و ئەسپ و وڵاغەکانیانەوە.

کە فیرعەون ئەمەی بینی خێرا داوای کرد کە سەربازەکانی کە شوێنیان بکەون، وای زانی دەریاکە بۆ ئەویش هەر بەو شێوەیە دەمینێتەوە، هەموو گەلی ئیسرائیل لەناو دەریاکەوە کە بۆیان بووە وشکانی پەڕینەوە بەگشتی و کەس نەکەوتە دەستی فیرعەون. فیرعەون و سوپاکەی لە ئاوەکەدا بوون واتا لەو ڕێگا وشکانییەی کە مووسا و گەلەکەی پێیدا پەڕینەوە و خوای گەورە بۆی فەراهەم هێنابوون، ئەوان هەموو نغرۆ بوون و غەرقی ناو دەریاکە بوون.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ وَجُنُودُهُۥ بَغۡيٗا وَعَدۡوًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾﴾ یونس

واتە: بەنی ئیسرائیلمان لە دەریاکە پەڕاندەوە بۆ وشکانی فیرعەون و سەربازەکانی شوێنیان کەوتن وەکو زوڵم و ستەم و دژایەتی کردن و دەستدرێژی کردنە سەریان تا فیرعەونیش چووە ناو ئاوەکە کە پێشتر لە سوورەتی (البقرة)و سوورەتەکانی تر باسمان کرد کە خوای گەورە دوانزە ڕێگای وشکانی بۆ مووساو موسڵمانان کردەوەو پەڕینە ئەوبەرەوە کاتێک کە فیرعەون و سەربازەکانی بەو ڕێگا وشکانیانە ڕۆیشتن خوای گەورە فەرمانی کرد ئاوەکە یەکیگرتەوەو هەموویانی لەناو ئاوەکە غەرق و نوقم کرد کە لە ڕۆژی عاشورادا بوو لەو کاتەدا فیرعەون زانی تەواو غەرق ئەبێ وتی :ئیمانم هێنا بەو خوایەی کە بەنی ئیسرائیل ئیمانیان پێ هێنا کە هیچ پەرستراوێک بەحەق نییە شایەنی پەرستن بێ تەنها ئەو خوایە نەبێ کە بەنی ئیسرائیل ئیمانیان پێی هێناوە و من تەسلیمی فەرمانی خوای گەورە بوومەو منیش یەکێکم لە موسڵمانان﴿٩٠﴾ خوای گەورە فەرمووی: بەڵام ئێستا ئیمان دێنی کە ئیمان سوودت پێ ناگەیەنێ، لەبەر ئەوەی ڕوح گەیشتە غەرغەرە ئیمان سوودی نییە، جبریلیش بە باڵەکانی قوڕی ئەکردە ناو دەمی فیرعەونەوە بۆ ئەوەی زوو گیانی دەرچێ و فریای ئیمان هێنان نەکەوێ پێشتر تۆ سەرپێچی خوای گەورەت ئەکرد و تۆ کەسێکی گەندەڵ و ئاشووبگێڕ بوویت و خراپەت ئەنایەوە لەسەر زەوی﴿٩١﴾ ئەمڕۆ لاشەی تۆ ئەپارێزین بەبێ گیان، کە بەنی ئیسرائیل گومانیان هەبوو لە مردنی فیرعەون خوای گەورە لاشەی بەبێ ڕۆح فڕێ دایە دەرەوەی دەریاکە لە شوێنێکی بەرزدا بە مردوویی تا

هەموویان بینیان و دڵنیا بوون کە فیرعەون مردووە تا بۆ ئوممەتانی دواتریش ببیت بە پەندو عیبرەت کە خوای گەورە هەر کەسێک لووتبەرزی بکات چی بەسەر دێنێت زۆرێک لە خەڵکی بێئاگان لە ئایەت و نیشانەکانی ئێمەو پەندو ئامۆژگاری لێ وەرناگرن﴿٩٢﴾.

فیرعەون کە بینی گەلی ئیسرائلی هەموو دەرچوون ئەویش لە ناوەندی دەریاکەدایە و شەپۆلی دەریاکە دایەوە بەیەکدا و یاسا و ڕێسای دەریایی خۆی پیادە دەکات، زانی کۆتایی هات وای زانی وەکو ڕابردوو کە گاڵتەی دەکرد بە مووسا پەشیمان بوویەوە، وای زانی وەکو ئەو چەند جارەی پێشوو کە لە بۆق، کوللە، خوێن و ئەسپێ ڕزگاری دەبێت، بەڵام ئەمجارە کۆتاییەتی هاواری کرد وا بڕوام هێنا بەخوای گەلی ئیسرائیل و منیش لە موسڵمانەکانم، بەڵام ئیمانەکەی بەدەردی نەخوارد و کۆتایی هات بە ژیانی و خوای گەورە لاشەکەی دەهێڵێتەوە تا ڕۆژی قیامەت بۆ پەند و عیبرەت.

لە جێگایەکی تردا خوای گەورە دیمەنەکەمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا رَأَوْاْ بَأْسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْاْ بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ فِى عِبَادِهِۦ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ﴿٨٥﴾﴾ غافر

واتە: کاتێک کە سزای ئێمەیان بە چاوی خۆیان بینیوتیان: ئەوە ئێمە بەتاک و تەنها ئیمانمان بە خوای گەورە هێناوە ئێمە کافرو بێباوەڕین بەو شتانەی کە پێشتر دەمانکردە شەریک بۆ خوای گەورە لە بتەکان﴿٨٤﴾ بەڵام کاتێک کە سزای ئێمەیان بە چاوی خۆیان بینی ئەو کاتە ئیمان هێنانەکەیان سوودی پێ نەگەیاندن لەبەر ئەوەی کاتێک سزای خوای گەورە دابەزێت ئیمان هێنان سوودی نییە، یان کاتێک ڕۆح بگاتە گەروو (غەرغەرە) ئیمان هێنان سوودی نییە، یان کاتێک کە قیامەت هەڵئەستێ ئیمان هێنان سوودی نییە، ئەمە سوننەتی خوای گەورەیە لەناو بەندەکان و ئوممەتانی پێشتریشدا هەر وابووە کافرانیش لەوێدا هەموویان زەرەرمەندو خەسارەتمەند بوون و خوای گەورە سزای دان، والله أعلم﴿٨٥﴾

بەم شێوەیە فیرعەون و سەربازەکانی لەناوچوون، گەلی ئیسرائیل ئەم دیمەنە گەورە و موعجیزە بێوێنەیەیان بینی بە چاوی سەریان و خۆیان لە واقیعەکەدا بوون، بێ هیچ کێشەو مەترسییەک پەڕینەوە بۆ خاکی (سیناء) ڕزگاریان بوو لە زوڵم و ستەمی فیرعەون و دارودەستەکەی، بەڵام هەندێک لەدارودەستەکەی مانەوە بۆ ئەوەی ئەم هەواڵە بەرنەوە بۆ وڵاتی میسر و عاقیبەتی فیرعەون بۆ خەڵکی ئەو وڵاتە باس بکەن، لێرەوە گەلی ئیسرائیل دەچێتە قۆناغێکی نوێوە.

## کۆی گشتی باس

ئەستەمە خەڵکانێک هەبن خاوەنی هێز و دەسەڵات و هەموو تەکنەلۆجیای سەربازی بن و دژی خوای گەورە بوەستەنەوە و دوژمنایەتی بکەن، خوای پەروەردگار کام دوژمنەی سەرسەختەو لووتبەرزە و خاوەنی هێزی گەورەیە لەناوی دەبات، خاچپەرستان لەناو چوون، تەتار و مەغۆل لەناوچوون، ئیستعمار دەرکرا، بەریتانیا خۆری ئاوا بوو، دەوڵەتی سۆڤیەت نەما، بەدڵنیاییەوە ئەوانەی تریش کە وەکو فیرعەونن هەر لەناودەچن، ئایینی خوا لەناو ناچێت، خۆ ئەگەر لەناوچوو واتا قیامەت دێت.

ژیانی حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ پڕیەتی لە پێداکێشان و ململانێ و بانگەواز، ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئایینێکە کە پڕ توخمی شۆڕشکردنە، هەموو ئەم باسانە بۆ پێغەمبەری خوا هاتووە کە ئاراستەی دەکات بەوەی کە فیرعەونەکانی قوڕەیشیش لەناو دەچن، بەڵام مرۆڤ نابێت لەکارکردن بوەستێت، پێویستە هەمیشە لەهەوڵی سەرخستنی ئایینی خوا بێت، خۆ ئەگەر وا نەکرا خۆ ئەوە دڵنیا بن هەرچی فیرعەونە بەسەرتاندا زاڵ دەبێت.

ژیان بزووتنەوەیەکی بازنەییە هەمیشە دووبارە دەبێتەوە، فیرعەون یەک کەس نەبووە، بەڵکو خاوەن دەزگاو سەرمایەداری گەورە بووە، لەم ڕۆژگارەی ئێستاماندا فیرعەون زۆرە کە هاوشێوەی فیرعەونەکانی میسرن، مەنهەجی حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ لە قورئان دا بۆمان باس کراوە، گەلی ئیسرائیل بەردەوامە لەم ژیانەدا، هەرگیز لەناویش ناچن تا ڕۆژی قیامەت. لە قورئان دا ئەزموونیان بۆ ئێمە باسکراوە لە ژیانی گەلەکە و خودی پێغەمبەرانیان بۆ ئەوەی گەندەڵییەکانیان دووبارە نەکەینەوە، پاشان شوێن پێغەمبەرانیان بکەوین بەوەی کە لە قورئان دا بۆمان باسکراوە. گێڕانەوەی ژیانی بەنی ئیسرائیل چیرۆک و ڕۆمان نییە تا چێژی سیناریۆ و ڕۆمانی لێوەربگرین، بەڵکو ئەزموونی ژیانە لە ئیدارە، ڕێکخستن، چاودێری، لە شۆڕش کردن دژی زوڵم و ستەم، قوربانی دانە لە پێناوی ئایینی خوادا بە ماڵو منداڵ و دایک و باوکەوە دەبێت هەوڵی بانگەوازی خوای پەروەردگار بدەین تا فەرمانڕەوایی بۆ خوای پەروەردگارمان بێت، دە ساڵ دووربوون لە کەسوکار، دەساڵ دەربەدەری، ئەگەرچی ژیانی خۆی لەبیر نەکرد، ژنی هێناو ماڵوسەروەت و سامانی پێکهێنا، بەڵام بانگەوازی خوای گەورەی لەبیر نەکرد و شۆڕشی کرد.

حەزرەتی (مووسا) بە وەحیی خوایی گەورە فیرعەونی لەناوبرد، تۆش کە خۆت بە شوێنکەوتووی ئەم ئایینە دەزانی، کەس لاری لەوە نییە لە ڕۆژئاوای یان ڕۆژهەڵات کارو کەسابەتی خۆت بکە و ژیان دروست بکە، بەڵام مەڵێ من حەقی هیچم نییە، تۆ کە حەقت نەبێت ئەی کێ حەقی هەیە؟

خوای گەورە یەک بەیەک لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکات، کەواتە تۆش و منیش بەرپرسین، بەرپرسیارێتی تەنها لەبەندایەتی کردنی دروشمەکاندا نییە، بەڵکو بەرپرسیارێتی لەبانگەواز و گەیاندنی ئایینی خوایە و هێنانەوەی حوکمڕانی خوای گەورەیە.

ژیانی حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَام پڕە لەوانە و ئامۆژگاری و ئەزموون بۆ خەڵکی خاوەن ئەقڵ و هۆش و بیر، هەروەها پەیوەندییەکی گەورە لەنێوان پێغەمبەری خوا و پێغەمبەر مووسادا هەیە، ئەو کەڵەکە بوونەی ئەزموونی مووسا ٥٠ فەرز لە نوێژکردن لەسەرمان کەم کراوە بە ٥ فەرز، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ڕزگاربوونی گەلی ئیسرائیل چۆن لە عاشورادا بەڕۆژوو دەبوون و سوپاسگوزاری خوای گەورە بوون بۆ ڕزگار بوونیان لەدەستی فیرعەون، ماوەی یەک ساڵ ڕۆژووی عاشورا لەسەر موسڵمانان فەرز بوو، پاشان بوو بە سوننەت کە گەلی ئیسرائیل لەسەر دەستی مووسا ڕزگاریان بووە لە فیرعەون.

## دووبارەبوونەوەی ژیانی فیرعەون و مووسا عَلَيْهِ السَّلَام

لەژیانی هەموو موسڵمانێکدا و هەموو کافرێکدا ئەم سیناریۆ و ڕووداوانە دووبارە دەبێتەوە یان دەچێتە شوێنکەوتنی پێغەمبەران یان دەچێتە خانەی شوێنکەوتووانی فیرعەون و طاغوتەکان.

ئەگەر مرۆڤ لەسەرەتاوە بەباشی هێنای لەناو خانەوادە و خێزانی خواناسەوە سەری هەڵدا، ئەوا کەسێکی باش و خواناسی لێ دەردەچێت، بەڵام دەشێت لە خانەوادەی خراپەکار و بێدین سەر دەربهێنێت، ئەوا خراپی لێ دەردەچێت، خوای گەورە بە حەتمی کەسێکی بۆ دەنێرێت کە بانگەوازی بکات، جا لە ڕێگای کتێب یان بینراو و بیستراو بێت، یان هەر هۆکارێکی تری بانگەوازەوە بێت، سەرەتا وەکو جاهیل لەقەڵەم دەدرێت تا بەڵگەکانت بۆ ڕوون دەبێتەوە، دوای ئەوە وەکو فیرعەون خۆت ڕێگای هیدایەت یان ئینکاری هەڵدەبژێرێت، فیرعەون ئەو هەموو بەڵگەیەی بینی خۆی داوای دەکرد لە مووسا، یەکەم جار لەوانەیە بوترێت فیرعەون جاهیل بووە و نەیزانی، بەڵام مووسا وتی: من پێغەمبەرم هیچ پەیوەندیم بە سیحر و جادوبازییەوە نییە، لای خواوە هاتووم پاشان ساحیرەکان موسڵمان بوون و وازیان لە جادووبازی هێنا، کەچی فیرعەون کەوتە ئینکاری کە پێی دەوترێت (جحد)، زۆرجار لەم سەردەمەدا زۆر مرۆڤ دەبینین کە ڕاستی بۆ ڕوون دەبێتەوە، بەڵام ئینکارەو شوێن بەرژەوەندی دەکەوێت، هەرچی ڕاستی هەیە خۆی لێ ون دەکات و شوێن خراپ و خراپەکاری دەکەوێت.

ئەم قۆناغە کە مرۆڤ بەردەوام بوو لەسەری دەیباتە ناو قۆناغێکی تر کە زۆر سامناکە ئەویش قۆناغی کوێربوونی ئەقڵ و چاوەو پاشان کەڕ بوونی گوێیە لە ئاستی ڕاستی و حەق و چاکەدا، کە لە قورئان دا بە (طمس) ناوی هاتووە، وەکو ئەوە وایە مێشکی مرۆڤ بە دیواری

کۆنکرێتی هەڵچنرابێت و چاویشی عەینەک و چاویلکەی ئاسنی کرابێتە چاو هیچ نابینێت تا لە کۆتاییدا نغرۆ دەبێت، لەو نموونانە زۆرن لە فیرعەونەوە تا دەگاتە طاغوت و فیرعەونەکانی سەدەی ٢١.

## کۆتایی کۆی گشتی ئەم باسە

وێستگەکانی ژیانی مووسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ زۆرن، تا ئێستا باسی دوو وێستگەی ژیانیمان کردووە، کە یەکەم وێستگەی منداڵییەتی بۆ قۆناغی لاوێتی و پەروەردە بوونی لە ماڵی فیرعەون و لەناو نازونیعمەت دا، کە دەگۆڕێت بۆ شوانی و دەربەدەری و ئاوارەبوون.

وێستگەی دووەم: قۆناغی بوون بە پێغەمبەر و وەستانەوە لەبەرانبەر زاڵمترین مرۆڤ کە فیرعەون بووە، پاشان کەڵەکە بوونی ئەزموونی سیاسەتی بەرهەڵستکاری و بوون بە ئۆپۆزسیۆن کە دەسەڵات چاوەڕوانی پڕۆژەی ئۆپۆزسیۆن بووە بۆ چاکسازی، تا وای لێهات متمانەی هەموو خەڵکی بەدەست هێنا. ئەم قۆناغە زۆر گرنگە پێداکێشان و ململانێی زۆری بەخۆوە بینیووە تا لەکۆتاییدا حەق سەرکەوت بەسەر باطڵدا و ڕاستی و ڕووناکی خۆی دەرخست و تاریکی و درۆش کۆتایی هات بە نەمانی فیرعەون.

## قاروون کێیە؟

قاروون لە گەل و هۆزی ئیسرائیلە، کەسێکی خراپەکار و سەرەڕۆ بووە، هەندێک لە زانایان دەڵێن کوڕی مامی مووسا بووە، قاروون کوڕی یصهر کوڕی قاهث-ە، مووسا کوڕی عیمرانی کوڕی قاهث-ە، سێ جار ناوی لە قورئان دا هاتووە، بەم وتەیەی ئیبن جەریری طەبەری بێت ئامۆزای یەکن لەگەڵ مووسادا، بەڵام پێدەچێت لە دەسەڵات و فەرمانڕەوایی فیرعەون دا پلەی وەریزی دارایی هەبووبێت.

خوای گەورە دەستنیشانی کاتەکە و سەردەمەکەی نەکردووە لە قورئان دا کە کەی لەناو دەچێت، ئایا لە دوای نغرۆ بوونی فیرعەونە یاخود پێش نغرۆ بوونیەتی، بەڵام بە بۆچوونی نووسەر دوای نغرۆ بوونی فیرعەون خوای گەورە لەناوی بردووە، بە بەڵگەی ئەوەی لە مێژوودا هاتووە کە قاروون ویستوویەتی بە ئافرەتێکی داوێن پیس مووسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ لە خشتە بەرێت،

حەزرەتی مووساش دوعای لێ کردووە کە خۆی و ماڵ و سەروەت و سامانی نغرۆی زەوی ببێت، هەروەکو چۆن فیرعەون نغرۆی دەریا بوو، ئەویش لەساڵی تیەدا لەناوچوو.

هەروەها بە بەڵگەی ئەوەی کە زانایانی گەلی ئیسرائیل ئامۆژگاری خەڵکیان کردووە کە ئاواتە خواز نەبن بە سەروەت و سامان و دەوڵەمەندی قاروون، دیارە مەوکیب و دارودەستەی زۆر بووە لە سەردەمی فیرعەون دا بووە لەناو گەلی ئیسرائیل نەبووە لەدوای دەرچوونیان و پەڕینەوەیان بۆ سیناء، بەڵگەیەکی تریش هەمیشە لەداروودەستەی فیرعەون باسکراوە، کەواتە لەناو گەلی ئیسرائیل دا نەبووە، بەڵکو دژی گەلی ئیسرائیل بووە جاکە دژی گەلی ئیسرائیل بووبێت، بە دڵنیاییەوە لەگەڵیاندا دەرنەچووە، بەپێی ئەم بەڵگانە پێ دەچێت دوای لەناوچوونی فیرعەون خوای گەورە قاروونی لەناو بردووە هامان و فیرعەونیش لەئاودا نغرۆ بوون.

خوای گەورە ڕووداوی ژیانیانمان بۆ دەگێڕێتەوە لە قورئان دا بەسێ دیمەن.

دیمەنی یەکەم: دەوڵەمەندی و بوغرا بوونی و سەروەت و سامانی زۆری.

دیمەنی دووەم: خەڵکانێک کە ئاواتەخوازبوون بە ژیان و دارودەستە و کاروانی ڕێگا بڕینی.

دیمەنی سێیەم: لەناوچوون و نغرۆ بوونی بەناخی زەوی دا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ۚ أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا ۚ وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٧٨﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ۖ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾﴾ القصص

واتە: بە دڵنیایی (قارون) لە قەومی مووساعَلَيْهِ السَّلَامُ بووەو ئامۆزای بووە گوێڕایەڵی مووسای نەئەکردو سنووری بەزاند بەسەر خەڵکیداو لووتبەرزی ئەنواند، ئەوەندەش کەنزو زێڕو ماڵمان پێی بەخشیبوو کە هەڵیگرتبوو یەک کۆمەڵ پیاوی بەهێز نەیان ئەتوانی تەنها کلیلی خەزێنەکانی

هەڵبگرن ئەوەندە خەزێنەکانی زۆر بووە، کاتێک کە پیاوچاکانی قەومەکەی ئامۆژگاریان کردو پێیان وت: ئەی (قاروون) بەم ماڵە دڵخۆش مەبەو بەهۆیەوە فەخرو شانازی بەسەر خەڵکیدا مەکە و لووتبەرزی مەکە لەبەر ئەوەی بە دڵنیایی خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە لووتبەرزن و فەخرو شانازی بەسەر خەڵکیدا ئەکەن﴿٧٦﴾ تۆ بەم ماڵ و سەروەت و سامانەی خوای گەورە پێی بەخشیویت هەوڵ بدە بۆ قیامەتت و بە هۆیەوە خوای گەورە لە خۆت ڕازی بکە بەشی خۆتیش لە دونیا لەبیر مەکە لە خواردن و خواردنەوەو پۆشاک بەڵام لە حەڵاڵدا تۆ چاکەکار بە بۆ بەندەکانی خوا چۆن خوای گەورە چاکەی لەگەڵ تۆدا کردووە تۆ ئاشووب لە زەویدا مەنێرەوەو خراپەکاری مەکە بە دڵنیایی خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێ کە ئاشووبگێڕن﴿٧٧﴾ (قاروون) وتی: ئەم ماڵە من بە زانیاری و لێهاتوویی خۆم پەیدام کردووە، یان خوای گەورە ئەیزانی کە من شایەنی ئەم ماڵەم بۆیە پێی داوم و فەزڵی من ئەزانێت ئایا نازانێ خوای گەورە لە پێش ئەمدا لە ئوممەتانی تر چەندەها کەسی لەناو بردووە کە زۆر لەم بەهێزتر بوونەو ماڵ و سەروەت و سامانیشیان لەم زۆرتر بووە؟ فریشتەکان پرسیار لە تاوانباران ناکەن دەربارەی تاوانیان لەبەر زۆری تاوانیان، دەیانناسنەوە﴿٧٨﴾ ڕۆژێک (قاروون) دەرچوو بۆ ناو قەومەکەی بە جوانی و ڕازاوەیی ئەوانەی کە مەبەستیان ژیانی دونیا بوو ژیانی دونیایان ئەویست وتیان: خۆزگە ئەوەی بە (قاروون) بەخشراوە خوای گەورە ئەوەیشی بە ئێمە بەخشیبایە بەڕاستی ئەو زۆر بەختەوەرە، یان بەشێکی یەکجار گەورەی هەیە لە دونیادا﴿٧٩﴾ بەڵام ئەوانەی زانست و زانیاری شەرعییان هەبوو زانایان وتیان: هاوار بۆ خۆتان، پاداشتی خوای گەورە لە بەهەشتدا باشترە لەوەی ئێوە دەیبینن بۆ کەسانێک کە ئیماندار بن و کردەوەی چاکیان کرد بێت، بەڵام کەس ئەم وتەیە وەرناگرێ و کاری پێ ناکات تەنها مەگەر کەسانێک زۆر ئارامگر بن لەسەر جوانی و ڕازاوەیی دونیاو پێی هەڵنەخەڵەتێن﴿٨٠﴾ خوای گەورە ئەفەرمووێ: خۆی و ماڵەکەیشیمان بە ناخی زەویدا بردە خوارەوەو ڕۆچوو بە ناخی زەویدا هیچ کۆمەڵێکی نەبوو کە بتوانن ڕزگاری بکەن لە سزای خوای گەورە خۆیشی نەیتوانی خۆی سەربخات و تیاچوو لەناوچوو﴿٨١﴾ ئەوانەی کە پێش ئێستا ئاواتەخواز بوون خوای گەورە وەکو ئەوی بەمانیش ببەخشیایە (وَيْكَأَنَّ) بە مانای هاوار بۆ خۆت و ئایا نازانی دێت، ئەیانووت: هاوار بۆ خۆت بزانە، یان ئایا نابینی کە خوای گەورە ڕزقی خۆی فراوان ئەکات بۆ هەر کەسێک کە ویستی لێ بێت لە بەندەکانی، ویستیشی لێ بێت کەمی ئەکاتەوە، ئەگەر خوای گەورە نیعمەتی خۆی نەڕژاندایە بەسەرمانداو ڕەحمی پێ نەکردینایە ئەوە ئێمەیشی لەگەڵ (قاروون)دا ئەبردە ناخی زەوی، چونکە ئێمە ئاواتمان بەو خواست هاوار بۆ خۆت بزانە، یان ئایا نابینی کە خوای گەورە کافران سەرفرازو سەرکەوتوو ناکات﴿٨٢﴾ خوای گەورە ئەفەرمووێ: بەهەشتمان بۆ کەسانێک داناوە

کە خۆیان بەگەورە نازانن لەسەر ڕووی زەویداو لووتبەرز نین و ئاشووب ناگێڕن و ماڵی خەڵکی بە ناحەق ناخۆن سەرەنجامیش هەر بۆ ئەو کەسانەیە کە تەقوای خوای گەورە ئەکەن﴿٨٣﴾.

نموونەی قاروون لەم ڕۆژگارەدا هاوشێوەی سیستەمی سەرمایەدارییە، خەڵکی چاوچنۆک دەکات وایان لێدەکات حەزیان تەنها لەسەر خۆشییەکانی ژیان بێت، خەڵکی ڕوو دەکاتەوە لە ڕەوشت و ئاکاری جوان، هێز و توانای خەڵکی بۆ خۆی دەبات لە ڕێگای بانقەکانییەوە خەڵکی قەرزار دەکات و سوو و سەلەمیان لێ وەردەگرێت و بە خوێنی خەڵکیی دەژی، لەسەر ژیانی خەڵکی خۆیان دەوڵەمەند دەکەن وەکو وتمان لە ڕێگای بانقە ڕیباوییەکانی و کۆمپانیا زەبەلاحەکانییەوە.

ئافرەتان بەکار دەهێنن بۆ ڕیکلامی کاڵاکانیان، ڕەوشت هیچ بەهاو نرخی نییە، هەرچی حەزی مرۆڤ بێت و پارەی لێوە سەرچاوە بگرێت گرنگی بەوە دەدات، مەبەست تەنها کۆکردنەوەی سامانە، قاروون خوای گەورە کە نازناوی (بغرا)ی پێبەخشیووە واتا لە سنووری خۆی تێپەڕی کردووە، جا کە دەست نیشانی دەوڵەمەندیشی لەگەڵ دا کردووە هۆکاری پارەو سەروەت و سامانەکەیەتی کە لە سنووری خۆی دەرکردووە، دەست درێژی کردۆتە سەر موڵک و سامانی خەڵکی و بۆ خۆی کۆکردۆتەوە، خاوەنی پارەو سامانی ئەوەندە زۆر بووە کە بە خەڵکی بەهێز هەڵگیراوە، شانازی بە خۆیەوە کردووە، وای زانیووە زانستی زۆرە، بۆیە توانیویەتی ئەو سەروەت و سامانە کۆبکاتەوە مرۆڤیش کە زۆر دەوڵەمەند بوو ئیمانی لەگەڵ نەبوو وەکو قاروون ڕەفتار دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ﴿٧﴾﴾ العلق

واتە: نەخێر بە دڵنیایی مرۆڤ سنوور ئەبەزێنێ و خراپەکاری ئەکات و لە خۆی بایی ئەبێ﴿٦﴾ کاتێک کە خۆی ئەبینێ دەوڵەمەندەو سەروەت و سامانی زۆرەو پێویستی بە کەس نییە لە خۆی بایی ئەبێ﴿٧﴾

شانازی بە خۆیەوە دەکات دڵ خۆشە بەوەی کە هەیەتی وا دەزانێت لە دەستی نادات یاخود بەجێی ناهێڵێت، پێشتر چەندین گەل و خاوەن هێز کە زۆر لە قاروون بەهێزتر بوون لەناوچوون، وا قاروون و فیرعەونی دەسەڵاتدار خۆی و هامان و سەربازەکانیشی لەناوچوون کە زوڵم و زۆر و دزی کردن لە سامان و قووتی خەڵکی کۆتاییەکەی وەکو قاروونە و زەوی هەڵی دەلوشێت بۆ خۆی لەگەڵ خاوەنەکەیدا، تەنها ئەوەی دەمێنێتەوە چاکەو خواناسییە، کۆتایی مرۆڤ و هەموو دروستکراوەکان ئاوابوون و گەڕانەوەیە بۆلای پەروەردگار، کە خەڵکی ئەمانە بە چاوی خۆیان دەبینن ئینجا بەسەرسامییەوە تێدەگەن کە کۆتایی هەموو کەسێک خاکە و کاتێک

سەرگوزەشتەیان دەخوێنیتەوە سوپاسی خوا دەکەین کە وەکو ئەوانمان لێنەهاتووە، هەروەکو چۆن سەرەتا خەڵکی بە سەرسامی و حەز و ئاواتیان دەخواست بۆ سەروەت و سامان و ژیانی قاروون کە خوای گەورە لە ناوی برد بەهەمانشێوە بەسەرسامییەوە سوپاسی خوایان دەکرد کە وەکو ئەو نەبوون، ئەمەش هەواڵ و چیرۆکێک نییە کۆتایی پێهاتبێت، قاروونەکان و فیرعەونەکان دووبارە دەبنەوە بۆ خەڵکی، بەڵام خەڵکی خواناس و باوەڕ پاک و خاوەن ئەقڵ هەستی پێدەکات، نموونە زۆرە لەوانە (جەنگیزخان، هۆلاکۆ، ئەتاتورک، هیتلەر، ڕەزا شای ئێران، صەدام، حوسنی موبارەک، بوعەلی و...هتد) هەزارانی تر کە لەسەر خوێن و ماڵوسامانی خەڵکی ڕەشوڕووت دەژیان کوان کۆتاییان چی بوو؟

خوای گەورە هەمیشە بە خراپ و زەمکراوی باسیان دەکات ئەوانەی وەکو قاروون و فیرعەون و هامانن یان وەکو گەلانی خراپەکار و گەندەڵن، دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَقَٰرُونَ فَقَالُواْ سَٰحِرٞ كَذَّابٞ﴿٢٤﴾﴾غافر

واتە: بە دڵنیایی ئێمە بە کۆمەڵێک موعجیزەو بەڵگەی ڕوون و ئاشکراوە مووسامان نارد﴿٢٣﴾ بۆ لای فیرعەون و (هامان) کە وەزیری فیرعەون بوو، بۆ لای (قاروون) کە دەوڵەمەندترین کەسی سەردەمی خۆی بوو، وە ئامۆزای مووسا بوو ئەمان وتیان: مووسا جادووگەرەو زۆر درۆزنە﴿٢٤﴾.

هەروەها خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَقَٰرُونَ وَفِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَۖ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾ فَكُلًّا أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبٗا وَمِنۡهُم مَّنۡ أَخَذَتۡهُ ٱلصَّيۡحَةُ وَمِنۡهُم مَّنۡ خَسَفۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ وَمِنۡهُم مَّنۡ أَغۡرَقۡنَاۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ﴿٤٠﴾﴾ العنكبوت

واتە: (قاروون) بەو هەموو سەروەت و سامانە زۆرەیەوە و فیرعەون بەو هەموو دەسەڵات و سەربازە زۆرەیەوە و (هامان)یش کە وەزیر و ڕاوێژکاری فیرعەون بوو، خوای گەورە هەمووی لەناوبردن بەدڵنیایی مووسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکراو موعجیزەوە هات بۆ ناویان، بەڵام ئەوان خۆیان بەگەورە زانی لەسەر زەویداو عیبادەتی خوایان نەکرد ئەمانیش پێش ئێمە نەکەوتن و ڕزگاریان نەبوو لە سزای خوای گەورە﴿٣٩﴾ هەموو ئەمانە بەهۆی تاوانی خۆیانەوە خوای گەورە بردیانیەوەو لەناوی بردن و سزاکەیان گونجاو بوو لەگەڵ تاوانەکەیانداو سزای جۆراوجۆری دان بۆ دەرکەوتنی تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە، هەیانبووە بەردبارانمان کردوون وەکو قەومی لوط عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ هەبووە دەنگێک لە ئاسمانەوە هاتووەو بە دەنگ لەناوی بردوون

وەکو قەومی (ثمود) چونکە دەنگیان بەکارهێنا بۆ سەربڕینی وشترەکە خوای گەورە دەنگیانی بڕی، هەیشبووە خوای گەورە بە ناخی زەویدا بردۆنێتیە خوارەوە وەکو (قاروون)، چونکە بەشانازیەوە بەسەر زەویدا دەگەڕا هەیشبووە خوای گەورە بە ئاو غەرقی کردوون وەکو قەومی نوح عَلَيْهِ السَّلَامُ و فیرعەون خوای گەورە زوڵم و ستەمی لە کەسیان نەکردووە بەڵکو ئەوان خۆیان زوڵم و ستەمیان لە خۆیان ئەکردو ئیمانیان نەئەهێنا﴿٤٠﴾

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە فەرموودەیەکیدا دەفەرموێت: هەرکەس پارێزگاری لە نوێژکردن و زیکرەکان بکات، ئەوا نوورە و بەڵگەیە بۆ ڕزگار بوونی لە ڕۆژی قیامەت دا، ئەوانەشی کە نوێژ و زیکرەکان ناکەن نە نووریان هەیە و نە بەڵگەی ڕزگاربوونیان هەیە لە ڕۆژی قیامەت دا، لەو ڕۆژەدا لەگەڵ قاروون و فیرعەون و هامان و ئوبەی کوڕی خەڵەف حەشر دەکرێن و وەکو ئەوانن.[١٩]

خوای گەورە پەنامان بدات لە پارەی حەرام و ماڵوسەروەتی خەڵکی ڕەشوڕووت، پاشان لەگەڵ پیاوچاکان و پێغەمبەراندا لە ڕۆژی قیامەت کۆمان بکاتەوە.

## پەڕینەوە لە دەریای سوور

لەدوای لەناوچوونی فیرعەون وڵاتی میسر تووشی قەیرانێکی زۆر گەورە بوەوە، ماوەی ساڵانێکی زۆر لە پارچە پارچەیی دا دەژیان تا سەرلەنوێ سیستەمی فیرعەونی بۆ گەڕایەوە.

ئەوەی سەرنجی نووسەری ڕاکێشاوە لەم باسەدا لەدوای لەناوچوونی فیرعەون و سوپا گەورەکەی گەلی ئیسرائیل بیریان لە گەڕانەوە نەدەکردەوە بۆ وڵاتی میسر، ئەمەش لە قورئان دا یان لە کتێبی پیرۆز دا ئاماژەی پێ نەکراوە، بە بۆچوونی نووسەر لە دوو حاڵەت بەدەر نییە، واقیعی یەکەم: ئەوەیە کە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لە ڕێگای ئیماندارەکانی بنەماڵەی فیرعەونەوە زانیویەتی کە ئەوان دەسەڵاتی وڵاتی میسریان گرتۆتەوە دەست، بۆیە لای گرنگ بووە بۆ ناوچەی شام و میزۆپۆتامیا زیاتر بانگەواز بکات، چونکە بە گوێرەی قۆناغەکانی مێژوو شارستانیەتەکان لە میزۆپۆتامیا و فینیقییەکان و وڵاتی پارسیا بەرەو بەهێز بوون و گەورە بوون دەڕۆشتن تاکو وڵاتی میسر و شارستانییەتەکەی، بۆیە جەنابیان هەموو پێغەمبەرانی گەلی ئیسرائیل زیاتر چاویان لەسەر ئەو سێ جێگایەدا بوو، لەگەڵ مانەوەیان بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ

---

[١٩] عبدالله بن عمرو عب النبي صلى الله عليه وسلم: أنَّهُ : ذَكَرَ الصَّلاةَ يومًا فقالَ : من حافظَ علَيها كانت لَهُ نورًا وبرهانًا ونَجاةً يومَ القيامة ، ومن لم يحافظ عليها لم يَكُن لَهُ نورٌ ، ولا برهانٌ، ولا نجاةٌ ، وَكانَ يومَ القيامة معَ قارونَ ، وفرعونَ ، وَهامانَ ، وأُبَيِّ بنِ خلفٍ/رواه أحمد في المسند رقم (٦٥٧٧)، كما رواه وابن حبان (١٤٦٧) و الطبراني (١٤/١٢٧).

لەخاکی (سیناء) دا کە لە ئێستادا سەر بە وڵاتی میسرە، بەڵام لەسەردەمی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ جوگرافیاکەی لەسەر هیچ وڵاتێک نەبووە و خاکێکی بیابانی بووە و لەهەندێک ناوچەشدا شاخاوی، دوای ئەوە بەرەو ناوچەی (جلعاد) لە ئەردەن ڕۆشتووە و پاشان مووسا پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ لەو ناوچەیەدا ماوەتەوە تا کۆچی دوایی کردووە، کە دواتر بە درێژی باسی دەکەین.

لەدوای وەفاتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ گەلی ئیسرائیل چوونەتە خاکی قودس و دوای ئەوە بەرەو ناوچەی شام بە گشتی و میزۆپۆتامیا و خاکی پارسیا و هندستان ڕۆشتوون، هەندێک لەو وڵاتانەیان خستۆتەوە ژێر ڕکێفی خۆیان هەندێکیان تەنها بانگەوازیان تێداکردووە و هەندێکی تریش لە وڵاتەکان وەزیریان تێیدا هەبووە، نموونەی حوکم کردنی شام لە ئەردەنی ئێستاوە تا فەڵەستین و (سیناء)، ئەو جێگایانەی وەزیریان تێدا هەبووە وەکو بابل و ئاشور، نەینەوا و ...هتد، بۆ بانگەوازیش چوونەتە وڵاتی پارسیا و هندستانەوە.

ئەم سەرچاوە مێژووییە لە مێژووی دێرینی کۆن و مێژووی میزۆپۆتامیا و کتێبی پیرۆزەوە سەرچاوەی گرتووە، نەک لە قورئان و سوننەتەوە!

واقیعی دووەم: فەرمانی خوایی بووە کە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ جێبەجێی کردووە و حیکمەتێکی تێدا بووە کە نەگەڕێنەوە خاکی میسر و بەرەو شام و وڵاتی ڕافیدەین و پارسیا بڕۆن، حیکمەتەکەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە خوای گەورە پێغەمبەری تری بۆ ئەو ناوچەیە ناردبێت، بێجگە پێغەمبەرانێکی تر کە ناوەکانیان بۆ ئێمە ئاشکرا نەبووە. لەدوای ڕزگاربوونیان لە دەستی فیرعەون، قورئان ڕووداوەکان بۆ ئێمە ڕوون دەکاتەوە و تاڕادەیەکی زۆر ئەو بۆچوونەی نووسەر ٥٠٪ پشت ڕاست دەکاتەوە، بەڵام ٥٠٪کەی تری هەر بۆچوونی نووسەرە، بەڵام لەبەر ڕۆشنایی مێژووی کۆن و کتێبی پیرۆز، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ﴿١٣٦﴾ وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۖ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلۡحُسۡنَىٰ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُواْۖ وَدَمَّرۡنَا مَا كَانَ يَصۡنَعُ فِرۡعَوۡنُ وَقَوۡمُهُۥ وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ ﴿١٣٧﴾ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِيكُمۡ إِلَٰهٗا وَهُوَ فَضَّلَكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ﴿١٤٠﴾ وَإِذۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُقَتِّلُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ﴿١٤١﴾﴾ الأعراف

واتە: کاتێک کە بەڵێن و پەیمانەکەیان شکاند تۆڵەمان لێ سەندن و لەناو دەریاکە نغرۆمان کردن لەبەر ئەوەی ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانی و بێئاگابوون لێی﴿١٣٦﴾ بەنی ئیسرائیل کە پێشتر ئەچەوسێنرانەوەو کرابوون بە خزمەتکاری فیرعەون لە ڕۆژهەڵاتی زەوی و لە ڕۆژئاوادا کە بەرەکەتمان تێی کرد مەبەست (بيت المقدس)ە لە فەڵەستین، فیرعەون و ئەوانمان لەناوبردو ئەمانمان کرد بە جێنشین، وشەی خوای گەورە جێبەجێ بووە بەسەر بەنی ئیسرائیلدا کە خوای گەورە فەرمووی: ئەبێ لاوازەکان بکەینە جێنشین، بەهۆی ئارام گرتنیانەوە کە ئارامیان گرت لەسەر ئەو شتانە ئەوەی کە فیرعەون و داروودەستەو شوێنکەوتووانی ئەیان کرد و ئەو خانوو باخ و باخاتانەی کە دروستیان ئەکرد هەموویمان تێکدا﴿١٣٧﴾ بەنی ئیسرائیلمان لەدەریاکە پەڕاندەوە دوای ئەوەی کە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ گۆچانەکەی دا بەناو ئاوەکەدا دوانزە ڕێگای وشکی لێ کرایەوە بە ئیزنی خوای گەورە، لەوێ تێپەڕین بەسەر کەسانێکدا کە بتیان هەبوو کە پەیکەر بوو لەسەر شێوەی مانگاو گوێرەکە بوو ئەیان پەرستن و لەسەریان ئەمانەوە، ئەمانەی کە ئەم موعجیزە گەورەیان بینی کە خوای گەورە دەریاکەی بۆ لەت کردن وتیان: ئەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ تۆیش خوایەک بۆ ئێمە بڕیار بدەو بتێکمان بۆ دابنێ لەسەر شێوەی گوێرەکەیەک هەروەکو چۆن ئەو قەومە بتیان هەیەو ئەیپەرستن، با ئێمەش بیپەرستین، مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: بەڕاستی ئێوە قەومێکی زۆر نەزان و نەفامن لە دوای ئەو هەموو موعجیزە گەورانە داوای ئەوە ئەکەن کە گوێرەکەیەک بپەرستن﴿١٣٨﴾[20] ئەم کەسانە کە ئەو بتانە ئەپەرستن ئەمانە هەموویان تووشی لەناوچوون ئەبن و تیا ئەچن بەهۆی ئەو کردەوە خراپەی کە ئەیکەن کە پەرستنی بتە﴿١٣٩﴾ مووسا فەرمووی: ئایا جگە لە خوای گەورە ئێوە داوای خوایەکی تر ئەکەن کە بیپەرستن لە کاتێک ئەو هەموو موعجیزە گەورەتان بینی خوای گەورە فەزڵی ئێوەی داوە بەسەر هەموو جیهاندا لە کاتی خۆیاندا و دوژمنەکەتانی لەناوبرد﴿١٤٠﴾ خوای گەورە ئەفەرمووێ: ئێوەمان ڕزگار کرد لە دەستی فیرعەون کە سەختترین سزایان بە ئێوە ئەچەشت، تا لەگەڵ سزاکاندا ڕاهاتبوون کە کوڕانتانیان بە خراپترین شێواز ئەکوشت ئافرەتانیان ئەهێشتەوە بۆ خزمەتکاری، ئەم ڕزگار کردنە کە خوا ڕزگاری کردن تاقیکردنەوەیەکی گەورەیە خوای گەورە ئێوەی پێ تاقی ئەکاتەوە تا چەندێ شوکرانەبژێری خوای گەورە ئەکەن﴿١٤١﴾

---

[20] پێغەمبەری خواش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە غەزای (حونەین) دا بەلای هەندێك داردا تێپەڕی کە موشریکان داریان هەبوو شمشێرەکانیان پیادا هەڵئەواسی، ئەمانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ تۆیش دارێك بۆ ئێمە دابنێ و بڕیار بدە کە شمشێری پێدا هەڵواسین بۆ ئەوەی لە جەنگەکاندا سەر بکەوین، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ الله أكبری کردو فەرمووی: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە بەنو ئیسرائیل چییان بە موساعلیه السلام-ی وت: ئێوەش واتان بە من وت، پاشان ئەو ئایەتەی بۆ خوێندنەوە.

خوای پەروەردگار دوو بەراووردمان بۆ دەکات لەنێوان ڕابردووی گەلی ئیسرائیل و داهاتوویان لەدوای نغرۆ بوونی فیرعەون لە دەریای سووردا، پاشان دەسەڵاتی پێدەبەخشین لەو جێگایانەی پێشتر لاواز و بێدەسەڵات بوون، ئەم بەراوردە بۆ ژیانی گەلی ئیسرائیلە کە لە (٣٥) ئایەتی سورەتی (الأعراف)دا کۆکراوەتەوە، واتا لە ئایەتی (١٣٦-١٧١)، ئەوەی سەرنجی من (نووسەر) ڕاکێشام لەم باسەدا کە تەماشای کتێبی پیرۆز بەشی تەوراتم کرد هەر هەمان باسە، بەڵام قورئان زۆر بە درێژی لە (٣٥) ئایەت دا باسی کردووە، بەڵام لە تەورات دا سێ بەشی تایبەت کە (خروج)ەوە دەست پێدەکات بۆ (لاويين) و (تثنية) و (يشوع) کۆتایی دێت! پاراوی قورئان کە ١٠٠٪ وەحییە و دەستی مرۆڤی تێدا نییە بەکەمترین وشە زۆرترین مێژووی گەلی ئیسرائیلی باس کردووە، بەڵام لە تەورات کە کتێبی ئاسمانییە و دەستکاری کراوە ڕۆحی وەحییەکە تێک دراوە، زیاتر لە (١٥٠) لاپەڕەی بۆ تەرخان کراوە ئەو سێ بەشە، لێرەدا باسەکە دەگەڕێنینەوە بۆ ناو قووڵایی مێژوو لە ژێر ڕۆشنایی قورئانی پیرۆزدا وەکو سەرچاوەی سەرەکی هەڵبەت وابەستە بە سوننەتی پێغەمبەرەوە و سەرچاوەکانی تر لە مێژوو.

لەدوای بەراوردی ژیانی گەلی ئیسرائیل، بەڵام مووسا و هاروون تووشی قورستر لە ململانێی فیرعەون بوونەوە، ئەویش نەفسی و سایکۆلۆژی گەلی ئیسرائیلە.

چارەسەرکردنی سرووشتی گەلی ئیسرائیل قورسترین کار بوو کە ڕووبەڕووی حەزرەتی مووسا بوویەوە، چونکە ماوەیەکی زۆر دوور و درێژە گەلی ئیسرائیل لە میسر دەژیان، ئەم حاڵەتەش وای کردبوو لە گەلی ئیسرائیل کە لە تاو ترس و زۆرداری فیرعەون و لاوازی خۆیان و گەردن کەچییان بۆ زوڵم و زۆرداری فیرعەون و دارودەستەکەی و گەلی قیبطی و لەسایەی ترس و تۆقاندن دا جیل لەدوای جیل پەروەردە بوبوون، ماوەیەکی زۆر درێژخایەن لەو سرووشتی ترس و تۆقاندن و زوڵم و زۆرداریدا ژیاون. لەسەروو هەموویانەوە ماوەیەکی یەکجار دوور و درێژ لەناو بتپەرستی فیرعەون پەرستی خودی فیرعەونەکاندا ژیاون، گەلی ئیسرائیل ترسنۆکی لەناو مێشک و دڵودەروونیاندا ڕەگی داکوتی بوو، لە کاتێکدا دوو پێغەمبەر لەناویاندا خەریکی چاکسازی دڵودەروونیان بوون. گەلی ئیسرائیل لە ژێردەسەڵاتی فیرعەون دا پیاوانیان کوژراوەو ئافرەتانیان براوە و وای کردووە ئەو گەلە زۆر زەلیل بن لە سایەی سیستەمی فیرعەونیدا گاڵتەیان پێکراوە و ترسوتۆقاندن ڕوویداوە ئەمەش وایکردووە کە جەبان و ترسنۆک بن، کە ئەم حاڵەتانە ڕوویدا لەنەفسی مرۆڤ دا سرووشتی وا هەڵدەکەوێت کە ڕزگار بوو ترسنۆک و ڕەق و دڵ پڕ کینە و ئیرەیی بەرەو ئەوەی دەبات کە بڕوای بۆ دروست نەبێت و حەز بە شتە مادییەکان بکات تا پەنهانییەکان، بە گشتی گەلی ئیسرائیل بوبوونە گەلێکی ماددە پەرست حەزیان بە بینراو و بیستراو و شتە هەستەکان دەکرد تا دڵنیایان بکاتەوە لە حەق و ڕاستی.

ئەمەش بۆ حەزرەتی مووسا و هاروون زۆر قورس بوو کە لەسەر حاڵەتی نەفسی گەلی ئیسرائیل کاریان دەکرد، ئەو پرسە گرنگە خرا بووە ئەستۆیان لەلایەن خوای پەروەردگارەوە.

بەڕاستی شێتییەو کاڵفامییە حەزرەتی مووسا عَلَيهِ السَّلَام دەریای بۆ کردوون بە دوو بەش، ئاوی دەریاکە وەکو شاخ بەرز بۆتەوە وشکانی بۆ دروست کردوون بە سەلامەتی و هێمنی و ئارامی پەڕیونەتەوە کە دەچنە ناو دێیەک یان ئاوەدانیەکەوە دەبینن ئەو خەڵکە پت پەرستەو سوجدەو بەندایەتی بۆ بت و پەیکەر دەکەن، داوای خوایەک لە مووسا عَلَيهِ السَّلَام دەکەن کە وەکو ئەو خەڵکە بیپەرستن، ئەمەش ئەوپەڕی جەهل و نەفامی ئەو گەلە دەردەخات لە کاتێکدا پێغەمبەر و سەرۆکەکەیان حەزرەتی مووسا لێیان توڕە دەبێت و توڕەیی لە پێناوی خوادا پێیان دەڵێت بەڕاستی ئێوە جاهیلن، جا لێرەدا جەهالەت لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیان بەو واتایە دێت کە دژی زانین و زانستن، جاهیلن بە واتای گەمژەییەک کە دژی ئەقڵ و وریاییە، چونکە جەهالەتیان زۆر لە سنوور دەرچووە لەگەڵ دوو پێغەمبەر لانی کەم، چونکە دەشێت پێغەمبەری تریشیان لەگەڵ بووبێت وەکو نموونەی یوشەعی کوڕی نون... هتد.

لێرەدا ئینحراف و دەرچوون نییە لە بیروباوەڕ، بەڵکو نەزانی و گەمژەیی زۆر سەختە بۆ ئەو گەلە، چونکە ئەگەر خاوەن زانست و ئەقڵ ئەگەڕێن بەدوای یاساکانی ئەم گەردوونە و نەوامیسەکانی ئەدۆزنەوە و دڵنیایی ئەداتە خاوەنەکەی لە بەڕێوەبردنی ئەم گەردوونە لەلایەن خوای پەروەدگاری دروستکاری بوون.

حەزرەتی مووسا عَلَيهِ السَّلَام بۆیان شیدەکاتەوە و ئامۆژگارییان دەکات و دەفەرموێت: کە ئەو هۆزە کارێکی قێزەون دەکەن کە هاوبەش بۆ خوای گەورە ئەنجام ئەدەن لە ڕووی پەرستنەوە ئەوان ڕۆچوون و گەندەڵن کەچی ئەتانەوێت چاو لەوان بکەن، ئەوەی ئەو گەلە ئەنجامی ئەدەن باطڵ و نادروستە و ناپەسەندە کۆتاییەکەی بە هەلاکەت چوونە.

حەزرەتی مووسا بەسەر سوڕمانەوە پێیان دەڵێت توڕەیە لەدەستیان بیریان دەخاتەوە کە خوای گەورە ئەو هەموو نیعمەتەی پێبەخشیون داوای هاوبەش دەکەن، هەڵیبژاردوون لەم جیهانەدا کە گەیەنەری پەیامی خوای گەورە بن، ئەویش یەکتاپەرستییە، هەڵیبژادوون بە واتای ئەوەی کە فەزڵی چاکەی خوای گەورە بەسەرتانەوەیە و منەتی ئەوەتان بەسەرەوەیە خوای گەورە ڕزگاری کردوون و پێغەمبەری بۆ ناردوون، کەچی داوا لە پێغەمبەرەکەتان دەکەن خوایەکی ترتان بۆ دابتاشێت لە پەیکەر و بت، لە کاتێکدا ئێوە لەو فەزڵ و چاکەیەدان کە خوا پێی بەخشیون ئەو فەزڵە بۆ هەر کەسێکە کە شوێنکەوتووی یەکتاپەرستی بێت جا گەلی ئیسرائیل بێت یان هەر گەلێکی تر بێت، بێجگە ئەوان واتا فەزڵەکە لەگەڵ منەتەکە ناگەڕێتەوە بۆ گەلەکە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ پەیامەکە.

ئینجا بیریان دەخاتەوە بەوەی خوای گەورە ڕزگاری کردن لە سزاو ئەشکەنجەی فیرعەون و داروودەستەکەی، ئەویش کوشتنی پیاوانیان و بردنی ئافرەتەکانیان بوو، پێشتر ئیبتلا بوبوون بە ئەشکەنجە، بەڵام ئێستا بە خۆشی و ڕزگاری کە هەموو دەگەڕێتەوە بۆ جەهالەتی گەلی ئیسرائیل.[٢١]

## بینینی خوا لەسەر داوای مووسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ

قۆناغی دوای ڕزگار بوونی گەلی ئیسرائیل لەدەستی فیرعەون قۆناغێکی زۆر سەختە بۆ حەزرەتی مووسا، مامەڵە کردن لەگەڵ ئەو گەلە ڕێنمایی خوایی دەوێت، هەروەها مانەوەیان لەو سەحرا و بیابانەدا پێویستی بە ڕێنمایی خوای موتەعالە. ئەمەش کاری شەو و ڕۆژێک نییە، خوای گەورە دەتوانێت لە (کن فیکون)نێکدا هەموو شتێک چارەسەر بکات، بەڵام خوای گەورە گەلی ئیسرائیلی بە مرۆڤ دروست کردووە نەیکردونەتە (ڕۆبۆت) تا پرۆگرامێرەی بکات، بەڵکو ئەم گەردوونە بە یاسا و ڕێسای خوای گەورە دەڕوات بە ڕێکاوە، کەواتە مرۆڤیش بە دەر نییە لەم دروستکراوانەی ئەم گەردوونە پێویستی بە بەرنامە و پرۆگرام هەیە، بینیمان چۆن گەلی ئیسرائیل لەکاتی پەرستنی بتێکدا لەناوچەیەکدا چوونەلای پێغەمبەرەکەیان و داوای بت و خوای داتاشراویان لێی کرد، بۆیە ئەم گەلە جارێ ئامادە نییە بۆ هەڵگرتنی کۆڵە قورسەکە کە پەیامی خوایە و تەوحیدە، پاشان دامەزراندنی خیلافەتە لەسەر زەویدا، هەر بۆیە خوای موتەعال مووسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ-ی ئاگادار دەکاتەوە کە بۆ پەیوەندی ئاسمانی خۆی ئامادە بکات کە ماوەی ٣٠ شەوە، ئەگەر کۆتایی نەهات پەیوەندی و پەیامەکە بۆ گەلی ئیسرائیل، ئەوا دە شەوی تری دەچێتە سەر کە هەمووی چل شەو دەکات، خوای موتەعال دەفەرموێت:

﴿۞ وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗۚ وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٤٣﴾ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾

---

(٢١) لەمێژووی پێغەمبەرانی ئین کەثیردا هاتووە کە بەرەو شام ڕۆشتن، ئەو ئاوەدانییەیان بینی چوونە ناوی بتپەرست بوون، بتەکەیان لە شێوەی مانگادا بوو، بۆیە جاهیلەکانیان چوون داوای ئەو بتەیان کرد لە حەزرەتی موسا علیه السلام، ئەویش بە سەرسامییەوە فەرمووی: خوای گەورە هەڵیبژاردوون و فەزڵی داون بەسەر جیهاندا، هەڵبەت لەو سەردەمەدا. ئەمەش لە کتێبی ژیانی پێغەمبەران بە تەحقیقی عەبدولقادر ئەرنەئوطی دا هاتووە:

وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِي ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَيْءٍ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُواْ بِأَحْسَنِهَا ۚ سَأُوْرِيكُمْ دَارَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴿١٤٥﴾ سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوْاْ سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا وَإِن يَرَوْاْ سَبِيلَ ٱلْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنْهَا غَٰفِلِينَ﴿١٤٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴿١٤٧﴾﴾ الأعراف

واتە: خوای گەورە بەڵێنی بە مووسا دا کە سی شەو بێتە سەر کێوی (طور) لەوێ قسەی لەگەڵدا دەکات، پاشان خوای گەورە دە ڕۆژی تری زیاد کرد بوو بە چل، مەوعیدی خوای گەورە بوو بە چل شەوی تەواو مووسا بەهاروونی برای فەرموو ببە جێنشینی من لەناو بەنی ئیسرائیلدا لەناو ئەو قەومەدا و چاکسازی بکە لەناویانداو کاروباریان بەڕێوەبەرە، بەڵام شوێنی ڕێبازو ڕێچکەی ئاشووبگێڕان و خراپەکاران نەکەوی﴿١٤٢﴾ کاتێک کە مووسا هات بۆ مەوعیدی دیاریکراوی لەگەڵ خوای گەورە بۆ ئەوەی خوای گەورە قسەی لەگەڵ بکات، پەروەردگار قسەی لەگەڵ مووسادا کرد بەبێ واسیتە، مووسا قسەی خوای گەورەی بیست، کاتێک کە مووسا گوێی لە قسەی خوای گەورە بوو ئەمجا تامەزرۆی بینینی خوای گەورە بوو، بۆیە فەرمووی: ئەی پەروەردگار ڕێگام بدە با بتبینم خوای گەورە فەرمووی: ئەی مووسا لە دونیادا تۆ ناتوانی من ببینی خوای گەورە فەرمووی: بەڵام تەماشای ئەو شاخە بکە ئەگەر لە جێی خۆیدا مایەوە ئەوە تۆیش ئەتوانی من ببینی، کاتێک کە پەروەردگار خۆی دەرخست بۆ شاخەکە، شاخەکە وردو خاش بوو، بوو بە خۆڵ مووسا لەهۆش خۆی چوو، کاتێک هاتەوە هۆش خۆی وتی: ئەی پەروەردگار پاک و مونەززەهی بۆ تۆ لەوەی کە داوا بکەم لە دونیادا تۆ ببینم من تەوبە ئەکەم و بۆ لای تۆ ئەگەڕێمەوەو جارێکی تر داوای بینینی تۆ ناکەم لە دونیادا، من یەکەم باوەڕدارم لە بەنی ئیسرائیلدا، یان من یەکەم باوەڕدارم لەسەر ئەوەی کە کەس تا ڕۆژی قیامەت لە دونیادا ناتبینێت﴿١٤٣﴾ خوای گەورە فەرمووی: ئەی مووساعَلَيْهِ السَّلَامُ من تۆم هەڵبژاردووە بەسەر خەڵکی سەردەمی خۆتدا بەوەی کە پەیامی خۆم بۆت ناردووە، ڕاستەوخۆ قسەم لەگەڵدا کردووی بەبێ واسیتە، ئەوەی کە پێم بەخشیویت بەجوانی وەری بگرە، لەو کەسانە بە کە شوکرانە بژێری خوای گەورە ئەکەن لەسەر ئەم نیعمەتانە﴿١٤٤﴾ لەو لەوحانەدا لە تەوراتدا هەموو شتێکمان بۆ نووسیوە لەوەی کە پێویستی بێ لەگەڵ بەنی ئیسرائیل بۆ دین و دونیایان کە پڕ بووە لە پەندو ئامۆژگاری و بەدرێژی ئەحکامەکانی تیا باسکراوە بۆ هەموو شتێ بەهێزو بەجوانی و بەجددی وەری بگرەو کاری پێ بکە فەرمان بکە بە نەتەوەکەت کامەی کە ئەجرو پاداشتی زیاترو چاکترە ئەوانە لە پێشتر وەربگرن شوێنی کافرانیشتان پێ نیشان ئەدەم کە چۆن خوای گەورە لەناوی بردوون بەهۆی کوفریانەوە﴿١٤٥﴾ ئەو کەسانەی کە لەسەر زەویدا بەناحەق خۆیان بەگەورە زانیوە

قەدەغەی ئەوەیان لێ ئەکەم کە لە ئایەتەکانی من تێبگەن، ئەگەر هەموو ئایەت و نیشانەیەک بەڕوونی و ئاشکراش ببینن ئیمانی پێ ناهێنن ئەگەر ڕێگای ڕاست و ڕزگاریش ببینن نایگرنەبەرو نایکەنە ڕێگای خۆیان، ئەگەر ڕێگای چەوت و خراپە ببینن ئەوە ئەکەن بەڕێگای خۆیان و ئەیگرنە بەر چونکە ئەوان ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆزانی و ئەوان بێ ئاگابوون لێی﴿١٤٦﴾ ئەو کەسانەی کە ئایەتەکانی ئێمە و ڕووبەڕووبوونەوەی ڕۆژی قیامەتیان بەدرۆزانی و باوەڕیان پێی نەکرد ئا ئەمانە کردەوەکانیان بەتاڵ ئەبێتەوە ئایا چاوەڕێی چ شتێکن و چ سزایەکیان ئەدرێتەوە تەنها کردەوەی خۆیان نەبێ واتە: خوای گەورە ستەمیان لێ ناکات﴿١٤٧﴾

پێشتر ئاماژەمان بەوەدا کە هاروون پێغەمبەرە لە ڕێگای مووساوە وەحی بۆ دێت، مووساش ڕاستەخۆ وەحی لەخوای موتەعال وەردەگرێت، بۆیە هاروونی دانا بەسەر گەلەکەیەوە تا ئاگاداریان بێت لە هەر هەڵە و پەڵەیەکی نەخوازراو کە تووشیان بێت، هاروون سرووشتی وا دەردەکەوێت کەسێکی زۆر ئارام و لەسەرخۆ بووە سۆز و نەستی بۆ گەلی ئیسرائیل لە ڕادەبەدەر بوو، حەزی زۆری یەکخستن و سەرکەوتنی گەلەکەی کردووە، چونکە بەدرێژایی مێژوو فیرعەون ئەم گەلە لەژێر زوڵم و زۆری ئەو دەسەڵاتە دڕندەیە بووە.

مەبەستی میقات ئەو کاتەیە کە خوای گەورە بۆ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ-ی دانابوو کە هەموو مانگی (ذوالقعدة) و دە ڕۆژی مانگی (ذوالحجة)یە کە ڕۆژی قوربانی و حەجە لە ژیانی ئێستای موسڵماناندا.

حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ ڕاستەخۆ لەگەڵ خوای موتەعال دا گفتوگۆی دەکرد، ئەو دەنگە چۆنە و چییە و لەکوێوە هاتووە گومانی تێدانییە قسەکردن لەسەری زیادەڕۆیییە، ئێمەی مرۆڤ هیچی لێ نازانین ئەوەندەی کە زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعە پێیان ڕاگەیاندووین تەنها لایەقە بە خوای موتەعال و ئەو دەنگە پەیوەستە بە خواوە.

مەبەست لەم ڕۆشتنەش بۆ ئەو ژوانە خواییە کە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ-ی بۆ بانگێشت کرا بوو، فەرز بوونی بەندایەتی و دروشمەکانیان و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی گەلی ئیسرائیل بوو، جەژن و بۆنەو کامڵ کردنی ئایینەکەیان بوو، ئەم میقاتە پێناچێت جاری تر ڕوویدابێت [٢٢]

بۆ زیاتر شارەزا بوون لەم باسە دەکرێت بەراورد بکرێت بە ئیسراو میعراجی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، زانایانی تەفسیر دەڵێن: ئەم ژوانە لە نزیک دارێک ڕوویداوە یاخود ناونیشانی جێگاکە دارێک بووە، مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لەگەڵ خوای موتەعال وتووێژی کردبێ بێ هیچ

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٢]-(یەکەم جارو کۆتا جارە لەگەڵ موسا علیه السلام ڕوونەدات)، مەبەست لە یەکەم جار واتا بۆ ماوەی چل شەو، دەنا موسا ڕاستەخۆ لەگەڵ خوای پەروەردگاری گفتوگۆی کردووە.

نێوەندگیرێک، بەڵکو ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوای خالق و بارئو فاطری ئەم گەردوونە دا ئاخافت و ئەو پلەو پایە و شەرەفەی پێ بەخشراو ناسرا بە (کلیم الله)، هەروەکو ئاماژەمان پێدا لە چۆنیەتی ئەدائو چەندێتی و جۆری دەنگ، تۆنی دەنگ...هتد بکۆڵینەوە هیچی لێ دەست ناخرێت، چونکە ئێمەی مرۆڤ لەسەر دید و بۆچوونی خۆمان بڕیار ئەدەین، بیروبۆچوونی ئێمەش درک بەهیچ شتێکی خوایەتی ناکات و قسەکردن لەسەری هەڵەیەکی زۆر گەورە و پێ ڕاکێشانە بۆ کافر بوون و مولحیدی ئەسماء و سیفاتی خوای گەورە کەواتە لێرەدا دەوەستین.

لە ڕاستیدا چرکە ساتێکی زۆر گەورە و عەظیمە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ خوای موتەعال ڕاستەخۆ بێ نێوەندگیر واتا فریشتە ئاخافتنی لەگەڵدا دەکات، بەڵام لە پشتی پەردەوە واتا نادیار.

مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لەکاتی وتووێژی لەگەڵ خوادا خۆی لەبیر چووە کە کێیە واتا مەبەستم کە لە جنسی مرۆڤە، خۆشی ئەو دەنگە لەبیری کرد کە مرۆڤێکە لە سەر زەویدا، مرۆڤیش سرووشتی وایە کە دەنگێکی بیست حەزدەکات خاوەنەکەی ببینێت!

ئەم شەوق و موشتاق بوونەی بۆ خوای پەروەردگار پاڵنانی ڕەجاو داواکردنە لە بینینی خوا، لە خۆشەویستی و حەز و شاهید بوونی خۆیەوە دەرچوو، نەک لە گومان بەڵکو موشتاقی بینینی خوای پەروەردگار، مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی خوای پەروەردگار خۆتم نیشان ئەدەیت تا زاتی بەرز و پیرۆزت ببینم؟!

خوای موتەعال فەرمووی: ناتوانیت بم بینیت، خوای موتەعال سۆز و بەزەیی بۆ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ دەجوڵێت لە خودی پرسیارەکەی بۆیە بە شێوەی (لن تراني)... دەفەرموێت، چونکە چاوی مووسا و ئەم کیانی مرۆییە لە توانایدا نییە، هەربۆیە خوای موتەعال لە ڕووی کردارەوە بۆی دەسەلمێنێت لە توانای مەخلوقدا نییە بەم سیستەمەی ئێستا و یاسا و نەوامیسەکانی، فەرمووی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ تەماشای ئەو شاخە بکە ئەگەر توانی خۆی بگرێت لەبەردەرکەوتنی زاتی مندا ئەوا دەمبینیت، خوای موتەعال لەگەڵ لادانی پەردەی دەرکەوتنی شاخەکە بوو بە خۆڵ و تۆز لەگەڵ زەویدا تەخت بوو، مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ کە ئەو دیمەنەی بینی لە ترسان دا و پاشان لاوازی خۆی و مرۆڤی بۆ دەرکەوت و لەهۆش خۆی چوو لە ترسی ئەو دیمەنە بورایەوە.

کاتێک هۆشی هاتەوە بەخۆیدا زانی توانا و هێزی چەندە و هەستی بە لاوازی تەواوی خۆی کرد، فەرمووی پاکوبێگەردی بۆ خوای پەروەردگارم تۆبەی کرد و گەڕایەوە بۆلای خوا و ئیمانی کامڵ بوو، لە ئیماندارانی ڕاستەقینەبوو، بووە یەکەم ئیماندار لەسەردەمی خۆیدا. هەڵبژرادنی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بۆ ئەو کارە لەسەردەمی مووسا دەگەڕێتەوە لەناو خەڵکەکەیدا، ئەمەش هەمووی ڕەحمەتی خوای موتەعالە بەسەر حەزرەتی مووساوە.

ئەو نووسراوانەی كە دراوە بە حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لە ئێستادا نەماوە، بەڵام بە دڵنیاییەوە بریتی بووە لە دروشم و بەندایەتییەكان، ئیتر ئەوەی باس دەكرێت لە كتێبی پیرۆز و تەورات دا كە بریتییە لە دامەزراندنی خێمە كۆبوونەوە و جلوبەرگ و پاشان مناره و قوربانی كردن بۆ ئێمە هیچی جێگای بایەخ و بروا نییە، لەبەر ئەوە یەهود دەستكاری كتێبەكانیان كردووە، شیكاری قورئان بۆ ئێمە گرنگە لەگەڵ سوننەت لە بواری بیروباوەڕ، بەڵام لەبواری مێژوویدا ئاساییە لە ئیسرائیلیات وەربگرین.

بەدڵنیاییەوە نووسراوەكان هەموو ئاراستەی گرنگ و پەروەردەی جوانی گەلی ئیسرائیل بوون، بۆیە خوای پەروەردگار فەرمانی پێكرد كە بەهێز و توانا و ئیرادەی بەهێزەو بە سەرگەلەكەیدا بڵاوی بكاتەوە پیادەی بكەن. خوای گەورە هەرگیز شتی سەخت و بەندایەتی قورس نادات بەسەر بەندەكانیدا ئەمەش سرووشتی ئایینی خوایە، پرسێك دەنێرێت كە سرووشتی مرۆڤ توانای پیادەكردنی هەبێت.

خوای پەروەردگار لەكاتی پەڕینەوەی ئەگەر لە خواردنی ئامادەكراوی بۆ دەستەبەر كردن كە برسیان نەبێت، ئەویش جۆرێك لە گۆشتی باڵندە كە ناسراوە بە (سلوى) و بەجۆرێك لە شیرینی و وزەی زۆر بەسوود كە خۆراكێكی ترە لەسەر گەڵای دار پێبەخشین، كورد پێی دەڵێت (گەزۆ) لە قورئان دا بە (المن) ناوی هاتووە، لەبەر ئەوە خوای گەورە لە هەموو ڕوویەكەوە بەرانبەر بە بەندەكانی بەزەیی و میهرەبانی هەیە، چۆن بۆ ناردنی ئایین قورسی دەكات لەسەریان؟!

خوای پەروەردگار لە بیابانی (سیناء) لە نزیك كێوی (طور) گەلی ئیسرائیلی كۆكردەوە، مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بۆ موناجات لەگەڵ خوای خۆی سەركەوتبووە سەر شاخەكە، ڕووداوێك ڕوودەدات بێ ئەوەی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بزانێت.

## پەرستنی گوێرەكە لەلایەن گەلی ئیسرائیل

مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لە حزوری خوای موتەعالدایە خۆشحاڵە لەوپەڕی ژیانی خۆشی فریشتەیدا دەژی، لە پڕ خوای گەورە ئاگاداری دەكاتەوە بە سەرلێشێواوی گەلەكەی كە تووشی هاوبەش دانان بوون لەدوای ئەو هەموو نیعمەتە خوای موتەعال پێی بەخشین، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ قَدۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ عَدُوِّكُمۡ وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ ۝٨٠ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِيۖ وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي فَقَدۡ هَوَىٰ ۝٨١ وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ۝٨٢ ۞ وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ ۝٨٣ قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ لِتَرۡضَىٰ ۝٨٤ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا

قَوْمَكَ مِنۢ بَعْدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٥﴾ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْدًا حَسَنًا ۚ أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ ٱلْعَهْدُ أَمْ أَرَدتُّمْ أَن يَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِى ﴿٨٦﴾ قَالُوا۟ مَآ أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ فَقَذَفْنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٧﴾ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ فَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴿٨٩﴾ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ مِن قَبْلُ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِى وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓا۟ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى وَلَا بِرَأْسِىٓ ۖ إِنِّى خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِى ﴿٩٤﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِىُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا۟ بِهِۦ فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ فَنَبَذْتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى ﴿٩٦﴾ قَالَ فَٱذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ ۖ وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ ۖ وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا ۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ نَسْفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ﴿٩٨﴾﴾ طه

واتە: ئەی بەنی ئیسرائیل ئێوەمان ڕزگار کرد لە دوژمنەکەتان کە فیرعەون بوو بەڵێنیمان پێدان لەلای کێوی (طور) کە کۆمەڵێک لەگەڵ خۆیدا هەڵبژێرێ و بیانبات بۆ ئەوێ، لەوێ خوای گەورە قسەی لەگەڵ مووسادا کردو تەوراتی پێ بەخشی (الْمَنَّ) واتە: گەزۆی شیرینمان لە ئاسمانەوە بۆ دابەزاندن، وە (السَّلْوَى) سوێسکە، یاخود هەنگوینمان پێ بەخشین﴿٨٠﴾ بخۆن لەو خواردنە بەتام و چێژو حەڵاڵانەی کە پێمان بەخشیون بەڵام سنوور مەبەزێنن، یاخود کوفرانەبژێری نیعمەتی خوای گەورە نەکەن لەبەر ئەوەی سزای من دائەبەزێتە سەرتان هەر کەسێکیش تووڕە بوون و سزای منی بۆ جێبەجێ بێ ئەوە بەهیلاک ئەچێت و فڕێ ئەدرێتە شوێنی نزم کە قووڵایی دۆزەخە﴿٨١﴾ من زۆر لێخۆشبووم بۆ کەسێک کە تەوبە بکات لە تاوانەکانی ئیمان بێنێت و کردەوەی چاک بکات پاشان هیدایەت وەربگرێ، واتە: لەسەر ئەو ڕێگا ڕاستە کە ئیسلام و سوننەتە دامەزراو بێت تا مردن﴿٨٢﴾ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ پێش کاتی دیاریکراو ڕۆیشت تا قسە لەگەڵ خوای گەورەدا بکات و هاروونی برای بەجێهێشت لەناو بەنی ئیسرائیل، خوای گەورە فەرمووی: ئەی مووسا چی وای لێکردیت کە پەلە بکەیت پێش کاتی دیاریکراو بێیت و قەومەکەت جێ بێڵیت و لەگەڵ خۆتدا نەیانهێنی﴿٨٣﴾ وتی: ئەی پەروەردگار ئەوانیش لە من نزیکن و بە شوێن پێی من و بە دوای مندا دێن، خوایە من پەلەم کردو هاتم بۆ لای تۆ تا زیاتر

لێم ڕازی بیت﴿٨٤﴾ خوای گەورە فەرمووی: لە دوای تۆ ئێمە قەومەکەمان تاقیکردەوەو تووشی تاقیکردنەوە بوون (سامیری) گومڕای کردن کە گوێلکێکی بۆ دروست کردن لە ئاڵتوون و وای لێ کردن کە ئەم گوێلکە بپەرستن﴿٨٥﴾ مووسا عَلَيۡهِ السَّلَامُ گەڕایەوە بۆ لای قەومەکەی زۆر تووڕە بوو خەفەتی خوارد کە قەومەکەی لە دوای ئەم گوێلکیان پەرست (أسفًا) واتە: تووڕە بوونێکی زۆر سەخت و سەختتر لە غەزەب فەرمووی: ئەی قەومەکەم ئایا پەروەردگارتان بەڵێنێکی باشی پێنەداون بەدەستخستنی چاکەی دونیاو قیامەت و بە بەهەشت کە ئەگەر بەردەوام بن لەسەر عیبادەت و گوێڕایەڵی خوای گەورە ئایا ماوەو سەردەمەکە زۆری خایاندو لەبیرتان کرد؟ بەڵکو ئێوە بەم کارەتان ویستتان سزاو تووڕە بوونی خوای گەورە دابەزێتە سەرتان، بۆیە ئێوە وەعدە خیلافتان کردو لە بەڵێنەکەی خۆتان پاشگەز بوونەوە کە بەڵێنی لێ وەرگرتبوون بەردەوام بن لەسەر گوێڕایەڵی خوا، یاخود بەڵێنەکە ئەوە بووە کە بەدوای مووسادا بێن بۆ کێوی (طور)﴿٨٦﴾ وتیان: ئەی مووسا ئێمە وەعدە خیلاف نەبووینە و بەڵێنی خۆمان نەشکاندووە بە تواناو هەڵبژاردنی خۆمان بەڵکو ناچار بووینە کە ئەو هەڵەیە بکەین﴿٨٧﴾ (سامیری) گوێلکێکی بۆ دروست کردن لەو ئاڵتوونە کە ناوی بۆش کردبوو کە هەواو بایەکە لێی ئەدا دەنگی لێ دەرئەچوو وەکو دەنگی گوێلک چۆنە بەو شێوازە ئەیبۆڕاند،(سامیری) و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون وتیان :ئەمە خوای ئێوەو خوای مووسایشە بەڵام مووسا گومڕا بووە، یان نەیزانیوە کە ئەمە خوای ئێوەیە، یان لە بیری کرد بە ئێوە بڵێت ئەمە خوای ئێوەیە، ئەوانیش زۆر خۆشیان ویست و دەستیان کرد بەپەرستنی﴿٨٨﴾ خوای گەورە کەم عەقڵییان دەردەخات و دەفەرموێت: ئایا ئەوان بۆ پەندو عیبرەت وەرناگرن نابینن کە ئەم گوێلکە هیچ وەڵامێکیان ناداتەوەو قسەیان لەگەڵدا ناکات ئیتر ئەمە چۆن دەبێ خوا بێت هیچ زیان و سوودێکی ئەوانی بەدەست نییە نە لە دونیا نە لە قیامەت، بەڵکو سوودو زیان تەنها بەدەست خوای گەورەیە﴿٨٩﴾ پێش ئەوەی کە مووسا بگەڕێتەوە هاروونیش عَلَيۡهِ السَّلَامُ پێی وتن ئەی قەومەکەی خۆم ئەمە تاقیکردنەوەیەکەو کەوتوونەتە ناو تاقیکردنەوەو گومڕابوونەو لە ڕێی ڕاست لاتان داوە ئەم گوێلکە خوای ئێوە نییەو بەدڵنیایی پەروەردگاری ئێوە الله یە ڕەحمانە، ئێوە شوێن من بکەون و گوێڕایەڵی فەرمانی من بکەن و عیبادەتی خوا بکەن نەک عیبادەتی ئەو گوێلکە﴿٩٠﴾ وتیان: نەخێر ئێمە بەردەوام لەلای ئەمێنینەوە تا ئەو کاتەی کە مووسا ئەگەڕێتەوە بزانین ئایا مووسا ڕازیە بەمە یاخود نا ئەوکاتە وازی لێ دێنین﴿٩١﴾ کاتێک کە مووسا عَلَيۡهِ السَّلَامُ گەڕایەوەو بینی گوێلک دەپەرستن زۆر تورە بوو ئەو لەوحانەی کە تەوراتی تیا نوسرابوو دای بە زەویەکەداو قژو ڕیشی هاروونی ڕاکێشاو فەرمووی: ئەی هاروون چی ڕێگری لێکردیت کە بەرهەڵستیان بکەی کاتێک کە ئەبینی ئەوان گومڕا بوونەو دەستیان کردووە بە پەرستنی ئەو گوێلکە﴿٩٢﴾ بۆچی شوێنی من نەکەوتیت و خێرا

پێت نەوتم؟ ئایا تۆ سەرپێچی فەرمانی منت کرد و لای ئەمان مایتەوە کە گوێلک ئەپەرستن﴿٩٣﴾ هاروون فەرمووی: ئەی کوڕی دایکم ڕیش و سەرم ڕامەکێشە من لەوە ترسام کە ئەگەر جێیان بێڵم هەندێکیان لەگەڵ مندا بێن و هەندێکیان لێرە بمێننەوە تۆ بڵێی تەفرەقەو جیاوازی و پارچە پارچەیت خستە ناو بەنی ئیسرائیلەوە بڵێیت تۆ بە قسەی منت نەکرد﴿٩٤﴾ پاشان مووسا ڕووی کردە (سامیری) و پێی وت: ئەی (سامیری) چی وای لێکردیت کە ئەم ئیشە بکەی گوێلکێک دروست بکەی لە ئاڵتوون و بانگی خەڵکی بکەی بۆ پەرستنی﴿٩٥﴾ (سامیری) وتی: ئەوەی من بینیومە ئەوان نەیانبینیوە کە جبریلی بینیوە لەسەر ئەسپەکەی مشتێک لە شوێنەواری شوێن پێی ئەسپەکەی جبریلی هەڵگرتووە، فڕێم دایە سەر ئەو ئاڵتوونە کە تاوابۆوە لەسەر شێوەی گوێلککە بیوتایە ببە بە هەر شتێک دەبووە ئەو شتە، یاخود وتراوە هەڵی داوەتە سەر هەر شتێکی بێ گیان وای لێ هاتووە تا گیان و ڕۆح ئەچووە بەری و زیندوو ئەبۆوە، نەفسیشم ئەم شتەی بۆ ڕازاندمەوە﴿٩٦﴾ مووسا فەرمووی: دەی بڕۆ ئێرە بەجێبهێڵەو دوور بکەوە لێرە، چونکە دەستت بۆ شتێک برد کە بۆت نەبوو دەستی بۆ بەریت، تا لە ژیاندا بی ئەبێ کەس لێت نزیک نەبێتەوەو تێکەڵی خەڵکی نەبیت، نەفی کردو دووری خستەوەو فەرمانی کرد بە بەنی ئیسرائیل کە جارێکی تر لێی نزیک نەبنەوەو کەس قسەی لەگەڵ نەکات وەکو سزایەک بۆی، بە دڵنیایی تۆ مەوعیدێکیشت هەیە کە خوای گەورە ئەو مەوعیدە لە کاتی خۆی جێبەجێ ئەکات کە ڕۆژی قیامەتە لەوێ خوای گەورە سزات ئەدات، سەیری خوایەکەت بکە کە بەردەوام مایتەوە لەسەری و عیبادەتیت دەکرد ئەبێ بیسووتێنین بە ئاگر، پاشانیش خۆڵەمێشەکەی فڕێ ئەدەینە ناو دەریاوەو بڵاوی ئەکەینەوە تا با بیبات﴿٩٧﴾ بە دڵنیایی تەنها پەرستراوی حەقی ئێوە الله یە کە هیچ پەرستراوێک بەحەق نییە شایەنی پەرستن بێت جگە لە زاتی پیرۆزی الله نەبێ ئەمە خواو پەروەردگارو پەرستراوی ئێوەیە نەک ئەم گوێلکەکە زانست و زانیاری خوای گەورە زۆر فراوانەو هەموو شتێکی گرتۆتەوە﴿٩٨﴾.

لەدوای ژوانی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لەگەڵ خوای گەورەدا ئاگاداری کردەوە کە گەلەکەت تووشی سەرلێشێواوی بوون لە لایەن کەسێک کەناوی سامرییە بەم شێوەیە کتوپڕە خوای گەورە مووسای لێ ئاگادار کرد لەکاتێکدا مووسا هاتبوو بۆ ئەوەی ژیانێکی نوێ و سەربەرزی بۆ گەلی ئیسرائیل دابین بکات، بەڵام ئەوان نەبوونە ئەو گەلەی کە هەڵگری پەیامی خوایی بن و جێبەجێکاری فەرمانی خودا بن.

هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ کۆیلایەتی کردنی گەلی ئیسرائیل لەلایەن فیرعەونەوە کەماوەی ساڵانێکی زۆر درێژخایەن بوو، توانای ئارامگرتنیان نەمابوو هیچ فەرمانێکیان بۆ

جێبەجێ نەدەکرا و ڕاوەستاو نەبوون، کیانیان زۆر بەئاسانی تێکەڵ بوبوو بە لاسایی کردنەوەی گەلانی تر و هەرچی ئاسان بوایە بۆ لاسایی کردنەوە خێرا وەریاندەگرت و پیادەیان دەکرد.

ئەمجارە خۆیان تووشی تاوان و ئیبتیلائێکی زۆر گەورە کرد بەدروست کردنی گوێرەکەیەک لە ئاڵتون بۆ پەرستن و کردیانە خوای خۆیان، ئەو کەسەی ئەم کارەی ئەنجام دا ناوی (سامری) بوو، مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ هیچ ئاگایەکی لەمە نەبوو، دەست بەجێ نووسراوەکانی هەڵگرت کە لە ناویدا شەریعەت و یاسا و ڕێسای خوای بوو بۆ گەلی ئیسرائیل، مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بە تورەییەوە گەڕایەوە بۆ ناو گەلەکەی، بەڵام بە تووڕەبوونی زۆر و پاشان خەم و پەژارەوە، تورەبوونەکەی لەوە بوو کە چۆن ئەوەندە نەگبەتن، گوێرەکە دروست دەکەن بەدەستی خۆیان دەیپەرستن، خەم و پەژارەکەی بۆ ئەوە بوو کە لە دوای ئەو هەموو نیعمەتە خوای گەورە پێیبەخشون سەرەڕۆ دەبن. لەوە دەترسا داخۆ تۆڵەی خوای پەروەردگار چی بێت لە گەلی ئیسرائیل، لەو فیتنەیە دەترسا کە تووشی گەلەکەی بووە، گەڕایەوە ناو خەڵکەکە و سەرەتا یەکەم کەس ئێخەی جێگرەکەی گرت کە هاروونی برای بوو، سەیر لەوەدا بوو کاتێک کە گەڕایەوە گەلەکەی سوجدەیان بۆ گوێرەکەیەک دەبرد کە خۆیان دروستیان کردبوو لە ئاڵتون، ئینجا مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی گەلی ئیسرائیل خوای پەروەردگار پەیمانی باش و چاکی نەئەدا بە ئێوە، لێرەدا مەبەستی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لەلایەن بتپەرستانەکەوە خوای گەورە لە قورئان دا لەو سەردەمەدا قودس بە جێگا و ماڵی فاسقەکان باس دەکات و دەفەرموێت (دار الفاسقين)، هەروەها سەرکەوتوو دەبن بە هۆکاری تەوحید و خواناسی کەچی وا گوێرەکە دەپەرستن، بەردەوامە لە وتەکانی دەفەرموێت: دەتانەوێت تورەیی خوا بەسەرتاندا بێت ئەوا بریار نەبوو کە لە سەر پەیمانی خواناسی و مەنهەجی ڕاستی بمێننەوە تا دەگەڕێمەوە لە موناجاتی خوای پەروەردگار، هیچ گۆڕانکاریتان بەسەردا نەیەت، شوێن هیچ مەنهەج و شەریعەتێکی تر نەکەون!

پاشان هەنجەتێکی زۆر بێ مانا دەهێننەوە بۆ مووسا، بۆ خۆدەرباز کردن دەڵێن: ببورە هەر ویستمان ڕزگارمان بێت لەو ئاڵتونانەی کە لە سوپای فیرعەونەوە دەستمان کەوتووە، وتمان با بیکەینە ئەم گوێرەکەیە! چونکە ئەو دەستکەوتە حەرامە بۆ ئێمە ئیتر سامری بردی و ئەم گوێرەکەی بۆ دروست کردین.[٢٣]

شێوەی گوێرەکەکە ناوسکی بۆش بوو لە دەمییەوە تا کۆمی کونی تێکردبوو کە هەوای تێدا دەچوو دەنگێکی لێوە دەهات شێوە تەکنیکێک بوو بەکاری هێنابوو تێیدا، نە هیچ ژیانی تێدا بوو بەڵکو تەنها لێزانی و تەکنیکی شێوە دروستکردنەکە بوو کە جارو بار دەنگی هەواکەی لە دەمییەوە بۆ کونی دواوە یان لە کونی دواوەی بۆ کونی پێشەوەی دەمی ئەو دەنگە خورە خوڕی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

(٢٣)- (سامری کەسێکی خەڵکی (سامەڕا)یە ئەو لەقەبەیان پێ بەخشیوە لە تەفسیری سەید قوطب دا هاتووە، في ظلال القرآن، ل. ٢٣٤٧، بەرگی ٤)

دروست دەکرد لە زمانی عەرەبیدا وشەی (الجسد) بۆ شتی بێ گیانە (الجسم) بۆ لاشەی گیاندارە.

وتیان مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لەبیری چۆتەوە خواکەی لێرەیە کەچی دەڕوات بۆ سەر شاخ بۆ موناجات لەگەڵ پەروەردگاردا ئەمەش وتەیەکی بەتاڵ و بێ مانا بوو بۆ سەرلێشێوانی خەڵکەکە، سامری ئەم قسەیەی دەکرد بۆ هەڵ خڵەتاندنی خەڵکی. ئینجا حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ چەمکە خوارەکانیان بۆ ڕاست دەکاتەوە و پاشان مێشکیان دەجوڵێنێت و دەفەرموێت: باشە خۆ ئەمە گیانی تێدا نییە، تاوەکو گوێرەکەی تر بتوانن مامەڵەی لەگەڵ بکەن، ئەم زۆر لە ئاستی حەیوانی تر کەمترە، گوێرەکەیەک کە ژیانی تێدا بوایە هیچ نەبوو گوێی لێتان بوو، هیچ زەرەر و زیانێکی نەبوو، خۆ ئەگەر گوێرەکەی زیندوو بوایە ئەوا سەرتان دەبڕی و سوودتان لە گۆشتەکەی وەردەگرت یان بەردی ئاشتان پێ با ئەدا، کەواتە ئەوان زۆر لە ئاستێکی تری بیرکردنەوەشدا بوون.

پێش ئەوەی کارەکە ئەنجام بدەن حەزرەتی هاروون ئامۆژگاری کردن کارەکەی بە چەپەڵ و تاوان و کوفر لە قەڵەم دا، ئاگاداری کردنەوە شوێن پەکتاپەرستی بکەون، لە کاتێکدا ئێوە پەیمانتان داوە بە مووسا، هاروون فەرمووی خۆ مووسا لێتان ون نەبووە چووە بۆ گفتوگۆ و موناجات لەگەڵ پەروەردگاریدا کەچی لەوەڵامدا وتیان ئێمە سوجدە و بەندایەتی بۆ ئەم گوێرەکەیە دەکەین تا مووسا دەگەڕێتەوە بۆ لامان.

لەکاتی توڕەبوونی زۆری مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ ڕوودەکاتە هاروون و دەفەرموێت چی وای لێکردیت ڕێگرییان لێ نەکەیت کە تووشی گومڕایی بوون، تۆش فەرمانی منت جێبەجێ نەکرد و سەرپێچیت کرد لە فەرمانەکەم؟

هاروون سەرو ڕیشی بەدەست مووساوە بوو بای ئەدا لە توڕەیدا، هاروونیش لە هەوڵی هێورکردنەوەیەتی، هاروونیش بە سرووشتی خۆی پیاوێکی زۆر هێمن و لەسەر خۆیە، ئینجا دەیەوێت بەوەتەری برایەتی لە دایک و باوک مووسا هێور بکاتەوە، پاشان دید و بۆچوونەکەی خۆی دەخاتە ڕوو کە درێغی نەکردووە، بەڵام ترساوە لە ترسان و تۆقاندن و ڕەقی بەرانبەر بە گەلی ئیسرائیل بهێنێت و جیابینەوە و ببنە دووبەش، ئەمەش لەڕاستیدا زۆر سامناکە و دەشێت ئەو کۆمەڵەی شوێن سامری و گوێرەکەکە کەوتوون و بڕۆن بەشی خۆیان جیابکەنەوە بکەونە جەنگ و ململانێ لەگەڵ بەشەکەی تردا، ئەمەش لەبەرژەوەندی ئەو گەلە داڕوخاوە نییە لە ڕووی بیروباوەڕ و پاشان ڕەوشت و ئاکارە ئاینیەکان، بۆیە نەیویستووە پارچە پارچە بن، مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ کە زانی بۆچوونەکەی تەواوە و خودی گەلەکەشی دەناسی بۆیە وازی لە هاروون هێنا و کەوتە قسەکردن لەگەڵ سامری بەڕق و توڕەبوونی لە پێناوی ئایینی خوادا ڕووی کردە سامری خاوەن فیتنەکە هەر بۆیە یەکەم جار ڕووی کردە هاروون، چونکە سامری بە زۆر و هێز گەلی

ئیسرائیلی نەکردە گوێرەکە پەرست، بەڵکو هاروون بەرپرسی یەکەمە لە نەهێشتن، چونکە سەرکردەی باوەڕپێکراوە و جێگری مووسایە و برایەتی و پێغەمبەرە و وەزیری مووسایە.

کەواتە گەلەکە تاوانبارە پاشان گوێیان نەگرتووە بۆ مووسا پێغەمبەری یەکەم گوێیان نەگرتووە بۆ هاروون جێگر و پێغەمبەری دووەم، ئێستا تاوانبار کێیە؟ بێ گومان سامریی یە، لەبەر ئەوەی سامریش کارەکەی بەزۆر پێنەکردون و گەلەکە خۆیان هاوکار بوون، سەرۆکی فیتنەکە و بەشێکی تر لە خەڵکی فیتنەچی مووسا دەریکردن لەناو خۆیاندا و بەهیچ شێوەیەک پەیوەندییان لەگەڵدا ناکرێت، بەڵام پێش دەرکردنی مووسا وەکو حاکمێک لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکات تا ئەویش بەرگی لەخۆی بکات، مووسا فەرمووی سامری چی وای لێکردی کە ئەم کارە ئەنجام بدەیت؟

سامری کەوتە درۆ و دەلەسە و وتەی بێمانا، گوایە نێردراوێکی بینیوە کە ئەسەری نەبینراوە ئەم گوێرەکەی دروست کردووە، جا ئەم نێردراوە چییە کەس نازانێت! هیچ پەیوەندی بە گوێرەکە ئاڵتونییەکەوە نییە، ئەوانەشی کە دەڵێن گوایە لە قوڕی ژێر پێی جوبریلی هەڵگرتۆتەوە و کردویەتی بە گوێرەکەیە، هیچ واتایەکی نییە، جا ئەو قوڕە چ پەیوەندی بە گوێرەکە پەرستنەوە هەیە، تەنها بیانووەکەی سامری دەهێننەوە هیچ پەیوەندی بە جوبرەئیل و شتی ترەوە نییە.

ئەو سزایە لە شەریعەتی مووسادا هەبوو دەرکردن بێ ئازاردان و تا کۆتایی ژیانی ئەو کەسە دەبێت بڕواتە جێگایەکی تر و هیچ پەیوەندی بە گەلی ئیسرائیلەوە نەمێنێت.

پاشان مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ خواکەیانی سوتاند و گوێرەکەکەی خستە ناو ئاگر و کۆتای بەم ئاژاوە گێڕییە هات و گەلی ئیسرائیل و پیاوچاک و خواناسەکانی خۆیان ئامادەدە دەکەن بۆ داوای لێخۆشبوون و تەوبەکردن لەو کارە ناپەسەندەی گەلی ئیسرائیل کردی، مووسا دوای دامەزراندنی بنەماکانی ئایینەکە بۆ گەلەکەی لە ڕێگای وەحی خوای موتەعالەوە پاشان (٧٠) کەس لە خەڵکی خواناس و چاکەخوازەکانی ئامادە کرد بۆ چوون بۆ حزوری خوای پەروەردگار.

باسەکانی گەلی ئیسرائیل و حەزرەتی مووسا لە کتێبی سێیەم دا درێژەی پێ دەدرێت!

# مەملەکەتی چواردەیەم:
# ڕووداوەکانی ژیانی پێغەمبەران، داوود و سەردەمی سولەیمان سەلامی خوایان لێ بێت

## ڕووداوەکانی ژیانی پێغەمبەر داوود عَلَيْهِ السَّلَامُ

داوود ناوی ١٦ جار هاتووە لە قورئان دا، یەکێکە لە پێغەمبەرانی گەلی ئیسرائیل، ناوو نەسەبی بریتییە لە : (داوود کوڕی ئەیشا کوڕی عوەید کوڕی عابر کوڕی سەلمون کوڕی نەحشون کوڕی عوەینادیب کوڕی ئیرەم کوڕی فەرص کوڕی یەهوزا کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم)ە.

بەم شێوەیە لە ئەهلی لە ئەهلی کتێبە ئاسمانییەکانەوە هاتووە.

خاوەنی کتێبی ئاسمانی زەبور بووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ۖ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾﴾ الإسراء

واتە: پەروەردگارت زاناترە بە حاڵی ئەو کەسانەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن کامیان گوێڕایەڵ و کامیان سەرپێچیکارن بە دڵنیایی ئێمە فەزڵی هەندێک پێغەمبەرانمان داوە بەسەر هەندێکی تریان وەکو ئیبراهیم و موسی و عیسی و نوح و محمد (سەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) کە گەورەترینیان پێغەمبەری خوایە - صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زەبوریشمان بە داوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ بەخشیووە﴿٥٥﴾.

کتێبی زەبور دەربارەی پەند و ئامۆژگاری بەندایەتی و سوپاسگوزاری خوای پەروەردگارە لەگەڵ پەیمانی کۆندا تێکەڵ دانراوە بووە بە بەشێک لە کتێبی پیرۆز، خودی کتێبیی پیرۆز بریتییە لە چەند کتێبێک یاخود ناونراوە بە چەند سفرێک کە قورئان بە (الالواح) باسی کردووە، کە کۆکراوەی کتێبی پێغەمبەرانە لە حەزرەتی موسا وە تا حەزرەتی عیسا، پەیمانی کۆن واتا تەورات و زەبور سفری پێغەمبەرانی تر، وەکو حەزقیال، ئەرمیا و صامۆئیل (شەمۆئیل)، پادشاکانی گەلی ئیسرائیل. ئەمانە بریتین لە پەیمانی کۆن (العهد القديم) پەیمانی نوێ ئینجیل-

ە كە پێک هاتووە لە بەشەكانی یەحیا، ماركوس، مەتا، یوحەنا، لوكا و پۆلس بەمانەش دەوترێت پەیمانی نوێ (العهد الجدید).

## چۆنێتی دەرکەوتنی داوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ

خانەوادەی حەزرەتی داوود لە شاری (بيت لحم) دەژیان، باوکی داوود سێ کوڕی چوو بۆ جەنگ لەگەڵ طالوت دا، زۆر خەمی کوڕەکانی بوو کوڕی چوارەمی نارد بۆ هەواڵ پرسی کە منداڵترین بوو لە سێ کوڕەکەی کە سەربازی طالوت بوون (لە پەیمانی کۆن)دا نوێ طالوت بە (شاوڵ) هاتووە هەروەها ناوی جالوت بە (جولیات) هاتووە.

سوپای هەردوولا لەیەکتر نزیک بوونەتەوە، تەنها ڕووبارێک لە نێوانیان بەربەستە، دوای ئەوەی سەنگەر لێدرا و هەردوو سوپاکە بەرانبەر یەکتری وەستان سوپای طالوت لە چاو سوپای فەڵەستین و جەبارین و عەمالیقەکان زۆر کەم بوو، هەرسێ هۆزەکە دژی گەلی ئیسرائیل بوون.

جالوت پیاوێکی زۆر زلی زەبەلاح بوو لە هونەری جەنگ شارەزا بوو، پادشای عەمالیقە و سەرۆکی هەموو گەل و هۆزەکان بوو، سوپای طالوت سەنگەریان لەناو شاخەکان دا لێدابوو بە هۆکاری ئەوەی سوپاکەی کەم بوو، سوپای جالوتیش لە بنار و دامێنی شاخەکاندا بوون، ماوەی ٤٠ ڕۆژ جالوت دەردەچوو بۆ جەنگ و لەمەیدانی جەنگ دا هاواری دەکرد ئازا و چاونەترس و جوامێرەکەتان بێتە جەنگ کەس نەیدەوێرا ڕووبەڕووی بێتەوە، ئەوە حاڵوگوزەرانی سوپای گەلی ئیسرائیل بوو لە بەرانبەر سوپای جالوت دا کە لە مێژوودا بە (جولیات) هاتووە. حەزرەتی داوود گەنجێکی تازە پێگەیشتووە دەبێت زۆر شارەزایە لە هەڵدانی (قۆچەقانێ)، ئەم چەکە بەرد دەخاتە نێوانی پێستە یاخود پەڕۆ وەکو تیرهاویشتن بۆ دوژمن زۆر کاریگەری هەیە و مرۆڤ باش بریندار دەکات ئەگەر نەیکوژێت، داوودیش زۆر شارەزا بوو لە هەڵدانی بەرد بە (قۆچەقانێ).[٢٤]

ئەم جالوتە زەبەلاحە ماوەی ٤٠ ڕۆژ و ٤٠ شەو ئەمە پیشەی بووە بۆ شکست پێخواردن و ورە دابەزاندنی سوپای ئیمانداران، داوای زۆران بازی و ڕم بازی و شمشێربازی دەکات، بێجگە قسە و جنێوی ناشرین بە سوپای طالوت، داوودیش گەنجێکە هاتووە تەنها هەواڵ بۆ باوکی بەرێتەوە دەربارەی براکانی، بەڵام کە دەگاتە ئەو جێگایە گوێ لە قسەکانی جالوت دەبێت داوا دەکات لە طالوت کە ڕێگای بدات بۆی بڕواتە دەرەوە لە مەیداندا جەنگی لەگەڵدا بکات تا زۆرانبازی لەگەڵدا بکات.

لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە گوایە (شاوول) کە طالوت-ە ئێرەیی و بەخیلی بە داوود دەبات بۆ ئازایی و چاونەترسی!

---

[٢٤] لە زمانی کوردیدا پێی دەوترێت قۆچەقانێ لە زمانی عەرەبیدا پێی دەوترێت (قلاع).

طالوت قەڵغانێکی زنجیری دەکاتە بەری داوود ئەویش لەو جۆرە جلانەی نەپۆشیووە هەرگیز بۆیە نازانێت پێوەی بڕوات، دایدەکەنێت و دەچێتە مەیدان بەخۆی و قۆچەقانێ و پێنج خڕە بەردی ساف و لوس!

جالوت کە دەبینێت پێی دەڵێت تۆ زۆر منداڵی وەرە با خێرا بتکوژم و کۆتایت بێت، لەم مشتومڕەدا دەبن جالوت دەیەوێت بە ڕمەکەی بیکوژێت، بەڵام داوود زۆر خێرا دەبێت و بە قۆچەقانێکەی بەردێک دەکێشێت بەسەریدا و جالوت لە زەویدا بێهۆش دەکات و خێرا هەڵدەکوتێتە سەری بە شمشێرەکەی ملی دەپەڕێنێت، کەللەی سەری بە قژەکەی هەڵدەگرێت نیشانی هەردوو سوپاکەی ئەدات، فەڵەستینی و گەلەکانی تر هەموو ڕادەکەن و ناوبانگی داوود لەوێوە دەردەکەوێت و وەکو گەنجێک دێتە ناو شانۆ و گۆڕەپانی ڕووداوەکان.[٢٥]

لە ڕابردوودا جالوت وتبووی هەرکەس دەربچێتە دەرەوە بۆ کوشتنی طالوت ئەوا دەیکەمە شەریک و هاوبەش لە پادشایەتیەکەمدا و کچێکی خۆمی ئەدەمێ، بەم پاوپێوەندە داوود بووە جێگری طالوت و لەهەمانکاتدا زاوای طالوت، هەموو خەڵکی ئیسرائیل داوودیان خۆش دەویست و حەزیان دەکرد ئەو ببێتە پادشا، یەکەم هۆکار ئەوەبوو لە بنەماڵەی یەهوزا بوو، دووەم کوڕێکی ئازا و خۆشەویست بوو، چونکە هۆکاری سەرکەوتن بوو لەناو سوپای طالوت، هەرچەندە طالوت ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە جەنگێکدا لەگەڵ فەڵەستینەکاندا دەپێکرێت بە تیر و شەهید دەبێت لەدوای شەهید بوونی طالوت داوود دەبێتە جێنشین و خەلیفە لە سەر زەوی.

داوود لەدوای ئەوەی پیاوانی کەهەنە کە ناسراون بە پیاوانی (یەهوزا) کردیانە پادشای خۆیان لە شاری (حبرون یاخود خەلیل)ی ئەمڕۆ، هەرچەندە لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە گوایە کوڕێکی طالوت جەنگی لەگەڵ داوود کردووە لە کۆتاییدا داوود سەرکەوتووە بەسەریدا و کوڕەکەی طالوت ناوی (ئیشبوث/جۆناتان) بووە، ماوەی خەلیفایەتی و پادشایەتی ٤٠ ساڵ بووە لەشاری (ئۆرشەلیم) هەروەها دەڵێن: لەسەردەمی طالوت حەوت ساڵ و شەش مانگ جێگری

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٥] هەرچەندە پێشتریش ئاماژەمان پێداوە، بەڵام بۆ بیرخستنەوەی خوێنەر کە دەڵێین فەڵەستین بەواتای عەرەبی فەڵەستینی ئێستا نییە، فەڵەستین هۆزێک بوون هاتبوونە شام و بەرەچەڵەک خەڵکی (قوبروس) بوون، ئەم دوو هۆزە دوو قسەی لەسەر دەکرێت کە گوایە بە هۆکاری زەمین لەرزە هاتبوونە خاکی شام یان طاعون، یاخود دوژمنایەتی لەگەڵ هۆزی گریکەکان دا.

کاتێک ئیستیعمار هاتنە ناو خاکی موسڵمان و پارچە پارچەیان کرد و خیلافەتی ئیسلامی ڕووخاند، ناوی جێگاکانی لەسەر مێژووی کۆن ناونراوەتەوە، بۆ نموونە عێراق وڵاتێکی نوێ یە بەناوی (ئیرەک) هاتووە واتا خاکی تەخت یان سوریا بەناوی ئاشوریيەکان، فەڵەستین بەناوی خەڵکی قوبرص، ئیسرائیل بەناوی گەلەکەی، سعودیە بەناوی (آل سعود)، هەروەها ئەردەن و بەحرەین و کوەیت، هەموو ئەم ناوانە ئینگلیز، فەڕەنسا، ئیتاڵیا و ڕووسیا بۆیان دۆزیونەتەوە، موسوڵمانان خاوەنی نین.

طالوت بووە، لە شاری حبرون پادشا و کاربەدەست بووە، ٣٣ ساڵ و شەش مانگ پادشای هەموو گەلی ئیسرائیل بووە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ﴿٢٥١﴾﴾ البقرة

واتە: بە ئیزنی خوای گەورە سەرکەوتن بەسەر (جالوت) و سەربازەکانیان داوودیش عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ (جالوتی) کوشت و خوای گەورە کردی بە پێغەمبەر، خوای گەورە موڵک و پێغەمبەرایەتی پێ بەخشی ئەوەی کە خوای گەورە ویستی لێ بێ فێری کرد، وتراوە: فێری قەڵغان دروست کردنی کردووە ئەگەر خوای گەورە نەخشەو پیلانی کافرانی ڕەتنەکردایەتەوە بەهەندێ خەڵکی کە کوشتار دەکەن لە پێناو خوای گەورەدا ئەوا زەوی تووشی ئاشووب ئەبوو بەوەی کە کافران دەستیان بەسەردا دەگرت و دروشمەکانی کوفریان تێدا بەرپا دەکردو قەدەغەی پەرستنی خوای گەورەیان دەکرد، بەڵام خوای گەورە فەزڵی یەکجار زۆرە بەسەر هەموو جیهاندا﴿٢٥١﴾.

لەناو ئەهلی نەسارا دا داوود تەنها وەکو پادشایەک تەماشا دەکرێت نەک وەکو پێغەمبەرێک، هەروەها لە کتێبە مێژووییە ئیسلامیەکاندا هاتووە کە ڕۆژەکانی دابەش کردبوو بەسەر ٤ ڕۆژدا بەم شێوەیە، ڕۆژێک بۆ بەندایەتی ڕۆژێک بۆ دادوەری ڕۆژێکیش بۆ بانگەواز و ئامۆژگاری و ڕێنمونی خەڵکی، ڕۆژی چوارەمیش بۆ کاروباری تایبەتی خۆی.

لە ڕۆژانی پشووی خۆیدا لە ژوورەکەی خۆیدا کە بە (میحراب) لە قورئان دا ناوی هاتووە دوو کەس هەموو دەرگا و پەنجەرە و دیواری ماڵی داوود دەبەزێنن و دەچنەلای حەزرەتی داوود، ئەویش سەرقاڵە بەکاری خۆیەوە ئەم دوو کەسەش لەپڕ پەیدا دەبن و هەموو پاسەوان و دەرگا و پەنجەرە و دیواری ماڵی داوودی بەزاندووە، حەزرەتی داوود عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ دەترسێت لەوەی پیاوخراپ بن یان لەبەرانبەریدا تیرۆر یان کارێکی خراپ بکەن.

پاشان دوو کەسەکە دەڵێن: ئێمە کێشەیەک لە نێوانماندایە، بەڵکو تۆ بۆمان دادوەری بکەیت، باسەکە لە نێوانی ٩٩ سەر بزن و یەک بزنە. ئەوەی قسە دەکات دەڵێت: من خاوەنی بزنێکم ئەم هاوڕێ و دۆستەم دەیەوێت بزنەکەی منیش بخاتە سەر بزنەکانی خۆی حەزرەتی داوود خێرا داوەری دەکات بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ کەسی سکاڵا لێکراو، پاشان دەزانێت هەڵە بووە دەستبەجێ تەوبە دەکات، دەگەڕێتەوە بۆلای خوای پەروەردگاری ئەمەش وەکو تاقیکردنەوەیەک بووە.

خوای گەورە ڕووداوەکەمان بۆ باس دەکات لە قورئان دا دەفەرموێت:

﴿۞ وَهَلۡ أَتَىٰكَ نَبَؤُاْ ٱلۡخَصۡمِ إِذۡ تَسَوَّرُواْ ٱلۡمِحۡرَابَ ۝٢١ إِذۡ دَخَلُواْ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنۡهُمۡۖ قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ خَصۡمَانِ بَغَىٰ بَعۡضُنَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فَٱحۡكُم بَيۡنَنَا بِٱلۡحَقِّ وَلَا تُشۡطِطۡ وَٱهۡدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ۝٢٢ إِنَّ هَٰذَآ أَخِي لَهُۥ تِسۡعٞ وَتِسۡعُونَ نَعۡجَةٗ وَلِيَ نَعۡجَةٞ وَٰحِدَةٞ فَقَالَ أَكۡفِلۡنِيهَا وَعَزَّنِي فِي ٱلۡخِطَابِ ۝٢٣ قَالَ لَقَدۡ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعۡجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦۖ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡخُلَطَآءِ لَيَبۡغِي بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٞ مَّا هُمۡۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسۡتَغۡفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعٗاۤ وَأَنَابَ ۩ ۝٢٤ فَغَفَرۡنَا لَهُۥ ذَٰلِكَۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ۝٢٥﴾ ص

واتە: ئەی محمد ﷺ ئایا هەواڵی ئەو دوو کەسەت بۆ هاتووە کاتێک کە دژ بەیەک بوون و لە میحراب و دیوارەکە پەڕینەوەو هاتنە ئەم دیو و هاتنە ژوورەوە بەبێ ئەوەی لە دەرگا بدەن۝٢١ کاتێک خۆیان کردە ژوورەوە بۆ لای داوود پێغەمبەر عليه السلام داوود پێغەمبەر لێیان ترسا لەبەر ئەوەی لە دەرگاوە نەهاتنە ژوورەوە وتیان: مەترسێ، ئێمە دوو کەسین دژبەیەکین کێشەمان هەیەو یەکێکمان ستەمی لەوەی تر کردووە، تۆ بە حەق و دادپەروەری بڕیار لە نێوانماندا بدە ستەم مەکە لە بڕیاردانتدا ڕێنماییمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست۝٢٢ ئەمە برامە نەوەدو نۆ مەڕی هەیە، منیش تەنها یەک مەڕم هەیە داوای ئەو مەڕەیش لە من دەکات و ئەڵێ: بیدە بە من زاڵ بوو بەسەرمدا لە قسەکردندا۝٢٣ داوود پێغەمبەر عليه السلام یەکسەر بڕیاری داو فەرمووی: بەڕاستیێ ستەمی لێ کردوویت کە داوای مەڕەکەی تۆ ئەکات و دەیەوێت بیکاتە لای ئەوانەی خۆی و لێت بسەنێت زۆرێکیش لەوانەی کە شەریکن هەندێکیان ستەم لە هەندێکیان دەکەن تەنها ئەوانە نەبێت کە ئیمانیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە کە ئەوانیش کەمن داوود پێغەمبەر دڵنیا بوو و زانی کە ئێمە تاقیمان کردەوە بۆیە داوای لێخۆشبوونی لە خوای گەورە کرد، چووە رکوع و سجودو کڕنوشی بۆ خوای گەورە بردو گەڕایەوە بۆ لای و داوای لێخۆشبوونی لێکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر سورەتی (ص) ی خوێند گەیشتە ئەم ئایەتە دابەزی و سوجدەی بردو هاوەڵانیش سوجدەیان لەگەڵدا برد، بەڵام ئەو چیرۆکەی کە باسکراوە کە گوایە داوود پێغەمبەر وەزیرێکی هەبووە خێزانەکەی بە ڕووتی بینیوەو حەزی لێ کردووەو پاشان وەزیرەکەی ناردووە بۆ جەنگ و کوژراوەو خێزانەکەی مارە کردووە، خوای گەورە ئەو دوو مەلائیکەتەی ناردووە و داوود پێغەمبەری تاقیکردۆتەوەو دواتر زانیوێتی و تەوبەی کردووە، ئەمە (ئیسرائیلیاتە) و هیچ بنچینەو بنەمایەکی نیەو صەحیح و ڕاست نییە، نەک پێغەمبەرانی خوای گەورە بەڵکو باوەڕدارێکی ڕاستەقینە کاری وای لێ ناوەشێتەوە چ جای پێغەمبەرێک لە پێغەمبەران، بەڵکو هەر دوو کەس بوونەو ئەو کێشەیەیان هەبووە، هەڵەکەی داوود پێغەمبەر ئەوە بووە کە بەبێ ئەوەی گوێ لەوەی تر بگرێت یەکسەر وتی: زوڵم و ستەمی لێ کردوویت، با ئەو نەوەدو نۆ مەڕیشی هەبێت و ئەم یەک مەڕی هەبێت

لەوانەیە ئەوەی یەک مەڕەکەی هەیە زوڵمی کردبێت و زوڵم و ستەم بە زۆرو کەمی نییە، نەئەبوایە بڕیاری بدایە تا گوێی لەوەی تریش دەگرت، لە شەریعەتی خۆیشمان هەروایە نابێت قازی و دادوەر بڕیار بدات تا گوێ لە هەردوو لا دەگرێت، ئەمە تەفسیری ڕاست و دروستە بۆ ئایەتەکە﴿٢٤﴾ ئێمەش لێی خۆش بووین لەو بڕیارە پەلەیەی کە دای لە ڕۆژی قیامەت داوود پێغەمبەرعَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ لەلای ئێمە نزیکی و ڕێزو لێخۆشبوونی بۆ هەیە، گەڕانەوەی باشیشی بۆ هەیە کە پلە بەرزەکانی بەهەشتە﴿٢٥﴾.

هەندێک لە زانایان دەڵێن: هۆکاری تاقیکردنەوەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە داوود نابێت خاوەنی ڕۆژی تایبەت بە خۆی بێت، چونکە پادشاو پێغەمبەرە دەبێت هەمیشە بۆ کاری دادوەری ئامادە بێت لە نێوان خۆی و خەڵکیدا هیچ جۆرە بەربەست و دیوار و پەنجەرەیەک نەبێت، هەر بۆیە دوو کەسەکە هەموو شتێکیان بەزاند و گەیشتنە لای حەزرەتی داوود، چونکە داوود خوای گەورە ئامادەی دەکات بۆ خەلیفایەتی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾﴾ ص

واتە: ئەی داوود پێغەمبەر ئێمە تۆمان کردووە بە جێنشین لەسەر زەویدا تۆ بڕیار لە نێوان خەڵکیدا بدە بە دادپەروەری شوێن هەواو ئارەزوو نەکەوی لە بڕیاردان لە نێوان خەڵکیدا چونکە گومڕات ئەکەن و لە ڕێگای ڕاستی خوای گەورە لات ئەدەن، یان لە ڕێگای بەهەشت لات ئەدەن ئەو کەسانەی لە ڕێگای ڕاستی خوای گەورە لائەدەن بە دڵنیایی ئەوانە سزایەکی زۆر بە ئێش و ئازاریان بۆ هەیە لەبەر ئەوەی ڕۆژی لێپرسینەوەیان لەبیر کردووە﴿٢٦﴾

بۆیە حەزرەتی داوود عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ تاقیکراوەتەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر گوێ تەنها بۆ یەک طەرەف نەگرێت و قسەی هەردوو طەرەف بەهەند وەربگرێت. هەڵسەنگاندنی جدی بۆ باسەکان بکات چونکە پادشا و دادوەر و پێغەمبەرە، خوای گەورە کەسایەتیەکی قیادی و بڕانەوەی هەموو جۆرە ناکۆکییەک و کێشەیەکی هەبوو، دەیتوانی چارەسەری بکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ﴿٢٠﴾﴾ص

واتە: موڵکەکەیشیمان زۆر بەهێز کردو موڵکێکی تەواومان پێبەخشی ئەوەی کە پاشاکان پێویستیان بێت، سەرمان خست بەسەر دوژمندا حیکمەت و دانایی و کاربەجێی و تێگەیشتن و دادپەروەری و پێغەمبەرایەتیمان پێ بەخشی یەکلا کردنەوەمان پێ بەخشی لە قسە کردن و

بڕیاردان و قەزادا کە بە جوانی یەکلای ئەکردەوە بە بوونی دوو شایەت لەسەر تۆمەتبار، کە نەبوو ئەوا بە سوێند خواردنی تۆمەتبارەکە، وەکو شەریعەتی خۆمان.

ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە خاوەنی هێز و بازووی تەواوەتی خۆی بوو خەریکی پیشەی ئاسنگەری بوو، بەڵام دەکرێت بڵێین ئەندازیاری ئاسن بووە لەگەڵ دەست ڕەنگینی و پیشەی جوانی خواناس و دەنگ خۆش بوو، کاتێک زەبوری دەخوێند، شاخ و باڵندەکان لەگەڵیدا تەسبیحاتیان دەکرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا سَخَّرْنَا الْجِبَالَ مَعَهُ يُسَبِّحْنَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَالطَّيْرَ مَحْشُورَةً كُلٌّ لَّهُ أَوَّابٌ ﴿١٩﴾﴾ ص

واتە: ئێمە شاخەکانمان ژێربار کردبوو لەگەڵیدا تەسبیحاتی خوای گەورەیان ئەکرد بە ئێواران و بەیانیان﴿١٨﴾ کە زەبوری بخوێندایە ئەوەندە دەنگی خۆش بوو باڵندەکانیش لە ئاسمان هەر هەموویان کۆ ئەبوونەوەو لەگەڵیدا تەسبیحاتی خوای گەورەیان ئەکردو هەموویان ئەگەڕانەوە بۆ لای خوای گەورەو گوێڕایەڵی دەبوون﴿١٩﴾.

## موڵک و دەسەڵاتی حەزرەتی داوود عَلَيْهِ السَّلَام

لەڕابردوودا باسی ئەوە کرا کە چوارکەس دەسەڵاتی هەموو جیهانیان هەبووە، دوانیان موسڵمان بوون زولقەرنەین، داوود و سولەیمان کە ئەم کوڕ و باوکە بەیەک دەسەڵات هەژمار کراون، دوو کافریش کە نەمرود و هەروەها بەنوختنصر بووە کە لە ڕاستیدا ئەمە وتەیەکی مێژوویە و لە زانایانی مێژووی ئیسلامیەوە هاتووە لە کتێبی مێژووی تەبەری لەلایەن (موجاهید، موقاتیل و سەدی) ئەم وتە مێژووییە ئەگەر بڵێین حوکمڕانی هەموو جیهانیان کردوە، وتەکە زۆر دەقیق نییە و دەچێتە بواری خورافە، بەڵام ئەگەربە دیوێکی تردا لێکبدرێتەوە بەواتای بەهێزترین دەسەڵاتی سەردەمی خۆی، چونکە لەکاتی حوکمڕانی حەزرەتی داوود دا دەیان دەوڵەت و هێزی تر هەبووە، لەوانە میزۆپۆتامیا، میدەکان، هیندەکان، میسرییەکان، توباییەکان کە ناوچەی ئاسیای ڕۆژهەڵاتە...هتد.

بەڵام دەکرێت بڵێین حەزرەتی داوود لە دەسەڵاتەکەیدا فەرمانڕەوایی بەهێز بووە و هیچ هێزێک لەو هێزانەی چواردەوری توانای بەرەنگار بوونەوەی دەوڵەت و سوپای حەزرەتی داوودیان نەبووە. ئەمەش زیادە ڕۆیی نییە، بەڵکو ڕاستی حاشا هەڵنەگرە ئەگەر نموونەی حەزرەتی سولەیمان وەربگرین لە داهاتوودا باسی دەکەین، بەو هەموو هێز و دەسەڵاتەیەوە (هودهود) هەواڵی ناوچەی سەبەئی بۆ دەهێنێت کە ئاگایی لە دەسەڵات و حوکم و سوپا و هێزیان نەبووە، بەڵام لەوان بەهێزتر بووە و کە داوای کردووە چوونەتە ژێر ڕکێفی هەروەها

میسر و ناوچەکانی تری میزۆپۆتامیا لێی ترساون بە فەرمانی جەنابی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ جووڵاونەتەوە.

ئەگەر نموونەی دوو دەسەڵاتە کافرەکەیش وەربگرین نەمرود و بنوختنصر ئەوانیش هەروابوون یاخود دەکرێت بڵێین لە خاک و سنوری خۆیدا هیچ هێزێک توانای بەرەنگار بوونەوەی نەبووە ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر مەعقول و لۆژیکە.

کەواتە موڵکی حەزرەتی داوود عَلَيْهِ السَّلَامُ لە شام و ناوچەکانی دەوروبەریدا بووە وەکو سینا و بەشێکی سوریا و میزۆپۆتامیا و ناوچەکانی ئەنادۆڵ دەکرێت بڵێین تاکە هێزی بەهێزی سەردەمی خۆی بووە.

تا ئەم ساتەوەختەش کیانی زایۆنیزم لە وڵاتی فەڵەستین کە ئەستێرەی داوودی کردۆتە لۆگۆ و ڕەمزی ئاڵاکەی و دوو هێڵی شین لە خوار و سەرەوە هەیە، مەبەست پێی موڵکی داوود و سولەیمانە لە فوراتەوە بۆ نیل خودی ئەستێرەکەش وڵاتی فەڵەستینە یاخود مزگەوتی قودسە کە ئەوان پێی دەڵێن هەیکەل.

## تایبەتمەندییەکانی حەزرەتی داوود عَلَيْهِ السَّلَامُ

حەزرەتی داوود لە بەندایەتیدا چێژی تایبەتی وەرگرتووە ئەم پێغەمبەرە عەزیزە ڕۆژێک بە ڕۆژو بووە و ڕۆژێک ئاسایی واتا هەموو ڕۆژنارۆژێک بە ڕۆژو بووە، ئەم ڕۆژوە خوای گەورە زۆر پێ خۆشە، هەروەها شەونوێژی بەردەوام بووە (ئەو جۆرە نوێژەش خوای گەورە زۆر پێی خۆشە) تا نیوەی شەو خەوتووە سێ یەکی شەونوێژ و سوجدەی بۆ خوای پەروەردگار بردووە، ئەم باسانە نارواتە بواری مێژووی ژیانی بەڵکو بووە بۆ شەریعەت بۆ ئومەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەم زانیاریانە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆی باس کردووین کە ڕاستگۆترین مرۆڤە.[٣٦]

خوای پەروەردگار لە قورئان دا وەکو ئاماژەمان پێداوە کە ناردوویەتی بۆ حەزرەتی داوود و ناوی زەبور بووە ﴿وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا۝﴾، لای ئەهلی کیتاب بەناوی (مزامیر) ناودەبرێت، ئەمەش بەچەند قەسیدە و موناجاتێک دەوترێت کە لە هاوشێوەی شیعر و هۆنراوەی ئاینی هۆنراوەتەوەو ئاوازی بۆ دانراوە بە مۆسیقا و پیانۆ سرود و بەستەی ڕۆحی بۆ دەبێژن و خوای خۆیان بە بەرز ڕادەگرن، هەموو کڵێسا و جێگاکانی یەهود هەر ئەو مەزامیرانەی داوود بەکار

---

[٣٦] ففي الصحيحين واللفظ للبخاري أن رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ قال: أحب الصلاة إلى الله صلاة داود، وأحب الصيام إلى الله صيام داود، وكان ينام نصف الليل ويقوم ثلثه وينام سدسه، ويصوم يوماً ويفطر يوماً.

دەهێنن کە بریتییە (هەمان، ئەتهان، سولەیمان، ئەساف، جدوتهن، موسا و کوڕانی قورح) ئەمانە لای یەهود و نەسارا بەو شێوەیەیە، بەڵام لای ئەهلی ئیسلام جۆرێکی تر باس دەکرێت پێغەمبەری خوا دەنگی حەزرەتی داوودی با ئامێری مۆسیقا ناوزەد کردوە کە نیشانەی دەنگ خۆشییەتی، هاوەڵانی خۆی بەدەنگی داوود و خانەوادەکەی چواندووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە دەنگی ئەبو موسای ئەشعەری بوو قورئانی دەخوێند فەرمووی دەنگت لە هاوشێوەی خۆشی دەنگی داوود خانەوادەکەیەتی.[٣٧]

هەروەها لەکاتی دوعا کردنیدا فەرموویەتی:

پەروەردگارا داوات لێ دەکەم و خۆشم دەوێت داوای خۆشەویستی ئەوەی خۆشی دەوێت و ئەوەی بەکاری جوان و خۆشەویستی لێت نزیک دەبێتەوە خۆشەویستی من بۆ ئەوان و خۆشەویستی ئەوانیش بۆ من داوات لێ دەکەم، پەروەردگارا خۆشەویستی زاتی بەرزت لام خۆشەویست بکە لە خۆم و ماڵومنداڵ و کەسوکار و لە ئاوی ساردیش لەکاتی تینویەتیدا!

هەڵبەت مرۆڤ کاتێک کە زۆر تینوی دەبێت لە حاڵەتی مەرگدایە و ئاوی سازگار و ساردی دەست دەکەوێت بۆ خواردنەوە خۆشترین حاڵەتە، ئەم فەرموودانە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی گێراوینەتەوە.[٣٨]

هەروەها زانایانی مێژووی ئیسلامی هەندێک وتەی جوانی و پڕ حیکمەتی داوودیان بۆ یاداشت کردووین و ئیبن کەثیر لە ژیانی پێغەمبەران دا تۆماری کردووە لەوانە:

ئیبن عەساکیر دەڵێت: داوود فەرموویەتی بۆ هەتیوان باوکێکی بە بەزەیی بە، چونکە ئەوەی ئەیچێنێت هەر ئەوە دروێنە دەکەیت.

هەروەها دەڵێت: داوود فەرموویەتی وتار بێژی نەزان و جاهیل وەکو ئەوە وایە گۆرانی لەسەر سەری مردوو بڵێیت.

---

[٢٧] عن أبي موسى الأشعري رضى الله عنه أنه كان جالسا في المسجد الرسول ليلا يقرأ القرآن وكان جميل الصوت، فقال له النبي ﷺ (يا أبا مُوسَى لقَدْ أُوتِيتَ مِزْمارًا مِن مَزامِيرِ آلِ داوُدَ) صحيح البخاري، رقم (٥٠٤٨)، مسلم (٧٩٣).

[٢٨] يقول النبي ﷺ كان من دعاء داود يقول: اللهم إني أسألك حبك وحب من يحبك، والعمل الذي يبلغني حبك، اللهم اجعل حبك أحب إلي من نفسي وأهلي، ومن الماء البارد. الترمذي، رقم (٣٤٩٠).

هەروەها حەزرەتی داوود عَلَيْهِ السَّلَامُ دەفەرموویت: خراپترین هەژاری ئەوەیە کە لە ڕابردوودا دەوڵەمەند بووبیت، هەروەها خراپترین گومڕای و سەر لێشێواوی ئەوەیە کە هیدایەت و ڕێنمویت وەرگرتبێت و پاشان گومڕا بووبێتەوە.

هەروەها گوایە لەکاتی مردنیدا داوای کردووە کە لە سوجدە مەلەک و مەوت گیانی بکێشێت یان دەڵێن لە پڕ وەفاتی کردووە لە ڕۆژی شەممەدا.

## ڕووداوی ژیانی حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ

ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە ١٦ جار ناوی لە قورئان دا هاتووە، کوڕی حەزرەتی داوودە سەلامی خوایان لێ بێت، خوای گەورە دەفەرموێت سولەیمان بووە جێنشینی باوکی واتا بە ویراسی پێغەمبەرایەتی لە باوکییەوە بۆ ماوەتەوە، هەروەک چۆن باوکی زانستی ئەوەی هەبووە کە ئاخافتن لەگەڵ باڵندە بکات، ئەوەی بۆ بەجێ ماوە هەروەها پادشایەتی لە باوکییەوە بۆ ماوەتەوە.

﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾﴾ النمل

واتە: سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ بوو بە میراتگری داوودی باوکی عَلَيْهِ السَّلَامُ ، واتە: لە زانیاری و پێغەمبەرایەتیدا نەک لەماڵدا لەبەر ئەوەی پێغەمبەران کەس نابێ بە میراتگری ماڵیان، ئەگەر ماڵ بوایە سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ تایبەت نەکرا چونکە داوود عَلَيْهِ السَّلَامُ منداڵی تریشی هەبووەو خێزانیشی زۆر بووە. سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی خەڵکینە خوای گەورە ئەوەی بە ئێمە بەخشیوە کە لە زمانی باڵندە تێ بگەین کاتێک کە قسە دەکەن هەر شتێکیش کە پێویستمان بێ خوای گەورە پێی بەخشیوین لە زانست و زانیاری و پێغەمبەرایەتی و حیکمەت و ژێربار کردنی جن و مرۆڤ و باڵندەو با و زانین و تێگەیشتن لە زمانی باڵندەو گیانلەبەران و ئەو شتانە بە دڵنیایی ئەمە فەزڵێکی زۆر ئاشکرای خوای گەورەیە بەسەر ئێمەوە﴿١٦﴾

نەسەبی بریتییە: سولەیمان کوڕی داوود کوڕی ئەیشا کوڕی عەوید... هەتاکو ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ کە لە ڕابردوودا ئاماژەمان پێداوە.

پێغەمبەران ویراسەتی ماڵوسامان ناگرن، حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ سەروەت و سامانی نەگرتووە لە حەزرەتی داوود عَلَيْهِ السَّلَامُ، ویراسەتەکە هەموو بریتییە لە زانست و پێغەمبەرایەتی و دەسەڵاتی قیادی وەکو پادشا، نەک موڵک و سامانی وڵات ببێتە خاوەنی، بەڵکو هەردوو

پێغەمبەرەكە داوود و سولەیمان سەلامی خوایان لێ بێت كاریان كردووە و ئاسنگەر بوون. لەدوای مردنیان هیچ ماڵوسامان و ئاڵتون و پارەیەكیان لێ بەجێ نەماوە.

هەر ئەمەش وای كردووە لە گەلی ئیسرائیل لەدوای مردنی موسا و هارون زۆرترین كاریگەری و ناڕەحەتی و خەم و خواردنیان بۆ حەزرەتی داوود بووە كە وەفاتی كردووە.

## دەرکەوتنی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ لە گۆڕەپانی ڕووداوەکاندا

حەزرەتی داوود کوڕی زۆر بووە، کوڕەکانی دابەش بووبوون بەسەر بەرپرسیارێتیدا هەریەکەو لە سێکتەرێکدا، بەڵام یەکێک لە کوڕەکانی ناوی سولەیمان-ە و لەو خێزانەیەتی کە ناوی (ئوریا)یە، هەمیشە لە مەجلیسەکەیدا بوونی هەبووە، واتا سولەیمان هەمیشە لە مەجلیسی داوودی باوکیا بووە.

شەوێک ڕانە مەڕێک دەکەونە ناو کێڵگەیەکەوە شوانەکەیان ئاگای لێ نابێت و بەتەواوەتی ئەو کێڵگەیە وێران دەکەن و هەموو بەرهەمی جوتیارەکە لەناو دەچێت، خاوەنی کێڵگەکە سکاڵا بۆلای حەزرەتی داوود، پێی دەڵێت ئەی پێغەمبەری خوا خاکی خۆمان کێڵاوە هەرچیمان هەبووە لەناو زەویدا چاندوومانە، ئەوەی لە تواناماندا بوو بۆ چاکسازی کێڵگەکە ئەنجامداوە تا ئەو ڕۆژەی وادە و کاتی دروێنەی بووە، بەڵام ڕانە مەڕی ئەو عەشیرەتە کەوتۆتە ناوی هەموو کێڵگە و بەرووبوومەکەی خراپ کردووە و بڵاوبوونەتەوە بەشی زۆری خوراوە، هیچ بۆ ئێمە نەماوەتەوە.

حەزرەتی داوود خاوەن مەڕەکان بانگ دەکات بۆ لێپێچینەوە، ئەوەی جوتیارەکان دەیڵێن ڕووبەڕووی خاوەن مەڕەکانی دەکاتەوە، ئەوانیش هەموو دەڵێن وایە و ڕاستە.

پاشان حەزرەتی داوود دەپرسێت نرخی کێڵگەکەتان چەندە لە جوتیارەکان؟

جوتیارەکان بەرووبوومەکەیان مەزەندە دەکەن بە نرخێک بە داوود نرخەکەی دەڵێن.

هەروەها بە خاوەنی مەڕەکان دەڵێت مەڕەکانتان بەچەند مەزەندە دەکەن؟ بەهەمان شێوە خاوەن مەڕەکانیش نرخێک ئەدەن بە حەزرەتی داوود. نرخی هەردوولا لەیەک نزیک دەبێت، حەزرەتی داوود وا داوەری دەکات کە دەبێت مەڕەکان بدرێتە خاوەنی کێڵگەکان بۆ قەرەبووکردنەوەی زیانەکانیان لە کێڵگەکەدا، واتا کورت و پوخت ڕانەمەڕەکان هەموو بۆ جوتیارەکان بێت.

لەوکاتەدا حەزرەتی سولەیمان لەناو مەجلیسی داوەریەکەی باوکییدایە و باوکی ئاگادار دەکاتەوە کە پێشنیارێکی تری هەیە، پێشنیارەکە دەخاتە بەردەمی باوکی، حەزرەتی سولەیمان دەڵێت: ئەگەر ئاژەڵدارەکان ڕانەمەڕەکە بدەنە دەست جوتیارەکان، جوتیارەکان لە بەرووبوومی ڕانە مەڕەکە بخۆن چ شیرەمەنی و چ خوریەکەی خاوەن و مەڕەکانیش بکەونە ناو کێڵگەکە و بیکێڵن و تۆوی تێدا بڕوێنن و خزمەتی بکەن تا کاتی دروێنە، کە کاتی دروێنە هات بە پێچەوانەوە ئەوانیش ڕانەمەڕەکە بگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکانی، هیچ لا زەرەرمەند نابن و

هەمووولاکان سەربەسەر لێی دەردەچن، هەموو لاکان بەمە ڕازی بوون، تێکڕا بڕیاری ڕازی بوون درا.

داوودیش ڕازی بوو بە پێشنیاری سولەیمان و فەرمووی باش پێکاوتە، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ وَكُنَّا لِحُكۡمِهِمۡ شَٰهِدِينَ ۝٧٨ فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَۚ وَكُلًّا ءَاتَيۡنَا حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَسَخَّرۡنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلۡجِبَالَ يُسَبِّحۡنَ وَٱلطَّيۡرَۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ۝٧٩﴾ الأنبياء

واتە: داوودو سولەیمان پێغەمبەر سەلامی خوای گەورەیان لێ بێت کاتێک بڕیاریاندا سەبارەت بە کشتوکاڵ و کێڵگەیەک کاتێک کە بەشەو مەڕی کەسانێک چووە ناو کێڵگەو زەرعاتی کەسانێکی ترەوەو خواردیان و لەناویان برد ئێمەش ئاگاداری بڕیاردانی ئەوان بووین۝٧٨ بەڵام ئێمە ئەم حوکم و بڕیارەمان لە سولەیمانعَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ تێگەیاند، داوود وتی: با مەڕەکان هەمووی بۆ خاوەن کشتوکاڵەکە بێ لەبەر ئەوەی زەرعاتەکەیانی خواردووە، بەڵام سولەیمان عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ فەرمووی: نەخێر با مەڕەکان لای خاوەن زەرعاتەکە بێ ئەوانیش زەرعاتەکەیان بۆ چاک ئەکەن تا ئەو کاتەی زەرعاتەکە پێ ئەگاتەوە ئەمان لە بەرووبوومی مەڕەکان بخۆن دوایی زەرعاتەکەیان پێ گەیاند مەڕەکانیان بدەنەوەو زەرعاتەکەیش بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە بە چاککراوی، خوای گەورەش ئەفەرمووێ: بەم شێوازە ئێمە سولەیمانمان عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ فێر کردو تێگەیاند (جارێکی تر دوو ژن دوو کوڕیان پێ بوو گورگ یەکێکیانی برد هاتنە لای داوودعَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ منداڵەکەی دا بە ژنە گەورەکە، سولەیمان فەرمووی چەقۆیەکم بۆ بێنن لە نێوانتاندا ئەم منداڵە دەکەمە دوو بەشەوە یەکی بەشێکی بەرن، ژنە بچوکەکە وتی بیدە بەو منداڵی ئەوە، بەمەدا بۆی دەرکەوت منداڵی ژنە بچوکەکەیەو دای بەو) هەر یەکێک لەوانەش پێغەمبەرایەتی و زانست و زانیاریمان پێ بەخشین کاتێک داوود زەبوری بخوێندایەو تەسبیحات و زیکری خوای گەورەی بکردایە ئەوەندە دەنگی خۆش بوو شاخەکان و باڵندەکانیش لەگەڵیدا زیکری خوای گەورەیان ئەکرد ئەوەی کە بمانەوێ ئێمە ئەنجامی ئەدەین۝٧٩

لێرەدا سولەیمان دەرکەوت لە ڕووداو و گۆڕانکاریەکانی ناو گەلی ئیسرائیل دا دیارە باوکی بەڕێزی حەزرەتی داوود زانیویەتی شیاوە بۆ ئەو جێگایە، بە دڵنیاییەوە هەڵبژرادەی خوای پەروەردگارە لە سەرو هەموویەوە.

## چوار موعجیزەکەی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ

گەلی ئیسرائیل گەلێکی زۆر ماددی و گەمژە بوون، ماددی بوون حەزیان بە بەرجەستەی هەموو شتێک دەکرد لە ئاینەکەدا، پاشان گەمژە بوون بەوەی کە داوای موعجیزەیان دەکرد، ئەو هەموو موعجیزەیان دەبینی کەچی داوای زیاتر و زیاتریان دەکرد لە موعجیزە لە پێغەمبەرەکانیان بە گشتی خوای پەروەردگار چوار موعجیزەی بەخشیووە بە حەزرەتی سولەیمان.

١. ئاخافتن و گفتوگۆ لەگەڵ ئاژەڵ و خشۆک و باڵندەدا، خوای پەروەردگار دەفەرموێت:
﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَانُ دَاوُودَ وَقَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيْءٍ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْفَضْلُ الْمُبِينُ ﴿١٦﴾﴾ النمل

واتە: سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ بوو بە میراتگری داوودی باوکی عَلَيْهِ السَّلَامُ ، واتە: لە زانیاری و پێغەمبەرایەتیدا نەک لەماڵدا لەبەر ئەوەی پێغەمبەران کەس نابێ بە میراتگری ماڵیان، ئەگەر ماڵ بوایە سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ تایبەت ناکرا چونکە داوود عَلَيْهِ السَّلَامُ منداڵی تریشی هەبووەو خێزانیشی زۆر بووە سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی خەڵکی خوای گەورە ئەوەی بە ئێمە بەخشیوە کە لە زمانی باڵندە تێ بگەین کاتێک کە قسە دەکەنهەر شتێکیش کە پێویستمان بێ خوای گەورە پێی بەخشیوین لە زانست و زانیاری و پێغەمبەرایەتی و حیکمەت و ژێربار کردنی جن و مرۆڤـ و باڵندەو با و زانین و تێگەیشتن لە زمانی باڵندەو گیانلەبەران و ئەو شتانە بە دڵنیایی ئەمە فەزڵێکی زۆر ئاشکرای خوای گەورەیە بەسەر ئێمەوە﴿١٦﴾

بێجگە لەوەی کەوتووێژی لەگەڵ دەکردن لەهەمانکاتدا لەبەردەستی دا خوای گەورە ڕامی کردبوو بۆی ڕاهێنابوو، واتا موسەخەری کردبوو.

٢. ڕامکردن و موسەخەر کردنی جنۆکە (پەری) لە بەردەستیدا بە کافرو موسڵمانیانەوە، کافرەکانی شەیتانەکان بوون خەڵکی لەوانەیە بڵێن ئەی ئەو پێغەمبەر بووە بۆچی شەیتانەکانی موسڵمان نەکردووە و بڕوای پێ بهێنن؟

لەوەڵامدا دەڵێین: مرۆڤ کە لە سەردەمی پێغەمبەرەکەیاندا ژیاون موسڵمان نەبوون، بەڵام پێکەوە ژیان هەر هەبووە لە نێوان مرۆڤی کافر و دینداردا، جنۆکەکانیش بەگشتی لەبن دەستیدا ڕام هاتبوون، ئەوەی بڕوای هێناوە جنۆکەی پێدەوترێت ئەوەی کافرە لە جنۆکە پێیدەوترێت شەیتان، جا وەرگرتنی ئیمان بە زۆر نییە.

٣. خوای گەورە ڕەشەبای بۆ ڕامهێنابوو، واتا ئەویش موسەخەر (ڕام) بوو لەبەردەستیدا خوای گەورە لە قورئان دا باسی جنۆکە و ڕەشەباکەمان بۆ دەکات دەفەرموێت: ﴿وَلِسُلَيْمَانَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ ٱعْمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾﴾ سبأ

واتە: سولەیمان پێغەمبەریش عَلَيْهِ السَّلَامُ که کوڕی داوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ بوو خوای گەورە بای بۆ ژێربار کردبوو لە ژێر دەسەڵاتیدا بوو بە بەیانیان ماوەی مانگێک ڕێی دەبڕی و ئەڕۆی، بە ئێوارانیش ماوەی مانگێک ڕێی دەبڕی و ئەڕۆی، واتە لە ڕۆژێکدا ماوەی دوو مانگ ڕێی دەبڕی و بە وڵاتاندا دەگەڕا و بایەکە هەڵیدەگرت و دەیبرد مسیشمان بۆی نەرم کردبوو چۆن ئاسنمان بۆ داوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ نەرم کردبوو، جنیەکانیشمان ژێربار کردبوو خستبوومانە ژێر دەسەڵاتیەوە کە ئیشیان بۆی ئەکرد بە ئیزنی خوای گەورە، هەر کەسێک لەو جنیانە بێ ئەمری سولەیمان پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ بکات، ئەوە لە دونیادا سزای ئەدەین و لە قیامەتیشدا ئەیخەینە ناو ئاگرێکی سووتێنەرەوە﴿١٢﴾ ئەو جنیانە ئیشیان بۆ سولەیمان پێغەمبەر ئەکردو ئەوەی کە ویستی لێ بوایە بۆیان دروست دەکرد لە کۆشکی گەورە، یاخود مزگەوت، یاخود میحرابی مزگەوت، پەیکەریشیان بۆی دروست ئەکرد کە لە شەریعەتی ئەوان دروست بووەو لە شەریعەتی ئێمەدا حەرام کراوەو زۆر فەرموودەی لەسەر هاتووە قاپ و مەنجەڵی زۆر گەورەشیان بۆ دروست ئەکرد وەکو حەوزی حوشتر چەندێک گەورەیە ئاوا گەورە بۆیان دروست ئەکرد تا خەڵکێکی زۆر خواردنی لەسەر بخواتقاپی زۆر گەورەیان دروست ئەکرد کە لەبەر گەورەیی هەڵنەئەگیراو جێگیر بوو لەسەر زەویەکە دانرابوونەی ئالی داوود زۆر سوپاسگوزارو شوکرانە بژێری خوای گەورە بکەن لەسەر ئەو هەموو نیعمەتەی کە پێی بەخشیوون، داوود پێغەمبەر شەونوێژی دەکردو ڕۆژنارۆژێک بە ڕۆژوو دەبوو، لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا هەرگیز هەڵناهات و ڕاینەکرد، بەڵام کەمێک هەن لە بەندەکانی من کە شوکرانەبژێری من ئەکەن﴿١٣﴾.

٤. نەرمکردنی ئاسن لە بەردەستی و ئەندازیاری دروستکردنی چەک کە لە ئایەتی ١٢ی سورەتی سبأدا ئاماژەی بۆ کردووە خوای پەروەردگار.

لەگەڵ ئەم هەموو موعجیزەدا خوای گەورە زانستی بەخشیبوو بە سولەیمان و باوکی،.جۆری زانستەکە چییە و چۆنە لە قورئان دا ئاماژەی بۆ نەکراوە، واتا مەبەست بێجگە موعجیزە و کاری پیشەی پێغەمبەرایەتی لێرەدا کە وەکو پیشە ناوی دەبەین بەواتای فەرمانێکی خوای پەروەردگار.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ عِلْمًا ﴿١٥﴾﴾النمل

واتە: بە دڵنیایی ئێمە زانیاری و پێغەمبەرایەتی و پەیاممان بە داودو سولەیمانی کوڕی بەخشی کە هەردووکیان پێغەمبەری خوا بوون.

حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ لەدوای ئەو هەموو بەخشینە لەناو گەلی ئیسرائیل دا بۆ هەموو جیهانی ئەوکاتە کە لە ڕووباری نیل تا ڕووباری فورات لە بەردەستیدا بوو، ویستی مانۆڕێکی سەربازی بەهەموو سەربازەکانی بکات لە جنۆکە و باڵندە و ڕەشە با کە هەموو ئەمانە لە ژێرفەرمانی سولەیمان دا بوون، بە ویست و ئیرادەی خوای پەروەردگار، بێجگە زانستی ئیدارە و ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی حوکم، پێدەچێت خۆی پەروەردگار زانستی دنیای پێبەخشیبن، وەکو ئەندازیاری لەبواری بیناسازی و ئەندازیاری لە بواری چەک دروستکردنی جۆری چەکی هێرش بەر و خۆپارێزەر، باوکی خاوەنی سێ خەسڵەتی گرنگ بوو کە هەمووی بەجێهێشت بۆ سولەیمان بە زمانی باڵندە و ئاژەڵەکان هەمووی ئەدوا، خوای گەورە دەفەرموێت: وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيْءٍ ﴿١٦﴾ النمل

واتە: هەر شتێکیش کە پێویستمان بێ خوای گەورە پێی بەخشیوین لە زانست و زانیاری و پێغەمبەرایەتی و حیکمەت و ژێربار کردنی جن و مرۆڤ و باڵندەو با و زانین و تێگەیشتن لە زمانی باڵندەو گیانلەبەران و ئەو شتانە.

پاشان بەڵگەی زیاتر لەسەر ئەوەی توانای ئاخافتنی هەموو ئاژەڵ یاخود گیاندارێکی هەبوو، لە وتەی مێرولە تێگەیشتووە کە لە خشکۆکەکانە، کاتی ڕێکخستن و مانۆڕی سەربازی دێت و مانۆڕێک بە هەموو سوپاکەی دەکات سولەیمان.

## مانۆڕی سەربازی سوپاکەی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ

سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ بڕیاریدا مانۆڕێکی سەربازی بە هەموو سەربازەکانی بکات، پێش چوونە ناوباسی ئەم سەربازانە پێویستە ئەوە ڕوونبکەینەوە کە سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ هەموو ئاژەڵ و گیاندار و باڵندەی لەژێر دەستدا نەبووە، یاخود هەموو شەیتان و جنۆکە، لەو جۆرە مەخلوقانە بەشێک هۆزێک لە طائیفەیەکی لەژێر فەرماندا بووە، لەناو ئەو بەش و هۆز و طائیفانەدا جا چ گیانداران بن یان پەلەوەر و باڵندە یاخود جنۆکە یان مرۆڤ، سولەیمان نوخبەی هەڵبژاردوە لێیان هەروەکو (هودهود) کە بەکوردی پێی دەڵێن (پەپوو) کە ناوی سولەیمان هات لەگەڵیدا واتا هودهودەکەی سولەیمان، یاخود وەکو کورد دەڵێت پەپوو سلێمان کە قسەی لەگەڵ دا کردووە لەگەڵ سولەیمان دا.

کەواتە لەناو ملیۆنەها پەپووسلێمانکە یاخود هەموو گیاندارانی تر لە ژێر ڕکێفی سولەیمان دا نەبوون، هەروەکو چۆن خوای گەورە وای کرد لە سولەیمان گوێی لەو تەنها مێرووڵەیە بێت،

خۆی گوێی لەهەموو مێرولەیەک نەبووە یاخود جنۆکە تەنها کۆمەڵێک لە هۆز و طائیفە جنۆکە و شەیتانەکان لەبن ڕکێفی و فەرمانی دابوون و ڕامی کردبوون.

کەواتە هەروەکو جەنابی سەید قوطب دەڵێت: دەڵێن خوای پەروەردگار بۆ حەزرەتی سولەیمان کۆمەڵێک لە جنۆکە و باڵندە و مرۆڤی بۆ موسەخەر (ڕام) کردووە، نەک هەموو گیاندار و جنۆکە و باڵندەی جیهان.[٣٩]

خوای پەروەردگار دەفەرمویت: ﴿وَحُشِرَ لِسُلَيْمَٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ﴿١٧﴾﴾ النمل

واتە: هەرچی سەربازی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَام بوو هەر هەموویان کۆ کرانەوە لە جنی و مرۆڤ و باڵندەش لە بان سەریانەوە ئەڕۆیشت ئەوان بە یەك پۆل ئەڕۆیشتن کەس پێش و دوا نەئەکەوت و پۆل و سەفەکانیان هەمووی ڕێك بوو وەکو مانۆڕی سەربازی.

وشەی ﴿يُوزَعُونَ﴾ بەواتای هەموو بەتالیۆن و بەش و تیپی سەربازەکانی لای خۆی دەهێشتەوە تا هەموو ئامادە دەبوون، واتا توانا و هێزی کۆنترۆڵ کردنی هەبوو بەسەر سوپاکەیدا پاشان لە سەرقاڵی بە مانۆڕەکەوە لەپڕ گوێی لە دەنگێکە دەڵێت بڕۆنە ناو ماڵوکونەکانتان تاوەکو سوپای سولەیمان ئەتانشکێنن و لەناوبچن!

## دەنگی مێرولەیەک و دڵ شادبوونی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَام

سولەیمان لەسەرگەرمی ڕێکخستن و خۆپیشاندانی سوپاکەیدا لە دۆڵێکدا بەناوی دۆڵی مێرولەوە ناونراوە، یاخود لەدوای ئەو ڕووداوە ئەو ناوەی وەرگرتووە یاخود بەجێگا و شوێنی خودی مێرولەکان دەوترێت دۆڵی مێرولە، حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَام گوێی لە قیادەی مێرولەکانە ئەوانیش خاوەن سیستەم و ڕێکخستن و شاژنی پورەکانی خۆیان، بەهەمانشێوە مێرولەش هەمان سیستەم و ڕێکخستنیان هەیە.

---

[٣٩] قال شهيد سيد القطب (رحمة الله): نقول إن الله سخر سليمان طائفة من الجن و طائفة من الطير كما سخر له طائفة من الإنس./في ظلال القرآن، تفسير سورة النمل، ص. ٢٦٣٥، ج. ٥

حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ دڵشاد بوو زەردەخەنە گرتی کە خوای پەروەردگار ئەو نیعمەتەی پێبەخشیووە، مرۆڤێک لەوپەڕی سەرقاڵی دەنگی ئاژەڵ و مرۆڤ و ئەسپ و قیژەوچریکەی باڵندە...هتد دوای گوێ لە بچوکترین مەخلوقە و دەنگی دەبیستێت، لە ڕاستیدا جێگای دڵخۆشییە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوۡاْ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمۡلِ قَالَتۡ نَمۡلَةٞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ۝١٨ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكٗا مِّن قَوۡلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَدۡخِلۡنِي بِرَحۡمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ۝١٩﴾ النمل

واتە: تا بەلای شوێنێکدا تێپەڕین شارە مێرووولەیەکی لێ بوو یەکێک لە مێرووولەکان وتی: ئەی مێرووولەکان خێراکەن بڕۆنە ناو ماڵەکانی خۆتانەوە تا سولەیمان و سەربازەکانی نەتانشێلن و لەناوتان نەبەن، لە کاتێکدا کە ئەوان هەست ناکەن و ئاگایان لە خۆیان نییەو ئێوە نابینن ۝١٨ سولەیمان زەردەخەنە گرتی و پێکەنی لە قسەی ئەم مێرووولەیە لەبەر ئەوەی لێی تێگەیشت فەرمووی :ئەی پەروەردگار ئیلهامم پێ ببەخشە تا بتوانم شوکرانەبژێری تۆ بکەم لەسەر ئەم نیعمەتەو سەرجەم نیعمەتەکانی تر کە بە من و دایک و باوکمت بەخشیوە تا کردەوەی چاک بکەم و تۆ لێم ڕازی بیت بەڕەحمەتی خۆت بمخەرە ناو کۆی بەندە چاکەکانت و لەگەڵ ئەواندا حەشرم بکە و لەگەڵ ئەوان بمخەرە بەهەشتەوە ۝١٩

لێرەدا ئەگەر مرۆڤ بەچاوی ئیمان وخواناسی تەماشای ڕووداوەکان بکات نەک بەسەرسامییەکەوە لەبیرکردنەوەی لەگەڵدا نەبێت، توانا و عەزەمەتی خوای پەروەردگار کە سولەیمانی وا لێکرد لە سەرقاڵی خۆیدا ئاگای لە مێرولە و شارە مێرولەیەک بێت و سەرکردەی مێرولەکان بڵێت خۆتان حەشار بدەن نەکو سوپای سولەیمان بتانشێلن و لەناو بچن، خوایەک ئەو کەمە دەسەڵاتەی لەم گەردوونەی داوەتە مرۆڤێکی خۆی ئاگای لە خشتەی مارومێرووە (سبحان الله) هەموو پاک و بێگەردی و توانا و هێزێک شایستەیە بەخوای پەروەردگار.

چیرۆکی مێرولەکە کۆتایی هات و بگەڕێینەوە بۆناو ڕووداوەکانی مانۆڕە سەربازییەکە، لەڕاستیدا تەنها بۆ دەرخستنی گەورەیی و عەزەمەتی خوای موتەعالە کە سەرنجمانی پێ ڕاکێشا.

سولەیمان بەردەوامە لە مانۆڕەکەی تەماشا دەکات یەکێک لە سەربازەکانی دیار نییە ئەمەش لە بواری سەربازیدا جێگای نابێتەوە چۆن دەبێت ئەم سەربازە لە جێگای خۆییدا نەبێت، لە کاتێکدا خودی پادشا و پێغەمبەرێک سەرپەرشتی مانۆڕە سەربازیەکە دەکات.

## پەپووەکە و سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ

سولەیمان تەماشا دەکات یەکێک لە سەربازەکانی ناو سەربازگەی دیار نییە، ئەو کەسایەتییە بۆ خۆی دەزگایەکی تایبەتە وەکو دەزگای زانیاری سەربازی هەژمار دەکرێت کە لە داهاتوودا بۆمان دەرەکەوێت بۆچی ئامادەی ناو مانۆڕە سەربازییەکە نەبووە؟

سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ هەواڵی پەپووەکەی دەپرسێت، بەڵام دیار نییە خوای گەورە دەفەرموێت: وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَالِيَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ۝ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ۝ النمل

واتە: سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ بەدوای باڵندەی هودهود دا (پەپو سولەیمان) گەڕا نەیدۆزیەوە فەرمووی: ئەوە چیە بۆچی هودهود نابینم یاخود ئەو لە ئامادە نەبوانە۝

بەدڵنیایی دەبێت سزایەکی زۆر سەختی بدەم (پەڕەکانی هەڵکێشم)یان ئەوەتا سەری ئەبڕم یان ئەبێ بەڵگەیەکی ئاشکراو عوزرێکم بۆ بێنێ لەسەر ئەوەی کە بۆ دیار نەبووە۝

لێرەدا پەپووەکە گرنگی خۆی هەیە، بۆیە فەرمانی ملهەڵکێشان سەربڕینی ئەدات، چونکە لەکاری سەربازیدا نەمزانی و نەمتوانی و ئاگام لێ نەبوو لەبواری سەربازی جێگای بیانوو هەنجەت نییە، هەروەها سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ خاوەن حەزم و جدییە لەبواری سەربازیدا بۆیە بەدوای بەڵگەدا دەگەڕێت بۆ ون بوونەکەی ئەگەر بەڵگەی باشی پێ نەبێت ئەوا توشی سزای مردن و لەناوچوون دەبێتەوە، لەوانەیە بەهۆکاری دیارنەمانی کەسایەتیەکی ناو مانۆڕەکە زانیاری دزە بکاتە لای دوژمن و مانۆڕ و ئۆپەراسیۆنی مانۆڕەکە تێک بچێت ئەمەش کارەساتی زۆر گەورە دروست دەکات.

بەردەوام لەگەڵ دیمەنەکانی مانۆڕە سەربازییەکە دەبین و لەگەڵ کۆمەڵێک ئەسپی جوان کە حەزرەتی سولەیمان زۆری خۆش دەون و ڕێز و تەقدیری ئەو بەتالیۆنە دەگرێت.

چونکە لەناو ئاژەڵاندا ئەسپ جوانترینە، لە کانزاکاندا ئاڵتون جوانترینە لە مەخلوقاتدا وەکو مرۆڤ و جنۆکە و فریشتە مرۆڤ جوانترینە.

خوای گەورە ئەو دیمەنەمان بۆ باس دەکات کە سولەیمان لەگەڵ ئەسپەکانیدا چۆن بەرخوردی کردووە، چ جۆرە مامەڵەیەکی لە تەکدا کردوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَوَهَبْنَا

لِدَاوُۥدَ سُلَيۡمَٰنَۚ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ إِذۡ عُرِضَ عَلَيۡهِ بِٱلۡعَشِيِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلۡجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّيٓ أَحۡبَبۡتُ حُبَّ ٱلۡخَيۡرِ عَن ذِكۡرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتۡ بِٱلۡحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَيَّۖ فَطَفِقَ مَسۡحَۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلۡأَعۡنَاقِ ﴿٣٣﴾﴾ ص

واتە: ئێمە سولەیمان پێغەمبەرمان بە داوود پێغەمبەر بەخشی کە سولەیمان پێغەمبەر عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ باشترین بەندە بووە، زۆر بۆ لای خوای گەورە ئەگەڕایەوە﴿٣٠﴾ کاتێک کە سولەیمان پێغەمبەر عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ ئەسپی یەکجار زۆری هەبوو کە باڵیان هەبووە، (صافینات) واتە :ئەوانەی لەسەر سێ پێ ڕائەوەستن و پێیەکیان بەرز کردۆتەوە، کە ئەسپەکانی وا بوونە، (جیاد)یش واتە: ئەسپەکانی زۆر خێرا بوون لە پێشیەوە ئەڕۆیشتن بۆ جیهاد کردن وەکو مانۆڕی سەربازی﴿٣١﴾ ئەم ئەسپانە کە لە پێشێوە ئەڕۆیشتن زۆر خۆشی دەویستن، وتی: سەرقاڵیان کردم لە زیکری خوا، وتراوە: لە نوێژی عەصر تا خۆرەکە ئاوابوو خۆر دیار نەما، یاخود تا ئەسپەکان دیار نەمان و دوورکەوتنەوە هەر ئەم تەماشای دەکردن﴿٣٢﴾ وتی: ئەسپەکانم بۆ بگەڕێننەوە، وتراوە: بە شمشێر ئەیدا لە قاچ و گەردەنیان لەبەر ئەوەی ئەو ئەسپانە سەرقاڵی کرد لە زیکری خوای گەورەو لە نوێژ کردن، بەڵام ئەو بۆچوونەش تەواو نییە، لەبەر ئەوەی ئەسپەکان تاوانایان نەبووەو ئەوە ستەمەو ستەمیش لە پێغەمبەران ناوەشێتەوە، بەڵکو (مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالْأَعْنَاقِ) لە خۆشەویستیان دەستی ئەهێنا بە قاچ و مل و سەریاندا نەک بیانکوژێت و سزایان بدات ئەوان چ تاوانێکیان هەبووە﴿٣٣﴾.

حەزرەتی سولەیمان عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ بایەخی تەواوی ئەدا بە ئەسپەکان، چونکە بەربەستێکی زۆر گرنگ بوون لە بەرانبەر دوژمندا پارێزەری سولەیمان بوون لەکاتی جەنگ دا، هەموو ئەمانەش بەلایەک بەڵکو فێری هاوڕێیەتیمان دەکات لەگەڵ هەموو جۆرەکانی گیاندارانە.

لەگەڵ ئەسپەکانیدایە و دەست بەسەر و یاڵوقژیاندا دەهێنێت لە پڕ پەپوو دەردەکەوت و خۆی دەگەیەنێتەوە لای سوپاکەی و خۆی نیشانی حەزرەتی سولەیمان ئەدات، دنیایەک هەواڵی گرنگی پێیە بۆ سولەیمان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَكَثَ غَيۡرَ بَعِيدٖ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ وَجِئۡتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٖ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخۡرِجُ ٱلۡخَبۡءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُخۡفُونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ۩ ﴿٢٦﴾﴾ النمل

واتە: هودهودەکە (پەپو سولەیمانی) کاتێکی زۆری نەخایاندو هاتەوە وتی: ئەی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ زانیاریەکم دەست کەوتووە کە تۆ پێت نییەو نایزانیت، من لە (سەبەء)هوە کە شارێکە لە (یەمەن) لەوێ هەواڵێکی دڵنیاکارم بۆ هێناویت، یاخود هەواڵێکی ترسناک و مەترسیدارم بۆ هێناویت ئەویش ئەوەیە کە﴿٢٢﴾ من بینیم لە شاری (سەبەء) ئافرەتێک پاشایانە کە وتراوە: ناوی (بەڵقیسی کچی شەراحیل) بووە لە هەموو شتێکی سەردەمی خۆی ئەوەی کە پاشا پێویستی بێت لە موڵک و دەسەڵات پێی بەخشراوە عەرش و تەختێکی شاهانەی یەکجار گەورەی هەیە کە بە ئاڵتوون و دوڕڕو مرواری و ئاوریشم ڕازێنراوەتەوەو هەشتا گەز درێژە و چل گەز پانە﴿٢٣﴾ بینیم خۆی و قەومەکەی کڕنوش بۆ خۆر ئەبەن و عیبادەت بۆ خۆر ئەکەن و جگە لە خوای گەورە دەپەرستن (کۆشکێکی بەرزو پتەوی هەبووە کە سێ سەدو شەست تاقی تیادا بووە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایەوەو وا دروستکراوە کە هەموو ڕۆژێک خۆر لە تاقێکەوە هەڵبێت و لە تاقێکی بەرامبەریەوە ئاوا بێت بۆ ئەوەی بەیانیان و ئێواران کوڕنوش و سوجدەی بۆ بەرن) شەیتان ئەم کوفرەی بۆ ڕازاندنەوە کە عیبادەت بۆ خۆر بکەن هەر شەیتانە ڕێگری کردوون لە ڕێگەی ڕاستی خوای گەورە کە ئیمان بە خوای گەورە بێنن، ئەوانیش ئێستا ڕێگەی حەق نادۆزنەوە﴿٢٤﴾ شەیتان وای بۆ ڕازاندونەتەوە کە کڕنوش نەبەن بۆ ئەو خوایەی کە هەموو شتێکی نهێنی و شاراوە لە ئاسمانەکان وەکو باران و لە زەویدا وەکو دانەوێڵە دەرئەکات، هەر شتێک کە ئێوە شاردبێتتانەوەو دەری نەبڕن لە ناخی خۆتاندا یان ئەوەی دەری ئەبڕن خوای گەورە زانیاری بە هەر هەمووی هەیە﴿٢٥﴾ خوای گەورە ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێک بە حەق نییە شایەنی پەرستن بێت تەنها زاتی پیرۆزی الله نەبێ ئەو خوایەی کە خاوەن و پەروەردگاری عەرشی گەورەیە (نەهی کراوە لە کوشتنی هودهود، چونکە بانگەوازی کرد بۆ یەکخواپەرستی و نەهی کرد لە پەرستنی جگە لە خوای گەورە)﴿٢٦﴾

پێش لێپێچینەوەی سولەیمان دەست بەجێ پەپوو (هودهود) هەموو زانیارییەکانی خۆی ئاشکرا دەکات، هەواڵی گرنگ و بواری ئاینی و بواری ئابووری بۆ سولەیمان ئاشکرا دەکات.

سولەیمانیش گوێی بۆ وتەکانی (پەپوو) شل دەکات بڕیار نادات تا ڕاستی و دروستی هەواڵەکەی بۆ ئاشکرا دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ﴿٢٧﴾﴾ النمل

واتە: سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ بە هودهودەکەی فەرموو: تەماشا ئەکەین و لێی ئەکۆڵینەوە ئایا لەم هەواڵەی تۆ بە ئێمەت وت ڕاستت کردووەیان تۆ لە درۆزنانی و هەواڵەکەت ڕاست نەبووەو بۆ ئەوەتە خۆت لە هەڕەشەو سزای من بپارێزیت﴿٢٧﴾

## خاتوو بەلقیس و دارودەستەکەی لە وڵاتی (سەبەء) دا

مەملەکەتی شانشینی (سەبەء) خاکێکە لە وڵاتی یەمەن، پایەختی ئەو مەملەکەتە ناوی (مەئرەب) بووە، لەشاری سەنعائەوە ماوەی چەند شەو و ڕۆژێک بەپێ دوور بووە.

ئەو خاک و دەسەڵاتە بۆیە ناونراوە بە سەبەء، لەبەر ئەوەی سەبەئی کوڕی یەشجونی کوڕی یەعروبی کوڕی قەحطان دایمەزراندووە، ئەم خانەوادەیە لە بنەڕەتدا عەرەبن و یەکەم دەسەڵاتدارانی عەرەب بوون کە شانشینیان دامەزراندووە خاوەنی ژیار و شارستانییەت بوون.[30]

باوکی بەلقیس خاوەنی کوڕ و کچێک بووە، ئەویش دەسەڵاتی لە براکەیەوە بۆ ماوەتەوە کوڕی براکەی زۆر خوێن ڕێژو مەی خۆر بوو، بەکەڵکی دەسەڵات کردن نەهاتووە، بۆ ماوەیەکی زۆر زیندانی کردووە. کوڕەکەی خۆشی بەکەڵکی دەسەڵات بەڕێوەبردنی ئەو شانشینە نەهاتووە کەسێکی لاواز و کاریگەری ئافرەتانی لەسەر بووە، لەو دوو کەسە باشتر کچەکەی خۆی بووە، بەناوی بەلقیس بۆتە شاژنی ئەو مەملەکەتە و بەڕێوەی بردووە و لای خەڵکی شاری مەئرەب زۆر خۆشەویست بووە و گوێی بۆ گیراو بووە.

ئەم خاتوونە بەڕێزە شوی نەکردووە چەند جار کوڕە مامەکەی پێش دەستگیرکردنی لەلایەن باوکییەوە داوای کردووە باوکی بەلقیس ڕەتیان کردۆتەوە، ناوی بەلقیس لە مێژوودا هاتووە کۆمەڵێک لە ڕاڤەکارانی قورئان ناوەکەیان بەکارهێناوە. ئەم مەملەکەت و شانشینە کاریگەری وڵاتی فارسیان لەسەر بووە، ڕۆژیان پەرستووە لەگەڵ دیاردە سروشتییەکان بە گشتی.[31]

لەهەمان سەرچاوەدا هاتووە هەندێکی تر لە مێژوونووسان ئاماژەیان پێداوە، ئەم خاتوونە توانیویەتی (بەنداوی مەئرەب) دروست بکات، بە هۆکاری لافاو بەنداوەکە ڕوخاوە، خەڵکی عەرەب بڵاوبوونەتەوە بە خاکی نیوە دوورگەی عەرەبیدا.[32]

هەروەها لە کتێبی پیرۆزدا لەبەشی حەزقیال دا هاتووە واتا پەیمانی کۆن کە ئەو جێگایە سەنتەرێکی بازرگانی گەورە بووە لە نێوان وڵاتانی ئەفەریقا و ئاسیادا، خاوەنی سامانێکی کانزایی ئاڵتونی زۆر بوو لەوێوە ئاڵتون بۆ وڵاتان چووە، هەروەها ناوی (سەبەء/شەبەء) هاتووە.

---

[30] ئەم زانیارییە لە مێژووی معجم البلدان-ی یاقوتی حەمەدی دا هاتووە

[31] ئەم باسانە لە کتێبی "تأريخ الحرب قبل الإسلام" دا هاتووە نووسەرەکەی "د. جواد علي"یە.

[32] معجم البلدان، یاقوتی

بەشی سفری ملوک سێیەم: زۆرێک لە مێژوونوسانی عەرەب، خاتوو بەلقیس بە (ماقدة) ناودەبەن، دەڵێن گوایە بەلقیس ناوێکی عیبری بووە، جولەکە دەیەوێت ئەو خەڵکە بە عیبرانی بکەن.[٣٣]

هەرچەندە ئەگەر ناوی (ماقدة)ش بوبێت ئەو خاتوونە بۆتە خێزانی حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ، دەشێت ناوی گۆڕیبێت بۆ بەلقیس، جا عەرەبە یاخود عیبرانی بۆ ڕەگەزپەرستەکان گرنگە، بۆ خواناسان گرنگ نییە لە هەر هۆز و ڕەگەز و عەشیرەتێک یان گرنگ نییە لە هەر هۆز و ڕەگەز و عەشیرەتێک بێت.

دوای ئەوەی پەپووەکە زانیارییەکانی دا بە حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەویش بۆ پشت ڕاستکردنەوەی زانیارییەکانی پەپوو، نامەیەکی نارد بە خودی پەپووەکەدا بۆ شاژنی شانشینی سەبەء، چاوەڕوانی وەڵامی ئەوان دەکات، ناوەکەی سولەیمان داخۆ چی بوبێت و چی تێدا نوسرا بێت؟

## نامەیەک لە حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ-ەوە بۆ بەلقیس

سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ نامەیەکی نارد بە (پەپوو)دا و ئاگاداری کردەوە کە لەو دەورووبەرەدا بمێنێتەوە بۆ ئەوەی بزانێت چی دەڵێت، داوای کرد بە زانیاری نوێ وەربگرە ئاخۆ چی دەڵێن و پلانیان چی دەبێت.

بۆ بەجێهێنانی فەرمانی حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ پەپوو فڕی بەرەو وڵاتی یەمەن و نامەکەی هەڵدایە بەردەستی بەلقیس و ئەویش کە نامەکەی خوێندەوە لەدوایدا داوای کۆبوونەوەی نا ئاسایی کرد و هەموو دارو دەستەکەی شانشین و ڕاوێژکار و پیاوماقوڵانی کۆکردەوە و وتی: نامەیەکم لەلایەن شا سولەیمانەوە بۆ هاتووە، نامەکە یەکجار پڕ ڕێز و بانگەوازە بۆ خواناسی، وشەی (کەریم) ئەو مانایە ئەدات بە دەستەوە.

بەلقیس نامەکەی بۆ خوێندنەوە نامەیەکی زۆر کورت و پوخت لە نێوان ترس و بیم و ڕەغبەت و بانگکردنیان بۆ ئیمان و تەسلیم بونیان بە ئاینی خوای پەروەردگار موسڵمان بوونیان داوا دەکات.

خوای گەورە دیمەنەکەمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿ٱذْهَب بِّكِتَـٰبِى هَـٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ۝٢٨ قَالَتْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَـٰبٌ كَرِيمٌ ۝٢٩ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَـٰنَ

---

[٣٣] تأريخ الحرب قبل الإسلام، د. جواد علي

وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ۝٣٠ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ۝٣١ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ۝٣٢ قَالُواْ نَحۡنُ أُوْلُواْ قُوَّةٖ وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ۝٣٣﴾ النمل

واتە: سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَام نامەیەکی نووسی و فەرمووی: ئەم نامەیەم بەرە بۆ لای ئەو ئافرەتەی پاشای (سەبەء) بۆیان هەڵدە، پاشان لێیان دوورکەوە لەلایەک ڕابوەستەو گوێ بگرە بزانە چی ئەڵێن، بزانە وەڵامیان چی ئەبێت کە لەناو خۆیاندا گفتوگۆ ئەکەن، ئەمیش ڕۆیشت نامەکەی بۆ بردن و بۆ ئافرەتەکەی هەڵدا کە بە تەنها بوو، چوو لە دوورەوە ڕاوەستاو گوێی لێ گرتن۝٢٨ ئافرەتە پاشاکە نامەکەی هەڵگرت و زۆر سەرسام بوو پێی و وتی: ئەی دەسەڵاتداران و پیاو ماقوڵان، من کتاب و نامەیەکی زۆر گەورەو بەڕێزم پێ گەیشتووە لەبەر ئەوەی قسەی جوانی تیایە۝٢٩ کە ئەو نامەیە لە سولەیمان پێغەمبەرەوە عَلَيْهِ السَّلَام هاتووە بە بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ دەستی پێ کردووە۝٣٠[٣٤] پاشان تیایدا نووسیویەتی و دەفەرموێت: ئێوە خۆتان بە گەورە مەزانن و لووتبەرزی مەکەن وەکو پاشاکانی تر کە عیبادەت بۆ خوا ناکەن ملکەچ بن بۆ دینی خوای گەورەو موسڵمان و یەکخواپەرست و گوێڕایەڵ بن۝٣١ ئافرەتە پاشاکە نامەکەی سولەیمان پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَام-ی خوێندەوەو ڕاوێژی پێ کردن و وتی: ئەی پیاو ماقوڵان و ڕاوێژکاران بڕیارێک بدەن لەم کارەداو وەڵاممان چی بێت و چی بڕیارێک بدەین ڕێگام نیشان بدەن ئێوە خۆتان ئەزانن من هیچ بڕیارێکم نەداوە تا ئێوە ئامادە نەبن و ڕاوێژتان پێ نەکەم۝٣٢ ڕاوێژکاران و پیاوماقوڵانیش لە وەڵامدا وتیان: ئێمە زۆر بەهێزین لە ژمارەو کەرەستەکانی جەنگدا لە جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەدا زۆر ئازا و بەهێزین ئەتوانین بەرگری لە خۆمان بکەین، بەڵام دوا بڕیاریش بۆ لای تۆ ئەگەڕێتەوە، خۆت بزانە چ بڕیارێک ئەدەیت و چ فەرمانێک ئەدەی ئێمە گوێ ئەگرین و گوێڕایەڵتین۝٣٣.

کاتێک کە باسی نامەکە دەکات بە وەسفێکی نادیار دەیکات، نەزانراوە لەلایەن کێوە بەدەستیان گەیشتووە، زمانی نووسینەکە زۆر بەرزە و باسی یەکتاپەرستی ڕەحمەت و بەزەیی خوای پەروەردگارە.

دوای پرس و ڕاوێژکردن هەر لە سەرەتاوە شاژنی سەبەء بڕیاری ئەوەی داوە کەهیچ ڕووبەڕوو بوونەوەیەک ئەنجام نەدات، چونکە بە نەرمونیانی پرس و ڕای زۆری

---

[٣٤] سولەیمان پێغەمبەر علیە السلام یەکەم کەس بووە کە نامەی بە بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ دەست پێ کردووە

دەستەوستافەکەی زانییان بڕیاری داوە لەسەر ئەوان وتیان ئێمە گەلی جەنگین و ئازا و دلێر و بە جەربەزەین لە ڕووبەڕووبوونەوە دا و کۆتا بڕیاریش لای شاژنە.

شاژنیش واقیعەکەیان بۆ ڕووندەکاتەوە و دەڵێت هەرکات پادشاو دەسەڵاتدارەکان دەچنە جێگایەک یاخود شار و وڵاتێک خراپی دەکەن و سەربەرزی و عیزەتی خەڵکەکەی سەرشۆڕ دەکەن بۆ ئەوەی بترسن و پیاو و ژن، منداڵ، کوڕو کچ یان دەکوژن و بەخزمەتکار و ئەسیر دەیانبردن، ئەم جۆرە وتانە دیوێکی وتەکانیەتی بۆ ئەوەی بزانێت سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ پادشایەکی دنیای ئاساییە، یاخود پێغەمبەرە.

بۆیە داوا دەکات کە سولەیمان تاقیبکەنەوە بە پارەو سامانی زۆر تا بزانن دنیا ویستە یاخود پادشایەکی خواناس و پێغەمبەرە وەکو بانگەوازی خواناسی کردووە.

## وەڵامی نامەکەی بەلقیس بۆ حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ

لەدوای پرس و ڕاوێژی بەلقیس لەگەڵ سەرانی شانشینەکەی گەلەکەی وەکو مەلیکی جەنگیان هەبوو، بەڵام بەلقیس بە سروشتی کە ئافرەتە و ئارەزووی جەنگی نییە، لەهەمانکاتدا کەسێکی وریا و خانمێکی ئاقڵ و چاوکراوەیە، زیانەکانی جەنگی ڕوون کردەوە بۆ هۆزەکەی لە گریمانی سەرکەوتنی حەزرەتی سولەیمان دا، قسەی بۆ لەشکر و پیاو مەعقولە سالارەکانی وڵاتەکەی کرد، کە ڕاووبۆچوونی ئەویان زانی هەموو بڕیارەکە درایەوە دەستی شاژن.

خوێندنەوەی دووەمی بەلقیس ئەوەبوو کە ئەگەر پێغەمبەر بێت ئەوا بەدڵنیاییەوە دنیا و قیامەتمان دەڕوات و دۆڕاوین، چونکە خەڵکی یەمەن و عەرەب بەگشتی زۆر ڕێزی ئاینیان گرتووە.

ئەم گەلە کە سوجدەیان دەبرد بۆ (خۆر) یان ئاگریان بە پیرۆز دەزانی ئەمە سەرەتای دەستپێکی ئاینی مەجوس بوو کە دەستکردی کاهین و ساحیر بازەکانی هیندستان و ئێرانە، کە ئەوکات بە هیند و پارسیا ناسراو بووە، سەبەئییەکان خواوەندەکانیان زۆر بوون لەوانە (عەشتار، ئیلمیقە، هیبسیس، ذات حميم و ذات بوعدان) بوو.

هەرچەندە لە مێژووەکاندا هاتووە کە عشتار لای ئەوان کوڕی خۆر بووە، خۆریش بەدایکی عەشتار ناسراو بووە زۆری تر لەباسی خواکانیان لە کتێبی (تأريخ قبل الإسلام) دا هاتووە.

جا بۆیە پێشنیاری بۆ کردن بۆ ئەوەی بزانێت پادشایە بە دیاری و پارە و ئاڵتون ڕازی دەبێت، ئەگەر پێغەمبەریش بێت بە پارە و ئاڵتون ڕازی نابێت بە بیروباوەر ڕازی دەبێت.

خوای گەورە ئەو دیمەنانەمان نیشان دەدات لە قورئان دا و دەفەرموێت: ﴿قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً ۖ وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّى مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌۢ بِمَ يَرْجِعُ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٣٥﴾﴾ النمل

واتە: ئافرەتە پاشاکە وتی: ئەوەی من بزانم بە دڵنیایی مەلیک و پاشاکان ئەگەر بچنە هەر شارو دێیەکەوەو بە زۆر داگیری بکەن کاول و وێرانی ئەکەن کەسانی بە عیززەت و دەسەڵاتداران بێڕێزو زەلیل ئەکەن بە کوشتن و دیل گرتن بەردەوامیش ئەمە پیشەیانە، واتە: ئەگەر ئەمە مەلیک بێت و بیەوێ داگیری بکات ئاوامان بەسەر دێت﴿٣٤﴾ من دیاریەکی بۆ ئەنێرم ئەگەر وەریگرت ئەوا پاشایەو شەڕی لەگەڵ ئەکەین، وە ئەگەر وەرینەگرێت ئەوا پێغەمبەرەو شوێنی ئەکەوین، پاشان چاوەڕێ ئەکەم بزانم نێردراوەکە لەلای سولەیمانەوە چی وەڵاممان بۆ دێنێتەوە﴿٣٥﴾

نوێنەر و وەفدی ڕێکخست لەپیاومەعقولان و پارەو ئاڵتونی زۆر زۆر.

وەفدەکە گەیشتنە لای حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ دیارە دوای پێشوازی لێکردن بەڵام چاوەڕوانی وەڵامە حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ کە دیارییە زۆرەکە هاتە بەردەستی سولەیمان و ڕاستەخۆ ڕەتی کردەوە پیایدا ناردنەوە بۆ شاژنی سەبەء، حەزرەتی سولەیمان فەرمووی من داوای ماڵ و سامانم نەکردووە، خوای گەورە زۆری بە من بەخشیووە، ئێوە بە سەروەت و سامان و دیارییەکانتان دڵخۆشن، بەهیچ شێوەیەک نامەوێت یان واز هێنان لە بتپەرستی و گەڕانەوە بۆ ئایینی خوای پەروەردگار و موسڵمان بوونتان یان سوپایەک دەکەمە سەرتان هیچ وزە و توانا و بەربەستێک ڕێگای پێ نەگرێت، پاشان زەلیل و ملکەچتان دەکەم کە کافر و بێدین بن.

لێرەدا ئیتر بواری وەفد نەماوە، دەبێت شاژن خۆی هەڵسێت بە کارەکە و یان چوونی بۆلای سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ یان جەنگ کردن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَ سُلَيْمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم ۚ بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ﴿٣٦﴾ ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾﴾ النمل

واتە: کاتێک کە بە کەسێکدا دیاریەکی زۆری بۆ سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ نارد لە ئاڵتوون و خشڵ سولەیمان پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ تووڕەبوو فەرمووی: ئایا ئێوە پارە بۆ من ئەنێرن تا وازتان لێبێنم لەسەر هاوبەش بڕیاردانتان بهێننەوە، ئەوەی خوای گەورە پێی بەخشیووم لە پێغەمبەرایەتی و

موڵک و پارە باشترە لەوەی ئێوە بۆ منتان ناردووە، بەڵکو ئێوەن کە دڵخۆشن بە دیاری و شتی دونیایی من پێویستم بە شتی دونیایی نیە ئەمەوێ موسڵمان بن و بە تاک و تەنها خوابپەرستن﴿٣٦﴾

بە نێردراوەکەی وت: بە دیارییەکەیانەوە بگەڕێرەوە بۆ لایان پێیان بڵێ: ئەبێ بە ئەوەندە سەربازەوە بۆیان بێین کە توانای شەڕو بەرگری کردنیان نەبێت لە خۆیان ئەبێ بە زەلیلی شار بەدەریان بکەین ئەبێ ئەوان ملکەچ و زەلیل و ڕیسوا بکەین و بیانکەین بە دیل﴿٣٧﴾

ناچار وەفدەکە گەڕانەوە و هیچ ئاکام و ئەنجامێکی نەبوو، هەروەکو چۆن لەنامەکەدا داوای کردووە گۆڕانکاری بەسەر داواکەی حەزرەتی سەلەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ دا نەهات، داوای سەرەتا و کۆتایی موسڵمان بوونە.

وەفدەکە هەواڵی تەواوی دایەوە خاتوو بەلقیس بۆی دەرکەوت کە ئەم کەسایەتییە پادشا نییە، بەڵکو پێغەمبەرە ماڵ و سامانی ناوێت، کەسێکی ڕاستگۆ و فرستادەی خوای موتەعالە، هەربۆیە دەیزانی سولەیمان زۆر ڕاستگۆیە لەجێبەجێ کردنی هەڕەشەکەی، ئیتر چارەنەما کە دەبێت خۆی و ستافی شانشینەکەی بڕۆن بۆلای سولەیمان. سولەیمانیش هەواڵی پێدەگات لە ڕێگای سەربازە باڵندە و جنۆکەکانی لەماوەیەکی زۆر کەمدا، بۆیە زانی کە کوتوونەتە ڕێ بۆلای بۆیە دەیویست زیاتر بیانترسێنێت و هەوڵێکیش بێت بۆ زوو موسڵمان بوونیان.

## جنۆکە و ڕۆڵی لە ڕووداوەکان و هێنانی عەرشی بەلقیس

سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ لای خۆیەوە زانی کە بەلقیس بە ڕێگاوەیە بۆلای بۆ شاری ئورشەلیم، خەڵکی بەسروشتی کە واز لە ئاینێک بهێنێت بڕواتە ناو ئاینێکی تر، پێویستە ئەو ئایینە لە ئایینەکەی خۆیان بەهێز تر بێت، جا چ لە ڕووی موعجیزەوە بێت یان دەقەکانی.

بۆیە حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ بیریکردەوە کە یەکێک لەو موعجیزانەی یان زیاتر نیشانی شاژن و وەفدەکەی بدات.

بۆ ئەم مەبەستە داوای کرد کێ دەتوانێت تەخت و تاراجی پادشای بەلقیسم بۆ بهێنێت.

جنۆکەیەک لە طائیفە عەشیرەتی (عیفریت) وتی: من بۆت دەهێنم پێش ئەوەی لە کارەکەت تەواو بێت، واتا کەبەیانی هاتی بۆناو باڵەخانەی حوکمڕانی پێش ئەوەی هەڵبسێت لەکاتی نیوەڕۆدا من دەتوانم ئەو هێرشت بۆ بهێنم.

هەڵبەت حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکی هەموو بەیانییەک تا نیوەڕۆ خەڵکی سەردانی دەکرد بۆ چارەسەری کێشەکان. بۆیە عیفریتەکە مەبەستی ئەوە بوو

کە پێش تەواو بوونی کارەکەی، هەڵبەت واش تەفسیر کراوە کە هێندەی هەڵسان و دانیشتنێک لە چەند چرکە ساتێکدا عەرشەکەی دەگەیەنێتە لای سولەیمان.

گوایە کەسێک لای سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ دانیشتووە و ئۆڤەرێکی تری داوە کە لە چاوتروکانێکدا بۆی دەهێنێت، ئەمەش هەموو تواناو هێزی خوای گەورە نیشان دەدات کە یاسای گەردوون دەوەستێنێت بۆ بەندە چاکەکانی.

لەچاوتروکانێکدا لەبەردەم حەزرەتی سولەیماندا ئامادە بوو هەموو تەخت و تاراجی بەلقیس.

جا هەندێک لە ڕاڤەکاران دەڵێن: ئەو کەسە جوبرەئیل بووە یان دەڵێن حەزرەتی سولەیمان خۆی بووە، هیچ بەڵگەی لەسەر نییە و نازانێت کێیە و نادیارە و لە غەیبیاتی خوای موتەعالدایە.

حەزرەتی سولەیمان کە عەرشەکەی بینی خێرا سوپاس و ستایشی خوای موتەعالی کردووە لە چەمانەوە و گەردن کەچیدا بووە بۆ پەروەردگاری، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿قَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ ۖ وَإِنِّى عَلَيْهِ لَقَوِىٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَـٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّى غَنِىٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾ النمل

واتە: نێردراوەکە بە دیارییەکەوە گەڕایەوەو وەڵامەکەی بۆ بردنەوەو ئەوانیش زانیان ئەمە پاشا نیەو داوای پارەو موڵک ناکات، بەڵکو پێغەمبەرە، بۆیە ئافرەتە پاشاکە بە خۆی و سەربازەکانیەوە بەڕێکەوتن بۆ لای سولەیمان پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ بۆ ئەوەی موسڵمان بن، خوای گەورە بە وەحی سولەیمانی ئاگادار کردەوە کە ئەوان ئێستا بەڕێوەن و دێن موسڵمان ئەبن، سولەیمان پێغەمبەر زۆر خۆشحاڵ بوو، ویستی شتێکیان نیشان بدا کە خوای گەورە چ تواناو دەسەڵاتێکی بەم بەخشیوە، بۆیە فەرمووی: ئەی پیاوماقوڵ و دەسەڵاتدارانی دەوروپشتم کێ لە ئێوە ئەتوانێ عەرشەکەی ئەو ئافرەتە پاشایەم بۆ بێنێ پێش ئەوەی ئەوان بێن و موسڵمان بن؟﴿٣٨﴾ لەناو جنەکاندا عفریت کە جنێکی زۆر گەورە بوو وەکو شاخ وابوو، وتی:من ئەو عەرشە گەورەیەت بۆ دێنم و لەبەر دەستدا دای ئەنێم پێش ئەوەی کە تۆ دانیشتوویتە لە جێی خۆت هەستیتە پێوەمن بۆ هێنانی ئەو عەرشە زۆر بەهێزو ئەمینم و دەستکاری هیچ شتێکی ناکەم﴿٣٩﴾ بەڵام کەسێکی تر کە وتراوە وەزیرێکی بووە، یان نوسەرێکی بووە، کە زانیاری لە کتابدا هەبووە ئەو وتوویەتی:من عەرشی ئەو ئافرەتەت بۆ دێنم پێش ئەوەی کە پێڵوی چاوت بجووڵێتەوە،

واتە: پێش ئەوەی چاو بتروکێنی، بینوقێنیت و چاو بکەیتەوە لە ماوەیەکی ئەوەندەدا عەرشەکەیت بۆ دێنمهەر ئەوەندە چاوی تروکاند یەکسەر عەرشەکەی ئەو ئافرەتە پاشایەی هێناو لەبەر دەستی سولەیماندا دایناو جێگیری کرد سولەیمان فەرمووی: ئەمە فەزڵی خوای گەورەیە بەسەر منەوە تا تاقیم بکاتەوە ئایا شوکرانە بژێری خوای گەورە ئەکەم یان کوفری نیعمەتەکانی خوای گەورە ئەکەمهەر کەسێک شوکرانەبژێری خوای گەورە بکات ئەوا شوکری خۆی کردووەو بۆ خۆی باشەو سوودەکەی بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە {وَمَنْ كَفَرَ} و هەر کەسێکیش شوکرانەبژێری خوا نەکات و کوفرانەی نیعمەتی خوای گەورە بکات ئەوا بە دڵنیایی پەروەردگارم زۆر دەوڵەمەندەو بێ پێویستە و پێویستی بەوە نییە کە کەس شوکرانەبژێری بکات و بیپەرستێت، زۆر بەڕێزە ﴿٤٠﴾

سولەیمان داوای کرد کە دەستکارییەکی کەمی عەرشەکەی بکەن بۆ ئەوەی گۆڕانکارییەکی لاوەکی پێوە دیار بێت، بۆ ئەوەی کە بەلقیس هات و بینی هەستی یەکسەر وانەبێت ئەوەی خۆیەتی، بۆ ئەوەی بیناسێتەوە پێویستی بە تۆزێک وردبوونەوە هەیە کاتێک بینی هەڵوێستەی لەسەر کرد تۆ بڵێیت ئەوە عەرشەکەی خۆم بێت؟

لەو واقڕمانەیدا پرسیاری لێ دەکات لەوخانمە شاژن ئەرێ بەڕاست لە عەرشەکەی تۆ دەچێت؟

ئەویش وەڵامێکی زۆر سیاسیانەی داوە وتی لەو دەچێت وەکو عەرشی من وایە، واتا نەیوت ئەوە، وەڵامەکەی هەردوو بوارەکە وەردەگرێت.

حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەوە عەرشی خۆتە ئیتر بۆی دەرکەوت کە ئەمە کارێکی ئاسایی نییە، سولەیمان بتوانێت لەوڵاتی خۆیدا و لەناو کۆشک و تەلاری شانشینی دا لەناو هەموو پاسەوانەکانیدا ئەم عەرشە بگەیەنێتە ئۆرشەلیم، کەواتە بەدڵنیاییەوە پێغەمبەرە.

ئیتر ئەویش باری دەروونی خۆی خستە بەردەم سولەیمان کە بۆیە ئیمانی نەهێناوە پێشتر کەبەر ئەوەی لەناو گەل و هۆزی کافردا بووە، هیچ پەیامیان بۆ نەهاتووە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِيٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ﴿٤١﴾ فَلَمَّا جَآءَتْ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرْشُكِۖ قَالَتْ كَأَنَّهُۥ هُوَۚ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ﴿٤٣﴾﴾ النمل

واتە: سولەیمان پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: عەرشەکەی وا لێ بکەن کە نەیناسێتەوەو هەندێک شتی لێ دەربکەن، یان هەندێک شتی بۆ زیاد بکەن، یان هەندێک لە ئاڵتوونەکانی

لێ بكەنەوەو ڕەنگەكەی بگۆڕن، پاشان تەماشا ئەكەین ئایا ئەیناسێتەوە یاخود نایناسێتەوە، یان ئایا هیدایەت وەرئەگرێت و موسڵمان ئەبێ یان نا﴿٤١﴾ كاتێک كە ئەو ئافرەتە پاشایە هات بۆ لای سولەیمان پێغەمبەر علیه السلام نیشانی دراو وترا: ئایا عەرشەكەی تۆش وەک ئەمە وابوو ئایا ئەمە لە عەرشەكەی تۆ ئەچێ؟ ئەویش وتی: لەو ئەچێت و لێی نزیكە، نەیووت ئەوە نەوەک دوایی بكەوێتە درۆوە چونكە ماوەی نێوانیان زۆر دوور بوو سولەیمان عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ فەرمووی: پێش ئەمەش خوای گەورە زانیاری بە ئێمە بەخشیووە كە چی ڕێگری لێئەكرد لە موسڵمان بوونی، یان زانیمان كە موسڵمان ئەبێ و خوای گەورە پێشتر پێی وتبوو كە دێت موسڵمان ئەبێت ئێمەش موسڵمانین و خۆمان تەسلیمی خوای گەورە كردووە﴿٤٢﴾ ئەوەی ڕێگری لەم ئافرەتەو قەومەكەی ئەكرد كە عیبادەتی خوای گەورە بكەن ئەوە بوو لە قەومێكی كافر بوون و عیبادەتیان بۆ خۆر ئەكرد﴿٤٣﴾.

## دروست كردنی كۆشكی تایبەت بۆ خاتوو بەلقیس

سولەیمان خۆی یەكێک بووە لە ئەندازیارە ناوازەكان كە توانای نەخشەسازی بونیاد و پلانی هەبووە، ئەو هەموو جۆرە موعجیزەیەشی لەبەردەستدا بووە بۆیە لەدوای موسڵمان بوونی بەلقیس وەكو لە مێژووەكاندا هاتووە خاتوو بەلقیس دەبێتە خێزانی حەزرەتی سولەیمان، ئەویش كۆشكێكی بۆ دروست دەكات بە دیزاینێكی نوێ كە خاک و زەوی كۆشكەكە هاوشێوەی شوشە بوەو لەبنی شوشەكە ئاو دەڕوات، شێوە دیزاینەكە كە مرۆڤ بەسەریدا دەڕوات وا هەست دەكات بەناو ئاودا دەڕوات، بۆیە كە بانگێشتی كرد بۆ ئەو كۆشكە خاتوو بەلقیس وای زانی ئاوە دامێنی كراسەكەی هەڵكرد، بەڵام سولەیمان عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ خێرا دڵنیای كردەوە كە ئەوە جۆرێكە لە دیكۆر و دیزاینی نوێ پێدەچێت لەماوەیەكی كەمدا و لەڕێگای جنۆكەكاندا ئەو كۆشكەی بونیاد نابێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قِيلَ لَهَا ٱدۡخُلِي ٱلصَّرۡحَۖ فَلَمَّا رَأَتۡهُ حَسِبَتۡهُ لُجَّةٗ وَكَشَفَتۡ عَن سَاقَيۡهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ صَرۡحٞ مُّمَرَّدٞ مِّن قَوَارِيرَۗ قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٤﴾﴾ النمل

واتە: سولەیمان بە ئافرەتەكەی وت: وەرە ناو كۆشكەكەوە، جنی و شەیتانەكان كۆشكێكی بەرزیان بۆ دروست كردبوو كە زەوییەكەی لە شووشە بوو، ژێر شووشەكەیش ئاو و ماسی تیابوو بۆ ئەوەی تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە نیشان ئەو ئافرەتە پاشایە بدات، كاتێک ئافرەتەكە ئەو زەویەی بینی وایزانی ئەمە دەریایەو ئاوە، قاچی دەرخست بۆ ئەوەی كە جل و پۆشاكەكەی تەڕ نەبێت بۆ ئەوەی بەناو ئاوەكەدا بڕوات، وایزانی ئاوە، سولەیمان عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ فەرمووی: ئەمە لە شووشە دروستكراوە بەڵام شووشەیەكی لووس دیارەو ئەستورو پتەوە هیچ مەترسیەكی نییە،

لەوێ ئافرەتەکە وتی: ئەی پەروەردگار من زوڵمم لە نەفسی خۆم کردووە کە چەندێکە عیبادەت بۆ تۆ ناکەم و عیبادەتی خۆر ئەکەم، لەگەڵ سولەیماندا هەردووکمان خۆمان تەسلیم الله کرد کە پەروەردگاری هەموو جیهانە، یەکسەر لەوێدا موسڵمان بوو باوەڕی هێنا﴿٤٤﴾

هەروەها حەزرەتی سولەیمان داوای کرد لەخوای پەروەردگار ئەم دەسەڵات و توانایەی کە داویەتییە حەزرەتی سولەیمان نەیدایە دەستی هیچ کەسێکی تر، دیارە حەزی کردووە ئەو موعجیزانە تایبەت بن بە خۆی، خوای گەورەش داواکەی قبوڵ کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾﴾ص

واتە: وتی: ئەی خوای گەورە لێم خۆشبە و موڵکێکم پێ ببەخشە کە تایبەت بێت بە من و لە دوای من بۆ هیچ کەسێک نەبێت، ئەوە بوو کە خوای گەورە جنی و شەیتانەکانی موسەخەرو ژێربار کردبوو لە ژێر دەستیدا بوون، هەر تۆ خوایەکی کە ئەبەخشیت و زۆر بەخشەری﴿٣٥﴾[٣٥]

## جنۆکە و کاریان بۆ حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ

لەسەردەمی حەزرەتی سولەیمان دا هەموو ساحیرەکانی میسرو شام و ناوچەکانی بن دەستی هەموو ڕایان کرد، خۆیان گەیاندە شاری بابل لەو کاتەدا لەژێر فەرمانی ئێراندا بووە، هەموو جنۆکە و شەیتان و عفریت و جان و مەرجان و مارد، ئیبلیسەکانی ناوچەی شام و فەڵەستین و میسر و عێراق تاکو یەمەن هەموو لەژێر فەرمانی حەزرەتی سولەیماندا بوون، کەس نەیدەوێرا سیحر بکات، فەرمانی کوشتن و دەربەدەرکردنی ئەدرا، جا چی لە ڕێگای مرۆڤەوە بێت یاخود جنۆکە، خودی جەنابیان جنۆکە کاری خزمەتگوزاری بەکار دەهێنا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلْأَصْفَادِ﴿٣٨﴾﴾ص

واتە: شەیتانەکانیش لە ژێر دەستیدا بوون و بە فەرمانی ئەو ئیشیان ئەکرد هەیان بووە خانوو و بیناو میحراب و قاپ و مەنجەڵی گەورەو ئەو شتانەی دروست ئەکرد کە لە توانای

---

[٣٥] (ئەبو دەرداء) دەفەرمێت: پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ نوێژی دەکرد بیستمان سێ جار فەرمووی: پەنا دەگرم بە خوا لێت، پاشان فەرمووی: نەفرەتی خوات لێبێت، دەستی درێژ کرد وەکو ئەوەی شتێک بگرێت، کە نوێژەکەی تەواو کرد وتمان ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ شتێکمان لێت بیست کە پێشتر نەمانبیستبوو، دەستت درێژ کرد، فەرمووی: ئیبلیسی دوژمنی خوا پشکۆیەک ئاگری هێنا بەرەو ڕووم، منیش سێ جار وتم: پەنا دەگرم بە خوای گەورە لێت، پاشان سێ جار وتم: نەفرەتی خوای گەورەت لێبێت، هەر نەگەڕایەوە، پاشان ویستم بیخنکێنم تا هەستم بە تەڕی لیکی دەمی کرد لەسەر دەستم، سوێند بە خوای گەورە ئەگەر لەبەر دوعاکەی سولەیمان پێغەمبەری علیه السلام برام نەبوایە دەبوایە بە کۆڵەگەکانی مزگەوتەوە ببەستایەتەوەو منداڵی مەدینە یاریان پێ بکردایە.

مرۆڤدا نەبووە، هەشیان بووە دەریاوان بووە ئەچوونە ناو دەریاوە خشڵ و زیڕو زیو و ئەو شتانەی لە دەریا بووە دەریان کردووەو بۆ سولەیمان پێغەمبەریانعَلَيْهِ السَّلَامُ -یان هێناوە(٣٧) هەندێکیش لە شەیتان و جنییەکان کۆت و زنجیر کرابوون ئەوانەی کە بە قسەیان نەکردایەو کاریان نەکردایە، یان ئیشەکانیان بە جوانی جێبەجێ نەکردایە(٣٨)

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ﴿١٣﴾﴾ سبأ

واتە: سولەیمان پێغەمبەریش عَلَيْهِ السَّلَامُ کە کوڕی داود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ بووخوای گەورە بای بۆ ژێربار کردبوو لە ژێر دەسەڵاتیدا بوو بە بەیانیان ماوەی مانگێك ڕێی دەبڕی و ئەڕۆی، بە ئێوارانیش ماوەی مانگێك ڕێی دەبڕی و ئەڕۆی، واتە لە ڕۆژێکدا ماوەی دوو مانگ ڕێی دەبڕی و بە وڵاتاندا دەگەڕا و بایەکە هەڵیدەگرت و دەیبرد مسیشمان بۆی نەرم کردبوو چۆن ئاسنمان بۆ داود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ نەرم کردبوو، جنیەکانیشمان ژێربار کردبوو خستبوومانە ژێر دەسەڵاتیەوە کە ئیشیان بۆی ئەکرد بە ئیزنی خوای گەورە، هەر کەسێك لەو جنیانە بێ ئەمری سولەیمان پێغەمبەر بکات، ئەوە لە دونیادا سزای ئەدەین و لە قیامەتیشدا ئەیخەینە ناو ئاگرێکی سووتێنەرەوە(١٢) ئەو جنیانە ئیشیان بۆ سولەیمان پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەکردو ئەوەی کە ویستی لێ بوایە بۆیان دروست دەکرد لە کۆشکی گەورە، یاخود مزگەوت، یاخود میحرابی مزگەوت، پەیکەریشیان بۆی دروست ئەکرد کە لە شەریعەتی ئەوان دروست بووەو لە شەریعەتی ئێمەدا حەرام کراوەو زۆر فەرموودەی لەسەر هاتووە قاپ و مەنجەڵی زۆر گەورەشیان بۆ دروست ئەکرد وەکو حەوزی حوشتر چەندێك گەورەیە ئاوا گەورە بۆیان دروست ئەکرد تا خەڵکێکی زۆر خواردنی لەسەر بخوات، قاپی زۆر گەورەیان دروست ئەکرد کە لەبەر گەورەیی هەڵنەئەگیراو جێگیر بوو لەسەر زەویەکە دانرابوو، ئەی ئالی داوود زۆر سوپاسگوزارو شوکرانەبژێری خوای گەورە بکەن لەسەر ئەو هەموو نیعمەتەی کە پێی بەخشیوون، بەڵام کەمێك هەن لە بەندەکانی من کە شوکرانەبژێری من ئەکەن(١٣).

جنۆکەکان زۆر لە حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ دەترسان بە هەموو جۆرەکانییەوە، هەمیشە لە خزمەتی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزەدا بوون.

لە کۆتایی تەمەنیدا خوای پەروەردگار توشی نەخۆشییەکی کرد کە بەڵاو موصیبەتێک بوو بەسەر حەزرەتی سولەیمان دا هات، بەڵام ناوەخنەکەشی حیکمەتی زۆر گەورەی تێدایە.

جۆری نەخۆشییەکەشی وابوو کە لە سەر کورسی دابنیشتایە وەکو جەستەیەکی بێگیان وابوو جوڵەی نەدەما، بەڵام پاش ماوەیەک چاک دەبووەوە دیارە نەخۆشییەکەی سولەیمان نازانێت هۆکاری لاشەی و ماندووبونی خۆی بووە کە زیاد لە پێویست ئازاری لاشەی خۆی داوە یان موعجیب بوون بووە بە دەسەڵاتی و پادشایەتی هێز و توانای، بۆ ئەوەی توشی ئەو نەخۆشییەی کردووە خوای گەورە تا تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆلای زاتی بەرزی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَٰنَ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾﴾ ص

واتە: بە دڵنیایی ئێمە سولەیمانمان عَلَيْهِ السَّلَامُ تاقیکردەوە لاشەیەکمان فڕێ دایە سەر کورسیەکەی پاشان گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورەو تەوبەی کرد، لێرەش دیسان (ئیسرائیلیات) هەیە کە دوورو درێژ نامانەوێ باسی بکەین، بەڵام گوایە شەیتانێک هەبووە هاتووەو مستیلەکەی سولەیمان پێغەمبەری بردووەو خۆی کردۆتە سەر شێوەی سولەیمان پێغەمبەرو چۆتە جێی ئەو لەکاتی سوڕی مانگانەیشدا چۆتە لای خێزانەکانی، ئەوانە هەمووی (ئیسرائیلیات)ەو ئەسڵی نییەو شەیتان لە خەویشدا ناتوانێت خۆی بخاتە سەر شێوەی پێغەمبەران چ جای لە حەقیقەت و ژیاندا، ئەگەر وا بێت ئەوا پێغەمبەرایەتی و وەحی و پەیام و دین هیچ مانایەکی نامێنێت، بەڵکو ئەوەی کە صەحیحە ئەوەیە کە وتی: ئەمشەو ئەبێ بچمە لای نەوەد خێزان هەر یەکێکیان منداڵێک بێنێت و لە پێناو خوای گەورەدا جیهاد بکات، نەیووت: (إن شاء الله)، لە هەر نەوەدیاندا یەک ئافرەتێکیان منداڵی بوو کە نیو منداڵی بوو ئەوە جەسەدەکەیە (جَسَدًا) ئەو نیو منداڵەیە، پاشان گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورەو تەوبەی کرد لەو شتە﴿٣٤﴾ وتی: ئەی خوای گەورە لێم خۆشبە و موڵکێکم پێ ببەخشە کە تایبەت بێت بە من و لە دوای من بۆ هیچ کەسێک نەبێت، ئەوە بوو کە خوای گەورە جنی و شەیتانەکانی موسەخەرو ژێربار کردبوو لە ژێر دەستیدا بوون. هەر تۆ خوایەکی کە ئەبەخشیت و زۆر بەخشەری﴿٣٥﴾

حەزرەتی سولەیمان خاوەنی خێزانی زۆر و منداڵی زۆر بووە لە فەرموودەی پێغەمبەری خوادا هاتووە خاوەنی ١٠٠ خێزان یان جاریە بووە، جا چەندە خێزانی بووە لە شەریعەتەکەیدا ڕێگا پێدراو بووە، زانیاری لەسەر نییە بەڵام زۆرینەی جاریەی بووە.

کوڕەکانیشی زۆرن لەوانەی کە ناویان لە مێژوودا هاتووە بوونەتە پادشا دوای خۆی بریتی بوون لە (رحبە عم) دوای ئەم کوڕەی کوڕەزاکەی بەناوی (ئەفیای کوڕی رحبەعم کوڕی سولەیمان) کۆتا پادشا بووە.

## وەفاتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ

حەزرەتی سولەیمان دەشێت بەهۆکاری نەخۆشییەکەی وەفاتی کردبێت، ئەگەر تەماشای جۆری مەرگ و وەفاتی بکەین هاوشێوەی نەخۆشییەکەیەتی کە بۆ ماوەیەک هەموو لاشەی وەستاوە پاشان کەس بە مردنەکەی نەزانیووە، تاکو ئەو کاتەی کە خشۆکەکان جا کرمە، مارە یان هەر جۆرێکە نازانین بەڵام دیارە لەو سەردەمەدا هەموو پادشا و گەورە پیاوان خاوەنی گۆچان بوون، وەکو لاسای کردنەوەی حەزرەتی موسا و کلتورێک بەکاریان هێناوە، پاشان حەزرەتی سولەیمان وەفات دەکات لەدوای ماوەیەکی زۆر کە هیچ کەسوکار و جنۆکە و ئاژەڵەکان پێی نازانن تا ئەو کاتەی کە دارگۆچانەکەی دەکەوێتە و حەزرەتی سولەیمان یان خۆی دەکەوێت یاخود بە کەوتنی گۆچانەکەی پێی دەزانن لەوماوەیەشدا جنۆکە و شەیتانەکان تەنها بۆ جەنابیان موسەخەر بوون، ئەگەر بیاندیایە وەفاتی کردووە دەست بەجێ وازیان دەهێنا و کاریان نەدەکرد، ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەو کەسانەی کە لە ناو قورەیشدا دەیانوت جنۆکە غەیب دەزانێ، ئەگەر بیانزانیایە ئەو هەموو کاتە کە حەزرەتی سولەیمان وەفاتی کردووە، بۆچی لەو نارەحەتی کارکردن و ترس و بیمەدا دەمانەوە، کەواتە جنۆکەش وەکو هەموو مەخلوقەکانی خوای گەورە موتەعال توانای غەیب و پەنهانی نییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾﴾ سبأ

واتە: کاتێك کە بڕیاری مردنمان بەسەر سولەیمان پێغەمبەردا دا کە خۆی دابوو بەسەر گۆچانەکەیدا جنیەکان هەموویان ئیشیان ئەکرد کەسیان نەیانزانی کە سولەیمان پێغەمبەر مردووە تەنها (مۆرانە) نەبێ کاتێك کە گۆچانەکەی خوارد ئەو کاتە سولەیمان پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ کەوتە سەرزەوی کاتێك کە گۆچانەکەی نەما سولەیمان پێغەمبەر کەوتە سەر زەوی، ئەو کاتە جن بۆیان دەرکەوت کە ئەگەر ئێمە غەیبمان بزانیایە ئەمانزانی چەندێکە مردووەو لەو ئیشە قورسانەدا نەئەماینەوە کە سولەیمان پێغەمبەر پێی دەکردین، دوای ئەوەی کە مرد ئیتر ڕۆیشتن وازیان لە ئیش کردن هێنا (ابن عباس و مجاهدو قتادەو حسن) ئەڵێن: نزیکەی ساڵێك بووە مردووە ئینجا جنییەکان زانیویانە﴿١٤﴾

## ڕووداوی دوای وەفاتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ لەلایەن جنۆکە و شەیتانەکانەوە

حەزرەتی سولەیمان لەدوای ئەوەی خوای پەروەردگار جنۆکەی لەهەموو جۆری عەشیرەتەکان لەبەردەستدا بوو لەژێر فەرمانیدا بوو کاری پێ دەکردن، پاشان حەزرەتی سولەیمان داوای کرد لەخوای پەروەردگار ئەو هێز و موعجیزانەی پێیدراوە لەدوای جەنابیان نەیدا بەکەسی تر خوای گەورە داواکەی گیراو قبوڵ کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ٣٥﴾ ص

واتە: وتی: ئەی خوای گەورە لێم خۆشبە و موڵکێکم پێ ببەخشە کە تایبەت بێت بە من و لە دوای من بۆ هیچ کەسێک نەبێت، ئەوە بوو کە خوای گەورە جنی و شەیتانەکانی موسەخەر (ڕام) و ژێربار کردبوو لە ژێر دەستیدا بوون هەر تۆ خوایەکی کە ئەبەخشیت و زۆر بەخشەری٣٥.

هەروەها فەرموودەی پێغەمبەریشمان هەیە کە دەفەرموێت: ئەو جنۆکانە تەنها لەبەردەستی سولەیماندا موسەخەر بوون، فەرموودەکە دوورو درێژە بەڵام فەرمووی ئەگەر لەبەرخاتری دوریەکەی سولەیمانی برام نەبێت ئەو جنۆکە و شەیتانەی کە وەسوەسەی ئاگر هەڵدانی بۆ دەموجاوی پێغەمبەر بە وەسوەسە هەڵئەدا دەیگرت و دەیخستە بەردەست منداڵانی مەدینە یاری پێبکەن.[٣٦]

لەدوای وەفاتی حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ کەواتە هیچ کەس ناتوانێت کاریان پێ بکات و فەرمان و ئەرک بدات بە سەریاندا، بەڵام شەیتانەکانی جنۆکە هەڵسان بە نوسینی (طەلیسم) خستیانە ژێر بەردوو جێگای ئەشکەوت و ناو سەردابەکان، گوایە وا بڵاویان کردەوە کە سولەیمان پێغەمبەر نەبووە، بەڵکو ساحیر بووە زیاتر ئەم ڕووداوانەش لە ناوچەی بابل ڕوویداوە، بەم هۆکارە سیحربازی زۆر بڵاوبویەوە لەناو خەڵکیدا بەتایبەت لەناوچەکانی میزۆپۆتامیا، پارسیا و هیندستان، هەر ئەمەش وایکرد خوای پەروەردگار دوو فریشتە بنێرێت کە جیاوازی بکەن خەڵکی لەنێوانی سیحر و موعجیزە و خوای پەروەردگار بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم چەمکە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٦] عن أبي الدرداء قال: قام رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فسمعناه يقول: " أعوذ بالله منك " ثم قال: " ألعنك بلعنة الله " ثلاثًا، وبسط يده كأنه يتناول شيئًا، فلما فرغ من الصلاة قلنا: يا رسول الله، قد سمعناك تقول في الصلاة شيئًا لم نسمعك تقوله قبل ذلك، ورأيناك بسطت يدك، قال: إن عدو الله إبليس جاء بشهاب من نار ليجعله في وجهي، فقلت: أعوذ بالله منك، ثلاث مرات، ثم قلت: ألعنك بلعنة الله التامة، فلم يستأخر، ثلاث مرات، ثم أردت أخذه، والله لولا دعوة أخينا سليمان لأصبح مُوثَقًا يلعب به ولدان أهل المدينة. مسلم و النسائي

شێوێنراوانەی شەیتانەکان دوو فریشتەی نارده سەر زەوی بەناوی هاروت و ماروت لەناوچەکانی بابل تا بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە جادووبازی و کاری موعجیزەی پێغەمبەران.

## هاروت و ماروت لە بابل

لەدوای مردنی حەزرەتی سولەیمان کوڕەزاکەی بەناوی ئەفیا خەریکی پەرستنی بت بوو، لەناو یەهود دا وابڵاوبوویەوە کە سولەیمان پێغەمبەر نەبووە هەڵبەت لەناو جیلی دوای ئەسای کوڕی ئەفیا یەهود دیسان پەرتەوازە بوون، بەڵام گوایە لە مێژوودا هاتووە یەکێک لە نەوەکانی کە ئەسایە جەنگی کردووە لەگەڵ پادشای هیند، بەناوی (رزح هندی) لەدوای ئەوەی لە دەریاوە هێرشی هێناوە گوایە دەریای سورە، گەلی ئیسرائیل کەوتونەتەوە بت پەرستی بە تەواوەتی لەدوای ئەسا گەلی ئیسرائیل زۆر خراپەکار بوون، هەر لەوەدەمەوە بەشێکی زۆری ئەو گەلە کە پێیان وایە سولەیمان ساحیر بووە نەک پێغەمبەر، هەروەها لەسەردەمی پێغەمبەری نازداردا ﷺ یەهودی شاری مەدینە ئەم تانەیان ئەدا لە پێغەمبەر محمد ﷺ گوایە جەنابی پێغەمبەر محمد ﷺ ساحیرێکی گەلی ئیسرائیل بە پێغەمبەر دەزانێت، خوای گەورەش بۆ بەرپەرچ دانەوەی یەهود ئایەتی دابەزاند و باسەکەی ڕوون کردەوە چیتر یەهود توانای دەم درێژی نەما، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَـٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَـٰنُ وَلَـٰكِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَـٰرُوتَ وَمَـٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ ۖ لَّوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾﴾ البقرة

واتە: ئەوان شوێنی ئەو شتانە کەوتن کە شەیتانەکان ئەیانخوێندەوە لەسەردەمی سولەیمان علیە السلام کە وایان ئەزانی ئەمە زانستێکەو سولەیمان علیە السلام بەجێی هێشتووە لە کاتێکدا کە سولەیمان کوفری نەکردو سیحری نەکرد ئەو پێغەمبەری خوا بوو بەڵکو شەیتانەکان کافر بوون بەهۆی سیحر کردنیانەوە، کە جوولەکە ئەیانووت سولەیمان کوفری کردووە سیحرو جادووی کردووە و سوجدەی بۆ بت بردووە، بەڵام خوای گەورە سولەیمان بەری ئەکات لەو شتانە کە شەیتانەکان خەڵکیان فێری سیحرو جادوو ئەکرد ئەوەی کە دابەزی بۆ سەر هەردوو مەلائیکەتەکە لە بابل کە ناویان (هاروت و ماروت) بوو کە دوو مەلائیکەت بوون داوایان کردووە خوای گەورە دایانبەزێنێتە سەر زەوی وەکو تاقیکردنەوە خوای گەورە دایبەزاندن، ئەو کاتە شەهوەتیان تێچوو و تووشی تاوان بوونە لەبەر ئەوەی خۆیان داوایان کردووە کە

دایانبەزێنێتە سەر زەوی ئەوە تەفسیرێک، یاخود وتراوە: خوای گەورە بۆ تاقیکردنەوە دایانی بەزاندووە، یاخود وتراوە قیرائەتێکی تر (وَمَا أُنْزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ) دوو مەلیک بوونە لە بابل کە ناویان (هاروت و ماروت (بووە، یاخود (ما) نافیەیە واتە نە سولەیمان کوفری کردووە، نە خوای گەورە سیحرو جادووی دابەزاندۆتە سەر هەردوو مەلائیکەتەکە هیچ کەسێکیان فێری سیحرو جادوو نەئەکرد هەتا پێیان نەوتنایە کە ئێمە تاقیکردنەوەین خوای گەورە ئێوە تاقی ئەکاتەوە بەهۆی ئێمەوە، ئێوە کوفر مەکەن و خۆتان فێرە سیحرو جادوو مەکەن لەبەر ئەوەی سیحرو جادوو کوفرە هەر کەسێک فێری بێت کافر ئەبێت، ئەوەی کە لە سیحر فێری ئەبوون ئەوە بوو کە جیاوازیان ئەخستە نێوان ژن و پیاوەوە وەکو چۆن ئێستاش سیحرو جادوو هەیە کە ژن لەبەرچاو پیاو ڕەش ئەکات یان بە پێچەوانەوە، ئەوان نەیانئەتوانی زیان بە هیچ کەسێک بگەیەنن بەبێ ئیزنی خوای گەورە، چونکە بەبێ ئیزنی خوای گەورە هیچ شتێک تەئسیرو کاریگەری نابێت فێری شتێک ئەبوون لە سیحرو جادوو کە زیانی پێیان ئەگەیاندو هیچ سوودێکی بۆیان نەبوو لەبەر ئەوەی سیحرو جادوو هیچ سوودێکی تیا نیە و ئەشیانزانی کە هەر کەسێک ئەو سیحرە فێربێت و وەری بگرێت و بیگۆڕێتەوە بە کتابی خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ بەشێکی نییە لە ئەجرو پاداشت، کردەوەکانی بەتاڵ ئەبێتەوە بەڕاستی ئەمیش خراپترین شت بوو کە بۆ نەفسی خۆیان وەریان گرت کە کتابی خوای گەورەیان فرۆشت و سیحریان پێی وەرگرت ئەگەر بیانزانیایە﴿١٠٢﴾ بەڵام ئەگەر بهاتایە ئیمانیان بە پێغەمبەری خوای گەورەو ﷺ بەو قورئانە پیرۆزە بهێنایە، تەقوای خوای گەورەیان بکردایەو خۆیان لە تاوان و سیحرو جادوو پاراستبایە ئەوە خوای گەورە ئەجرو پاداشتی یەکجار زۆری ئەدانەوە ئەمیان بۆیان باشتر بوو لە دونیاو قیامەتدا ئەگەر بیانزانیایە﴿١٠٣﴾.

لێرەدا باسی جۆرێکی سیحری کردووە، خوای پەروەردگار ئەویش جادووی ڕەشییە لە نێوانی ژن و مێرد، یاخود هەر خۆشەویستێکی تر بێت لە خانەوادە یاخود لە ڕێگای خوێن وەک و برا لە براو خوشک لە خوشک و خوشک و برا بەگشتی کەسوکار، ئەمەش جۆرێکە لە جادووبازی کە لەو سەردەمەدا باوبووە، هەروەکو ئاماژەمان پێدا حەزرەتی سولەیمان ساحیرەکانی هەموو لەناوبردوو ڕاوەدوونران بۆ ناوچەی بابل بۆیە ئەو دوو فریشتەیە کە خوای گەورە وەک پەیامبەرێک ناردنی تا خەڵکی جیاوازی لەنێوان سیحر و موعجیزەدا بکەن کە سیحریان نیشانی خەڵک ئەدا و خەڵکەکە فێردەبوون، بەڵام فریشتەکان ڕاستەخۆ دەیانوت ئەمە کوفر و فیتنە و خراپەکارییە بۆ ئەوەی کە دەڵێن بە فەرمانی خوایە ئازاری خەڵکی ئەدات، سەید قوطب دەڵێت: ئاگر وجوودی هەیە هەر بە فەرمانی خوای موتەعال سوتێنەرە هەرچۆن خوای گەورە فەرمانەکەی وەستان بۆ سوتاندنی حەزرەتی ئیبراهیم بۆ جادوو سیحریش هەمان توانا و هێزی هەیە، بۆیە هەموو شتەکان مەخلوقی خوای پەروەردگارن.

جا لەو ساتەوەختەوە جنۆکەو شەیتانەکان ناچنە ژێر فەرمانی هیچ مرۆڤێک، بەڵکو بە پێچەوانەوە جنۆکە و شەیتان مرۆڤەکان دەخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان و کوفر و سیحر و کاری خراپە دژی مرۆڤ دەکەن، چونکە خۆشیان لە مرۆڤ نایەت، بۆ ئەم باسە درێژە و تێگەیشتن لە بواری سیحر و جادووبازی و دنیای جنۆکە و شەیتانەکان سەرنجتان ڕادەکێشین بۆ کتێبی مەمەلەکەتی شەیتان لە وێدا بە دوورو درێژی باسی هەموو جۆر و چۆنیەتی کاری ساحیر و جنۆکەکان کراوە.

## کۆی گشتی باس

گەلی ئیسرائیل لەبەر ئەوەی ڕاسپیدرابوون و هەڵبژێرا و بوون بۆ بانگەوازی دینی خوای گەورە، خوای پەروەردگار هەمیشە پێغەمبەر لەدوای پێغەمبەر بۆی دەناردن، تاوەکو بانگەوازەکە بە جیهان دا بگەیەنن و خۆشیان چاکەخواز بن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت لە ڕاستیدا لەناو نەوەکانی ئیسرائیل بە سیاسەت و کاروفەرمان و بەڕێوەبردنی پێغەمبەرانیان بەڕیوە دەچوون، هەرکات پێغەمبەرێکیان وەفاتی بکردایە، خوای گەورە پێغەمبەرێکی تری بۆ دەناردن.[٣٧]

خوای پەروەردگار پێغەمبەر لەدوای پێغەمبەر بۆی دەناردن بۆ پاراستنی ماڵی خۆی کە (مزگەوتی قودس) هەر ئەوەندەی پێغەمبەرێک وەفاتی بکردایە خێرا لەدەستیان ئەدا و هێزی شەڕەنگێزەکانی دونیا داگیریان دەکرد، ئەوانیش لە جیاتی ئەوەی ڕێوشوێنی پێغەمبەران شەریعەتەکەیان بگرن، کەچی ڕێک پێچەوانە بوو، خێرا دوای دوژمن لە هەمانکاتدا دژی گەلەکانیان بوون.

خاکی قودس دەبێت خەڵکانێک ڕزگاری بکەن سیفاتی داوودیان هەبێت، هەرجارەو کە ئەو خاکە داگیر دەکرا بە هۆکاری خواناسی پێغەمبەران یاخود جوانتر بڵێین پاکی پێغەمبەران و چاکی شوێنکەوتوانی ڕزگار دەبوو، بە تەنها پێغەمبەرانیش هیچیان پێ نەدەکرا ئەگەر گەلەکەیان خواناس و موجاهید نەبوونایە، ئەوە نموونەی دوو پێغەمبەری عەزیز وەکو موسا و هارون سەلامی خوایان لێ بێت، بەڵام ئەوان نەوەستان لە پەروەردەکردن بەردەوام لە پەروەردەی جیلی نوێ دابوون، خۆشیان چاوەڕوانی ئەنجامیان نەکرد، بەڵکو تەنها کاریان ئەنجام ئەدا هەرچەندە ئامانجەکە چوونە ناو خاکی قودس بوو، بەڵام لەسەردەمی موسا و

---

[٣٧] عن أبي حازم قال: قَاعَدْتُ أبَا هُرَيْرَةَ خَمْسَ سنينَ فَسَمعْتُهُ يُحَدِّثُ، عَنِ النبيِّ ﷺ، قالَ: كَانَتْ بَنُو إسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأنْبِيَاءُ، كُلَّما هَلَكَ نَبِي خَلَفَهُ نَبِي، وَإنَّه لا نَبِيَ بَعْدِي، وَسَتَكُونُ خُلَفَاءُ فَتَكْثُرُ، قالوا: فَما تَأْمُرُنَا؟ قالَ: فُوا بِبَيْعَةِ الأوَّلِ، فَالأوَّلِ، وَأَعْطُوهُمْ حَقَّهُمْ، فإنَّ اللَّهَ سَائِلُهُمْ عَمَّا اسْتَرْعَاهُمْ/البخاري، مسلم و إبن ماجة.

هارون دا ڕووی نەدا، بەڵکو حەزرەتی یوشەعی کوڕی نون بەرهەمەکەی چنیەوە. کەواتە کاری پێغەمبەران و شوێن کەوتووی پێغەمبەران دروستکردنی جیلی نوێی چاکەخوازە، هەر لە سەردەمی موسا عَلَيهِ السَّلَام-ەوە تا سەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبی هەمان یاسا و ڕێسا بووە تا ڕۆژی قیامەتیش بۆ ڕزگار کردنی قودس، پێویستە هەمان یاسا و ڕێسای عومەری کوڕی خەتاب و هاوەڵان و پیاوچاکانی وەکو سەلاحەدین ڕزگاری کرد، شیعەی فاطمی لەگەڵ خاچپەرستان داگیریان کردەوە دوای چەند ساڵێک، پاشان نەجمەدین ئەیوبی ئامۆزای جارێکی تر ئازادی کردەوە، هەروەها پادشای خاچپەرستانی بەدیل گرت و بۆ ڕاستکردنەوەی یەک ملیۆن دیناری ئاڵتونی وەرگرت لە خاچپەرستان و ئیتر بۆ ماوەی ٧٠٠ ساڵ ئازادی کرد تا سەردەمی ئیستعمار و داگیرکەری ئینگلیز، پاشان لە ساڵانی ١٩٤٠ بەدواوە تەسلیم و ڕادەستی یەهود کرا، تا ئەم ساتە وەختەش داگیر کراوە.

بۆ زانیاری ئەهلی ئیسلام ئەگەر گەلێک هاوشێوەی گەلی ئیسرائیل بێت کە لە سەردەمی موسا و هارون دا سەلامی خوایان لێ بێت، تەنها حەزیان بەلاسای کردنەوەی دوژمنەکانیان بوو، پاشان وازیان لە جیهاد و کۆشش هێنا و بەدوای خۆشی ژیانەوە بوون، خوای گەورە ساڵانێکی هێنا بەسەریاندا کە ناونرا بە ساڵی (التیة) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ سَنَةً يَتِيهُونَ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ۝٢٦﴾ المائدة

واتە: خوای گەورە فەرمووی: ئەم زەویە پیرۆزە کە قودسە ئەوە چل ساڵ حەرامی ئەکەم لەسەریان بچنە ناوی بەهۆی ئەوەی کە نەچوون کوشتاری ئەو قەومە بکەن لەناو قودسدا، سەریان لێ ئەشێوێ لەسەر ڕووی زەویداو دێن و ئەڕۆن و سەرگەردان دەبن، کە لەزەوی (سیناء)ە بەبێ ئەوەی شاری قودس بدۆزنەوە، وەکو (ابن عباس)یش دەفەرمووێ: چل ساڵ سەریان لێشێواو ڕێگایان لێ ون بوو موسا و هارونیشیان لەگەڵدا بوو ئەهاتن و ئەڕۆیشتن ئەو شارەیان نەئەدۆزیەوە، لەم چل ساڵەدا بوو کۆمەڵێک موعجیزە بۆ موسا ڕوویدا لە دابەزینی گەزۆ و سوێسکەو سێبەر کردنی هەور بۆیان و دەرکردنی ئاو لە بەردی ڕەق، پاشان هارون کۆچی دوایی کردو موسایش سێ ساڵ دوای ئەو کۆچی دوایی کرد، زۆربەی بەنی ئیسرائیل لەم ماوەی چل ساڵەدا مردن، تا دوای چل ساڵەکە خوای گەورە (یوشەعی کوڕی نون)ی کرد بە پێغەمبەرو ناردی و ئەوان چوون فەتحی (بیت المقدس)یان کرد لە ڕۆژی هەینی پاش عەصر، خوای گەورە فەرمانی بە (یوشەع) کرد پێیان بڵێ کە چوونە (بەیتولمەقدیس) بە کوڕنوشەوە بچن و داوای لێخۆش بوون بکەن، بەڵام ئەوان گۆڕیان، ئەی موسا خەفەت مەخۆ لەو کەسە فاسق و لەڕێ دەرچووانە هەر سزایەکیان بدەم شایەنین۝٢٦

لە ئێستاشدا هەروایە ڕۆڵەکانی موسڵمانان لەو خاکەدا دەکوژرێن و حەیا و ناموسیان بە هەدەر دەڕوات، عەرەب دەڵێت: هێزی ئیسرائیل بەتوانا و جەبارن لە تواناماندا نییە!

هەر هەمان کاتی سەردەمی موسا و هارون-ە سەلامی خوایان لێ بێت دووبارە دەبێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡأَرۡضَ ٱلۡمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَارِكُمۡ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ۝ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوۡمٗا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَا حَتَّىٰ يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ۝ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ فَإِذَا دَخَلۡتُمُوهُ فَإِنَّكُمۡ غَٰلِبُونَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ۝ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ۝ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ۝﴾ المائدة

واتە: ئەی قەومی خۆم بڕۆنە ناو ئەو زەویە پاک و پیرۆزە کە قودسە کە خوای گەورە لەسەرتانی نووسیوە کە بچنە ناویەوە ئەگەر ئێوە پیاوچاک بن ئەچنە ناویەوەو تیایدا جێگیرو نیشتەجێ ئەبن، یان خوای گەورە بەڵێنی پێداون بەڵام هەڵمەگەڕێنەوەو واز لە گوێڕایەڵی من و جیهاد کردن مەهێنن ئەو کاتە خەسارەتمەندو زەرەرمەندی دونیاو قیامەت ئەبن۝ وتیان: ئەی موسا لەناو قودسدا قەومێکی تیایە کە زۆر بەهێزو زۆر گەورەن کە تا ئەوان دەرنەچن ئێمە ناچینە ناویەوە، ئەگەر ئەوان دەرچوون ئەو کاتە ئێمە ئەچینە ژوورەوە، بەڵام کوشتاری ئەوان ناکەین۝ دوو پیاو لەوانەی کە لە خوای گەورە ئەترسان و خوای گەورە نیعمەتی خۆی ڕژاندبوو بەسەریان بە ئیمان و بە یەقین، خەڵکی ڕێزی لێ دەگرتن کە (یوشەع بن نون) و (کالەب بن یوقنا) بوون کە لە دوانزە نەقیبەکە بوون، وتیان: بڕۆن لە دەرگاوە بچنە ژوورەوە بۆ لای ئەو قەومە تەنها بڕۆنە ژوورەوە سەردەکەون و متمانەتان بە بەڵێنی خوای گەورە هەبێ خوای گەورە وەعدی داوە ئێوە سەرئەخات ئێوە تەنها پشت بەخوای گەورە ببەستن ئەگەر ئێوە ئیماندارن۝ وتیان: ئەی موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ ئێمە هەرگیز ناچینە ناو قودسەوە تا ئەوان لەو شارەدا بن، تۆ خۆت و خواکەت بڕۆن کوشتار بکەن ئێمەش لێرە دائەنیشین و ئەم جێگایە بەجێ ناهێڵین و شەڕو کوشتاری ئەوان بە ئێمە ناکرێ، ئەمە لە ترس و تێکشکاندن و سەرپێچی و عینادیدا وایان وت، بەڵام هاوەڵان لە غەزای (بەدر) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئێمە وەک بەنی ئیسرائیل ناڵێین تۆ خۆت و خواکەت بڕۆن کوشتار بکەن و ئێمە لێرە دادەنیشین بەڵکو ئەگەر پێشمان بکەویت بۆ ناو دەریا شوێنت دەکەوین و بە دواتدا دێین و لە پێش و پاش و لای ڕاست و چەپت کوشتار دەکەین، پێغەمبەری خوایش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕووی پیرۆزی گەشایەوەو پێی خۆش بوو۝ موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی پەروەردگار من تەنها خۆم و هارونی برامم کەسی تر

گوێڕایەڵیم ناکات جیاوازی بخەرە نێوان ئێمەو ئەم قەومە فاسقەوەو ئەگەر سزای ئەوان ئەدەی سزای ئێمە مەدە، خۆت بڕیار بدە لە نێوانماندا﴿٢٥﴾.

لە سەردەمی دوای پێغەمبەر موسا و هارون سەلامی خوایان لێ بێت، خوای گەورە یوشەع عَلَيْهِ السَّلَامُ-ی نارد چونکە ڕاستگۆ بوو خوای موتەعال سەرکەوتنی بۆ ناردبوو یاسای گەردوونی بۆ وەستاند ڕۆژ لە ئاسمان دا وەستا فەتحی کرد، خوای گەورە یاسای گەردوونی بۆ سەڵاحەدین و موجاهیدانی ئەم ئیسلامە گۆڕیووە، لە کاتی جەنگدا لەگەڵ خاچپەرستان دا دیواری شاری ئورشەلیمی بۆ شەق کرد لە ڕێگای زەمین لەرزەوە ئەمە تەنها بۆ سەلاحەدین ڕووی نەداوە، بەڵکو بۆ محمد فاتح-یش ڕوویداوە کە لەبەردەم دیوارەکانی قوستەنتەنییەدا بووە.

بۆ طارقی کوڕی زیاد ڕوویداوە بە ١٣ هەزار کەس توانی سوپای فۆنسۆ لەوادی.برباط لەناو بەرێت کە سوپاکەی لەسەر و ٦٠ هەزار کەسەوە بوو خودی فۆنسۆش بکوژن.

بۆ محمد قاسم ڕوویداوە کە هەموو ناوچەکانی هیندستان و پاکستان کە ئەو دەمە پێی وتراوە نێوانی ڕووباری سەیحون و جەیحون. بۆ سوڵطان سەلیم و سوڵطان سەلمانی کوڕی ڕوویداوە کە جزیەی لە هەموو ئەوروپا وەردەگرت، بۆ محمد ماڵی ڕوویداوە کە توانی گەورەترین ئیمپراتۆری ئیسلامی لە کیشوەری ئەفەریقا دامەزرێنێت.

کەواتە خاکی قودس پەیوەست نییە بە گەلی ئیسرائیل یان هەر گەلێکی تر کە بەناوی عەرەبایەتی و یەهودایەتی کاری بۆ بکات، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴿١٠٥﴾﴾ المائدة

واتە: بە دڵنیایی لە زەبوریشدا کە کتابی داوود پێغەمبەر بوو لەوێشدا نووسیوومانە لە پاش نووسینمان لە (لوح المحفوظ) کە بە دڵنیایی بەندە چاکەکانی من ئەبن بە میراتگری زەوی و بە فەرمانڕەواو دەسەڵاتدار لەسەر زەویدا﴿١٠٥﴾

کەواتە لە زەبوری حەزرەتی داوود دا نوسراوە و لە قورئان دا بۆ ئومەتی ئیسلام چەسپێنراوە کە خاکی فەڵەستین تەنها بەندە چاکەکان خاوەنی دەبن دەستی بەسەرا دەگرن، کەواتە لەخاکی میعادی یەهود دەرچووە.

کەواتە ئەوە درۆی نوێی پەهودە کە ناویان ناوە بەخاکی میعاد، لە سفردا داوود لە کتێبی پیرۆز کە ناسراوە بە مەزامیری داوود و لە قورئانی موسڵماناندا نوسراوە، ئەو خاکە خاکی چاکەخوازانە.

پرسیار ئەوەیە کێ چاکەخوازە دەوڵەتی میسر یاخود سعود یان ئێران یان تورکیا...هتد، وەڵامەکە بەجێ دەهێڵین بۆ خەڵکی ئاقڵ و خواناس کە تێبگەن لە ئێستادا ئێمەی ئەهلی ئیسلام لەساڵانی (التیة) گەلی ئیسرائیل.

لێرەدا کە باسی مێژوو ژیانی ئەو هەموو پێغەمبەر و گەلە دەکەین، هەروا بۆ کات بەسەربردن نییە، بەڵکو ئەم مێژووانە دووبارە دەبنەوە بۆ ئەوەیە کە من و تۆ ئەزموونی لێ وەربگرین.

لە کاتێکدا کە ئیلیاس هات هەمان کاری پێغەمبەرانی تری ئەنجام دا لەگەڵ حەزقیال و یەسەع دا، دەبێت بانگەواز بەردەوام بێت لەگەڵیدا، جیل دوای جیل پەروەردە دەبن بۆ جیهاد و خەبات، بەدوایدا کە بانگەواز کرا طالوت و داوود هاتن جیهادیان کرد شۆڕشیان کرد خەباتیان کرد، دەستەو ئەژنۆ دانەنیشتن بانگەواز بێ جیهاد و کۆشش کردن نابێت و بەرهەمی نابێت.

تەماشای جیاوازی ئەم دوو سەردەمە بکە و خۆت بڕیار بدە لەکام سەردەمدایت و ڕۆڵی خۆت لەکام سەردەمدا دەبینیت؟

سەردەمی موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ إِذْ قَالُوا۟ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُوا۟ ۖ قَالُوا۟ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبْنَآئِنَا ۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ تَوَلَّوْا۟ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٤٦﴾﴾ البقرة

واتە: ئایا نابینی کۆمەڵێک لە خانەدان و دەسەڵاتدارانی بەنی ئیسرائیل لە دوای وەفاتی موسا کاتێک کە بە یەکێک لە پێغەمبەرەکانی خۆیان وت (کە شمویل یان شەمعون بوو): پاشایەکمان بۆ بنێرە تا لە ژێر ئاڵای ئەو پاشایەدا لە پێناوی خوای گەورە کوشتار بکەین فەرمووی: ئایا لەبیرتان کرد کە ئێوە کوشتارتان لەسەر فەرز کرا بەڵام نەتان کرد، یان لەوانەیە کوشتارتان لەسەر فەرز بکرێت و نەیکەن وتیان: باشە ئێمە چیمانە بۆ کوشتار نەکەین لە پێناو خوای گەورە کاتێک کە ئێمە لە ماڵ و حاڵی خۆمان دەرکراوین و منداڵمان لێسەندراوە، بەڵام کاتێک کە کوشتاریان لەسەر فەرز کرا زۆربەی هەرە زۆریان پشتیان هەڵکرد تەنها کەمێکیان نەبێ لەبەر ئەوەی نیەتیان باش نەبوو عەزیمەتیان نەبوو خوای گەورە خۆی زۆر زانایە بە ستەمکاران﴿٢٤٦﴾

گەیشت بە جیلەی کە ناوی نراوە بە جیلی سەرکەوتوو پێویستە چەند خاڵێک لەخۆتا کۆبکەیتەوە، ئەگەر گەیشتیتە ئەم خەصڵەت و پێناسانە دڵنیاتان دەکەمەوە سەرکەوتن دێت بە فەرمانی خوای پەروەردگار.

١. بیرووباوەڕی پاک و دوور لە شیرک و خورافیات شوێن کەوتووی قورئان و سوننەت مەرجە بۆ سەرکەوتنی جیلەکان.

٢. ڕاستگۆی لە وتە و کردار و نیەتدا خاوەن وەفا بێت و دڵسۆز بیت لەبەرانبەر دینی خوای موتەعال.

٣. وازهێنان لە خۆشەویستی دنیا و پڕکردنەوەی ئەو خۆشەویستییە بە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر و بانگەواز و جیهاد.

٤. هەوڵدان بۆ پاکردنەوەی دڵ و دەروون و تەزکییەی نەفسی خۆت بکە جا بە خوێندنەوەی کتێب، یان خوێندن لە خزمەت مامۆستایەکدا

٥. بەفیڕۆ نەدانی کات، لە پێناوی دینی ئیسلامدا چرکەو خولەک و کاتژمێر و ڕۆژ و شەو و هەفتە و مانگ و ساڵ لە کارکردندا بە بۆ ئیسلام.

٦. ئازا بەو چاونەترس بەو جوامێر بە بەڕەوشتی بەرزی ئیسلامەتی پێچەوانەکەی سەرەڕۆ مەبە زوو هەڵمەچۆ حیکمەت بەکار بهێنە، بەڵام دووربە لە ترسنۆکی!

٧. وابەستە بە نوێژ و ڕۆژ و زەکات و مزگەوت و قورئان خوێندن و زیکر و فیکری خوای پەروەردگار و هەمیشە لە بەندایەتی دا وەکو عابیدێکە بە لە ئازایەتی و جوامیریدا موجاهید بەو لە پاک کردنەوەی دڵ و دەرونتا صۆفی بەو لەبیروباوەڕتدا، سەلەفی بە.

٨. هەمیشە تا ڕۆژی مردنت هەوڵی وەرگرتنی زانست بدە، وەربگرە و فێری خەڵکیی تری بکە، جا زانستی شەرعی بێت یان زانستی مرۆیی.

٩. هاوڕێیەتی خەڵکی باش بکە، پێچەوانەکەی دوورکەوە لە هاوڕێی خراپ و نەگبەت.

١٠. کۆمەڵایەتی بە و دامەبڕێ لەناو کۆمەڵگەکەتدا و سیلەی ڕەحم بەکاربهێنە و سەردانی دۆست و خزم و کەسوکارت بکە بەردەوام.

١١. دانەبڕێیت لە بژێوی ڕۆژانەت جا کارو کەسابەت و بازرگانی و فەرمانبەری و هەر ئیشێکە، هەوڵبدە باشترین بیت لەچاو کەسانی تردا.

١٢. وەرزشەوان و ڕێکخەری ژیان و کاتت بە، کەسێکی بێ بەرنامەو بێ هودە و بێ پلان مەبە، هەمیشە خاوەنی پرۆژەی تایبەت بەو هەوڵبدە لاسایی کەس مەکەرەوە، بێجگە پێغەمبەری خوا ﷺ، واتا لە کەس مەچۆ، وزە و ئینەرژی خۆت بەکار بهێنە.

بەم دوانزە خەسڵەتە گرەنتی سەرکەوتن هەیە و مسۆگەرە زۆرێکمان زۆرینەی ئەم خەسڵەتانەمان تێدایە با زیادی بکەین لە خۆماندا.

بە پێچەوانەوە هەموو سیفاتەکانی یەهود گەلی ئیسرائیل وەلا بنێن و وازی لێ بهێنن، چونکە خوای گەورە مرۆڤی پێ زەلیل دەکات بەو خەصڵەتانە ئەوانەش بریتین لە:

١. هەمیشە جولەکە پەیمان دەشکێنێت، کەواتە تۆ پەیمانی خۆت بەرە سەر وەکو ئیماندار و موسڵمان.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَكُلَّمَا عَـٰهَدُواْ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُمۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ۝١٠٠﴾ البقرة

واتە: جوولەکە هەر کاتێک کە عەهدو بەڵێن و پەیمانێک ئەدەن کۆمەڵێک لەوان هەر زوو بە زوویی هەڵیئەوەشێننەوەو فڕێی ئەدەن، بەڵکو زۆربەیان ئیمان ناهێنن ۝١٠٠

٢. خایانەت کار مەبە، یەهود هەمیشە خیانەت دەکات کەواتە پێچەوانەی خیانەت کردن، ڕاستگۆیی و بەوەفایی و جوامێری و پیاوەتییە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ ۝١٣﴾

٣. هەڵگەڕانەویە وتەی خوای پەروەردگار لەبەر خاتری خۆت حەڵاڵ و حەرام مەکە و یان حەرام حەڵاڵ بکەیت، یەهود پیشەی ئەوەیە بۆ بەرژەوەندی خۆی وتە و فەرموودەی خوای موتەعال دەگۆڕێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿۞ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُواْ لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ۝٧٥﴾ البقرة

واتە: ئایا ئێوە تەماحی ئەوەتان هەیەو چاوەڕێی ئەوەن کە جولەکە ئێوە بەڕاست بزانن و ئیمانتان پێ بێنن، کاتێک کۆمەڵێک لەوان گوێیان لە فەرمایشتی خوای گەورە ئەبوو لە تەوراتدا، لە دوای ئەوەی کە لێی تێ ئەگەیشتن دەستکاریان ئەکردو شتیان لێ زیادو کەم ئەکردو ئەیانگۆڕی بە گوێرەی هەواو ئارەزووی خۆیان و ئەیشیانزانی کە دەستکاری کردنی حەرامە ۝٧٥

٤. کوشتنی پێغەمبەران لەم سەردەمەدا تۆ کە پێچەوانەی یەهود کاربکەیت لە کوشتنی پێغەمبەران دا زیندوکردنەوە سوننەتی پێغەمبەر و ئاگابوونە لە ژیانی پێغەمبەران بە گشتی، یەهود گوێیان بە کوشتنی پێغەمبەرەکانیان نەئەدا و دەیانکوشتن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ رُسُلًا ۖ كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا۟ وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴿٧٠﴾﴾ المائدة

واتە: ئێمە بە دڵنیایی عەهدو بەڵێن و پەیمانمان لە بەنی ئیسرائیل وەرگرت کە ئیمان بێنن، کۆمەڵێک پێغەمبەرانمان بۆ ناردن هەر کاتێک کە پێغەمبەرێکیان بۆ ڕۆیشتبێ کە بەگوێرەی هەواو ئارەزوو حەزی ئەوان نەبوو، بێکۆمەڵێکیان پێغەمبەرانیان بەدرۆ ئەزانی و ئیمانیان پێی نەئەهێنا. کۆمەڵێکیان پێغەمبەرانیان ئەکوشت وەکو جوولەکە باوەڕیان بە عیسا نەکردو وتیان: ئەمە منالی زینایەو زۆڵە، یەحیاو زەکەریاشیان کوشت، هەوڵی کوشتنی عیسا و محمدیشیان دا خوای گەورە پاراستنی(٧٠)

لە هەمان کاتدا لەگەڵ پێغەمبەراندا پیاوچاکانیشیان دەکوشت کە فەرمانیان بە چاکە و نەهییان لە خراپە دەکرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَيَقْتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِٱلْقِسْطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾﴾ آل عمران

واتە: ئەو کەسانەی کە کوفر ئەکەن بە ئایەتەکانی خوای گەورە و پێغەمبەرانی خوای گەورە ئەکوژن بە ناحەق کە مەبەست پێی جوولەکەیە کە چەندەها پێغەمبەری خوای گەورەیان کوشتووە، ئەو کەسانەیش ئەکوژن کە فەرمان بە دادپەروەری و چاکە ئەکەن لەناو خەڵکیدا واتە: موسڵمانان موژدەی سزایەکی زۆر بەئێش و ئازار بدە بەو جوولەکانە(٢١)

٥. بێ ئەدەب بوون بەرانبەر بە خواو پێغەمبەران، تانەو تەشەریان ئەدا لە خوا و پێغەمبەرەکانیان تۆش بە پێچەوانەوە دەبێت زۆر ڕێز و ئەدەبەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکەیت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَـٰنًا وَكُفْرًا ۚ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ ۚ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٤﴾﴾ المائدة

واتە: جوولەکە نەفرەتی خوای گەورەیان لێ بێ وتیان: دەستی خوای گەورە بەستراوە، واتە: خوای گەورە ڕەزیلەو دەستی کراوە نیەو نابەخشێ کە ئەمە قسەی یەکێک بوو لە جوولەکەکان

کە ناوی (فنحاص) بوو لە پێشتریش لە سوورەتی (آل عمران) باسمان کرد کە وتیان: خوا فەقیرەو ئێمە دەوڵەمەندین، خوای گەورەش فەرمووی: دەی دەستی خۆیان بەستراو بێت و کراوە نەبێ، واتە: ڕەزیل بن، یاخود لە حەقیقەتدا دەستیان ببەسترێتەوەو ئەسیر و دیل بکرێن و لە جەنگەکاندا تێکبشکێندرێن نەفرەتی خوای گەورەیان لێ بێ بەهۆی ئەو قسە خراپانەی کە بەرامبەر بە خوای گەورە کردیان بەڵکو هەردوو دەستی خوای گەورە کراوەیە، چۆن ویستی لێ بێت ئاوا ئەیبەخشێ بەگوێرەی مەشیئەت و ویست و حیکمەتی خۆی، کە لەو ڕۆژەی ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە بەشەو و بەڕۆژ بەردەوام دەبەخشێت و هیچ لە موڵکی خوای گەورە کەمی نەکردووە، پێی خۆشە بەردەوام بەندەکان داوای لێ بکەن تا پێیان ببەخشێت ئەو قورئانە پیرۆزە کە بۆ تۆ دابەزیوە کە ئەم حوکمە جوانانەی لە خۆ گرتووە زۆرێک لە جوولەکەو گاورەکان لە جیاتی ئیمانی پێ بێنن ئەوان زیاتر تووشی توغیان و کوفر ئەبن پێی لەبەر حەسوودییانتا ڕۆژی قیامەتیش دژایەتی و ڕق و کینەمان خستۆتە نێوانیانەوە نێوان جوولەکەکان خۆیان یان نێوان جوولەکەو گاورەوە هەر کاتێک کە ئەوان کۆببنەوە بۆ جەنگ یان ئاگری جەنگ داگیرسێنن خوای گەورە ئەیکوژێنێتەوە، واتە: ئەمە پیشەی ئەوانە جوولەکەکان بە بەردەوامی خەریکی هەڵگیرساندنی شەڕو ئاژاوەو خراپەکارین، زۆربەی ئەو شەڕو ئاژاوەو خوێنڕێژانەی کە لە جیهان ڕوودەدات دەستی جولەکەی تێدایە بە بەردەوام کۆشش ئەکەن لەسەر زەویدا کە ئاشووب و گەندەڵی و خراپەکاری بنێنەوە، خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێ کە ئاشووبگێڕن و گەندەڵن و ئاژاوە ئەنێنەوە لەسەر ڕووی زەویدا﴿٦٤﴾

﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ﴿١٨١﴾﴾ آل عمران

واتە: بەدڵنیایی خوای گەورە وتەی ئەو جوولەکانەی بیست کە وتیان: خوای گەورە فەقیرەو ئێمە دەوڵەمەندین، کە خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاندکێ هەیە قەرزێکی باش بە خوای گەورە بدات؟ واتە: پارە ببەخشێ لە پێناو خوای گەورەدا خوای گەورە بەباشتر پێی ئەبەخشێت، ئەوەی کە وتیان مەلائیکەتەکان ئەینووسنەوەو ئەیپارێزن تا ڕۆژی قیامەت، ئەوەش ئەنووسین کە ئەمانە پێغەمبەرانی خوای گەورەیان بە ناحەق ئەکوشت پێیان ئەڵێین: دەی بچێژن سزای ئاگرێك کە زۆر سووتێنەرە﴿١٨١﴾

﴿قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ﴿٢٤﴾﴾ المائدة

واتە: وتیان: ئەی موسا علیه السلام ئێمە هەرگیز ناچینە ناو قودسەوە تا ئەوان لەو شارەدا بن، تۆ خۆت و خواکەت بڕۆن کوشتار بکەن ئێمەش لێرە دائەنیشین و ئەم جێگایە بەجێ ناهێڵین و شەڕو کوشتاری ئەوان بە ئێمە ناکرێ، ئەمە لە ترس و تێکشکاندن و سەرپێچی و عینادیدا وایان وت، بەڵام هاوەڵان لە غەزای (بەدر) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە وەک بەنی ئیسرائیل ناڵێین تۆ خۆت و خواکەت بڕۆن کوشتار بکەن و ئێمە لێرە دادەنیشین بەڵکو ئەگەر پێشمان بکەویت بۆ ناو دەریا شوێنت دەکەوین و بە دواتدا دێین و لە پێش و پاش و لای ڕاست و چەپت کوشتار دەکەین، پێغەمبەری خوایش ﷺ ڕووی پیرۆزی گەشایەوەو پێی خۆش بوو(٢١)

٦. پرسیاری زۆرو نامەعقول و دەمەدەمێی زۆر و بێمانا و پێچەوانەکەی مرۆڤی ئیماندار تەنها بە دوای حیکمەت دەگەڕێت بێ دەمەدەمێ لە دینەکەیدا.

پاشان ئەوان لەسەر خۆشیان و پێغەمبەرەکەشیان سەخت دەکرد نموونەی ڕووداوی مانگا و پیاوە پیرەکە برازاکەی کوشتبووی کە ناسراوە بە (سورة البقرة).

٧. ترسنۆک لە هەموو شتێک سڵ دەکەنەوە، هەرگیز ڕووبەڕوو نابنەوە بەڵکو ترسنۆکیان ئەوەندەیە کە لە جێگای خۆیان دایاندەنیشێنێت، بە پێچەوانەی یەهود، مرۆڤی موسڵمان پێویستە ئازا و چاونەترس و جوامێر بێت.

خوای گەورە لەبەرانبەر ترسی یەهود دەفەرموێت: ﴿لَا يُقَٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِى قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ ۚ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ۚ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴿١٤﴾﴾ الحشر

واتە: ئەوان ناتوانن کوشتاری ئێوە بکەن هەموویان بەیەکەوە کۆببنەوە بۆ کوشتاری ئێوە چونکە ترسنۆکن، مەگەر لەناو خانوو و ماڵی دێیەکدا کە شوراو قەڵای پتەوی هەبێ یان لە پشت دیوارەکانەوە خۆیان بشارنەوە لە ترسدا مەگەر ئاوا کوشتاری ئێوە بکەن ئەگەرنا ڕووبەڕوو ناتوانن، بەڵام جوولەکەو مونافیقان ڕق و کینەیان لەناو یەکدا زۆر سەختەو دڵیان جیاوازە، تۆ وا ئەزانی ئەوانە هەموویان یەکن، بەڵام دڵیان لێک جیاوازەو دڵیان لەگەڵ یەکدا نیەو یەک دڵ نین لەبەر ئەوەی ئەمانە کەسانێکی ناحاڵی و ناتێگەیشتوون(١٤)

﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ﴿٩٦﴾﴾ البقرة

واتە: نەک هەر ئاوات ناخوازن بمرن بەڵکو ئەیانبینی لە هەموو کەسێک سوورترن لەسەر ژیان کە لە ژیاندا بمێننەوە، تەنانەت ئەمان لە موشریکانیش زیاتر ئاواتەخوازن بە مانەوە لە دونیادا هەر یەکێک لەو جوولەکانە ئاواتە خوازە کە هەزار ساڵ بژی، هەرچەندە چەندێک تەمەنیشیان درێژ بێت کە ئیمان نەهێنن ئەو تەمەنە درێژە لە ئاگری دۆزەخ و لە سزای خوای گەورە دووریان ناخاتەوە خوای گەورە زۆر بینایە بە کردەوەکانی ئەوان و ئاگای لێیە﴿٩٦﴾

٨. دڵڕەقن بەرانبەر بە هەموو مرۆڤێک بەتایبەت موسڵمانان، پێچەوانە تۆ دڵ نەرم بە بەرانبەر هەموو مرۆڤێک و برایەتی نێوان موسڵمانان بپارێزە، خوای گەورە لەبارەی دڵ ڕەقی و پاشان دژی موسڵمانان دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾﴾ البقرة

واتە: لە دوای ئەم هەموو موعجیزانە دیسانەوە ئێوە لە جیاتی ئەوەی بەردەوام بن لەسەر تاعەت و عیبادەتی خوای گەورە دڵتان ڕەق بوو، دڵتان وەکو بەرد ڕەق بووە یاخود دڵتان لە بەرد ڕەقتر بووە لەناو بەردەکانیشدا هەیە ئەتەقێ و کانی ئاوی لێ دەرئەچێت هەیشە لەت ئەبێت و ئاوی لێ دەرئەچێت، هەیە لەسەر شاخەکان بەر ئەبێتە خوارەوە لە ترسی خوای گەورە﴿٧٤﴾ [٣٨]

﴿۞ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴿٨٢﴾﴾ المائدة

واتە: ئێوەی موسڵمان ئەبینن سەختترین کەسێک کە دژایەتی ئێوەی باوەڕدار بکات جوولەکەو هاوبەشبڕیاردەرانن ئەمانە سەختترین دژایەتی موسڵمانان ئەکەن، چونکە کوفری جولەکە کوفری عینادی و نکوڵی و ڕەتکردنەوەی حەق و سوکایەتی کردنە بە زانایان هەربۆیە زۆرێک لە پێغەمبەرانیان کوشتووەو چەند جارێک هەوڵی کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ-یان داوەو سیحریان لێ کردووە ئەبینن لە هەموویان نزیکتر خۆشەویستیان هەبێ بۆ باوەڕداران ئەو کەسانەن کە ئەیانووت: ئێمە نەساراین گاورین لەبەر ئەوەی ئەمانە

---

[٣٨] موجاهد ئەفەرموێت: هەر بەردێک لەسەر شاخ بەربۆوە ئەوە لە ترسی خوای گەورەیە، هەر بەردێ شەقی بردو ئاوی لێ دەرچوو لە ترسی خوای گەورەیە بەڕاستی خوای گەورە بێئاگا نییە لەو کردەوانەی کە ئێوە ئەنجامی ئەدەن

زاناو وتاربێژو خواپەرستیان تیایە و تەکەبوریان نەبووە لە وتنی حەقدا، بەڵکو خۆبەکەم زان بوونە بەپێچەوانەی جوولەکەوە﴿٨٢﴾

﴿وَقَالُواْ قُلُوبُنَا غُلْفُۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾﴾البقرة

واتە: وتیان: ئێمە دڵمان پەردەی بەسەرەوەیە هیچ لە قسە حاڵی نابین و لێی تێ ناگەین و ناگاتە دڵمان تا ئیمان بێنین، بە (غُلُفٌ) دەخوێندرێتەوە واتە: دڵمان پڕە لە زانست و پێویستمان بە قورئانی ئێوە نیەبەڵکو ئەمە خوای گەورە لەعنەتی لێیان کردووەو دەریانی کردووەو دووریانی خستۆتەوە لە ڕەحمەتی خۆی بەهۆی ئەوەی کە ئیمانیان نەهێنا بە پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓالِهِۦوَسَلَّمَ کەمێکیان هەن کە ئیمان بێنن و زۆر عینادیان کردووە﴿٨٨﴾

٩. کارکردن بە سیحر و شوێن کەوتنی جن و شەیتان لە پیشەیانە، بە پێچەوانەوە هەموو ئەو کارانە موسڵمان دەبات بەرەو کوفر و کافریان دەکات.

١٠. ئاواتیان نانەوەی ئاژاوە و جەنگ و فەساد و خراپەکارانە، مرۆڤی خواناس دەبێت ئاواتی چاکە و چاکەخوازی بێت و حەز بە خراپەی کەس نەکات، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ۚ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ كُلَّمَآ أَوْقَدُواْ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ ۚ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٤﴾﴾ المائدة

واتە: جوولەکە نەفرەتی خوای گەورەیان لێ بێ وتیان: دەستی خوای گەورە بەستراوە، واتە: خوای گەورە ڕەزیلەو دەستی کراوە نییەو نابەخشێ کە ئەمە قسەی یەکێک بوو لە جوولەکەکان کە ناوی (فنحاص) بوو لە پێشتریش لە سوورەتی (آل عمران) باسمان کرد کە وتیان: خوا فەقیرەو ئێمە دەوڵەمەندین، خوای گەورەش فەرمووی: دەی دەستی خۆیان بەستراو بێت و کراوە نەبێ، واتە: ڕەزیل بن، یاخود لە حەقیقەتدا دەستیان ببەسترێتەوەو ئەسیر و دیل بکرێن و لە جەنگەکاندا تێکبشکێندرێن نەفرەتی خوای گەورەیان لێ بێ بەهۆی ئەو قسە خراپانەی کە بەرامبەر بە خوای گەورە کردیان بەڵکو هەردوو دەستی خوای گەورە کراوەیە، چۆن ویستی لێ بێت ئاوا ئەیبەخشێ بەگوێرەی مەشیئەت و ویست و حیکمەتی خۆی، کە لەو ڕۆژەی ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە بەشەو و بەڕۆژ بەردەوام دەبەخشێت و هیچ لە موڵکی خوای گەورە کەمی نەکردووە، پێی خۆشە بەردەوام بەندەکان داوای لێ بکەن تا پێیان ببەخشێت، ئەو قورئانە پیرۆزە کە بۆ تۆ دابەزیوە کە ئەم حوکمە جوانانەی لە خۆ گرتووە زۆرێک لە جوولەکە و گاورەکان لە جیاتی ئیمانی پێ بێنن ئەوان زیاتر تووشی توغیان و کوفر ئەبن پێی

لەبەر حەسوودییانتا ڕۆژی قیامەتیش دژایەتی و ڕق و کینەمان خستۆتە نێوانیانەوە نێوان جوولەکەکان خۆیان یان نێوان جوولەکەو گاورەوە هەر کاتێک کە ئەوان کۆببنەوە بۆ جەنگ یان ئاگری جەنگ داگیرسێنن خوای گەورە ئەیکوژێنێتەوە، واتە: ئەمە پیشەی ئەوانە جوولەکەکان بە بەردەوامی خەریکی هەڵگیرساندنی شەڕو ئاژاوەو خراپەکارین، زۆربەی ئەو شەڕو ئاژاوەو خوێنڕێژانەی کە لە جیهان ڕوودەدات دەستی جولەکەی تێدایە، بە بەردەوام کۆشش ئەکەن لەسەر زەویدا کە ئاشووب و گەندەڵی و خراپەکاری بنێنەوە، خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێ کە ئاشووبگێڕن و گەندەڵن و ئاژاوە ئەنێنەوە لەسەر ڕووی زەویدا﴿٦٤﴾

لەڕاستیدا گەلی جولەکە سیفاتیان زۆرە، بەڵام ئەوەندە بۆ تێگەیشتن لێیان بەسە تا مرۆڤ بیانناسێت لە ڕێگای فەرموودەی خوای موتەعال، کاتێک مرۆڤ باسی پەیوەندی بەندایەتی حەزرەتی داوود دەکەین لەگەڵ شاخ و باڵندە دا، ئەمە واتای ئەوە نییە وەکو چیرۆکی منداڵان بێتە بەرچاوی خوێنەر، بەڵکو بەواتای هەموو ئەم گەردوونە لە تەسبیحات و بەندایەتی خوای پەروەردگارە، بۆیە مرۆڤ کاتێک بەندایەتی دەکات واتا گونجاوە لەگەڵ ئەم گەردوونی خوای پەروەردگارەدا و دەرنەچووە لە یاساکانی گەردوونی خوایی.

بەڵام مرۆڤ کە دەرچوو لە گەردوونی خوای پەروەردگار، خۆی لە بیردەکات و پاشان خوای گەورەش لەبیردەکات، بە واتای ئەوەی لەم گەردوونە دەرچووە، جێگای لەگەڵ خراپەکاراندایە، ئەویش ئاگری دۆزەخە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِشْرَاقِ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً ۖ كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴿١٩﴾ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ﴿٢٠﴾﴾ص

واتە: ئێمە شاخەکانمان ژێربار کردبوو لەگەڵیدا تەسبیحاتی خوای گەورەیان ئەکرد بە ئێواران و بەیانیان﴿١٨﴾ کە زەبوری بخوێندایە ئەوەندە دەنگی خۆش بوو باڵندەکانیش لە ئاسمان هەر هەموویان کۆ ئەبوونەوەو لەگەڵیدا تەسبیحاتی خوای گەورەیان ئەکردو هەموویان ئەگەڕانەوە بۆ لای خوای گەورەو گوێڕایەڵی دەبوون﴿١٩﴾ موڵکەکەیشیمان زۆر بەهێز کردو موڵکێکی تەواومان پێبەخشی ئەوەی کە پاشاکان پێویستیان بێت، سەرمان خست بەسەر دوژمندا، حیکمەت و دانایی و کاربەجێی و تێگەیشتن و دادپەروەری و پێغەمبەرایەتیمان پێ بەخشی یەکلا کردنەوەمان پێ بەخشی لە قسە کردن و بڕیاردان و قەزادا کە بە جوانی یەکلای ئەکردەوە بە بوونی دوو شایەت لەسەر تۆمەتبار، کە نەبوو ئەوا بە سوێند خواردنی تۆمەتبارەکە، وەکو شەریعەتی خۆمان﴿٢٠﴾

خوای پەروەردگار کە جنۆکەی بە فەرمانی خۆی خستە بەردەست حەزرەتی سولەیمان و بەهۆکاری جنۆکەکان شەیتانەکانی دەگرت و دەیبەستنەوە و پاشان کاری پێ دەکردن،

شەیتانەکانی ملکەچ کردبوو بۆ فەرمانی، ئەوەی گرنگە قورئان بە دەقیقی هێناویەتی دۆعاکەیەتی، خۆ ئەگەر ئەو دوعایە لە قورئان دا بۆ خەڵکی یاداشت نەکرایە خوای پەروەردگار بە جوانترین شێوە بۆی ڕوون نەکردنیایەتەوە کە سولەیمان فەرمووی ئەو دوو دەسەڵاتە داوای من مەیدە هیچ کەسی تر و خوای پەروەردگار دوعاکەی قبوڵ کرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ٣٥﴾ص

وتی: ئەی خوای گەورە لێم خۆشبە و موڵکێکم پێ ببەخشە کە تایبەت بێت بە من و لە دوای من بۆ هیچ کەسێک نەبێت، ئەوە بوو کە خوای گەورە جنی و شەیتانەکانی موسەخەرو ژێربار کردبوو لە ژێر دەستیدا بوون، هەر تۆ خوایەکی کە ئەبەخشیت و زۆر بەخشەری٣٥

ئەگەر ئەم ئایەتە نەبوایە ئێستا هەموو کەس دەیوت جنۆکەم هەیە و کارم بۆ دەکات، لەکاتێک دا بەشێک لە جنۆکە و شەیتانەکان موسەخەر (ڕام) نەبوون، بەڵکو ملکەچی بوون و ئەیگرتن و دەیبەستنەوە و کاری پێ دەکردن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٖ وَغَوَّاصٖ ٣٧ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ ٣٨﴾ص

واتە: شەیتانەکانیش لە ژێر دەستیدا بوون و بە فەرمانی ئەو ئیشیان ئەکرد هەیان بووە خانوو و بیناو میحراب و قاپ و مەنجەڵی گەورەو ئەو شتانەی دروست ئەکرد کە لە توانای مرۆڤدا نەبووە، هەشیان بووە دەریاوان بووە ئەچوونە ناو دەریاوە خشڵ و زێڕو زیو و ئەو شتانەی لە دەریا بووە دەریان کردووەو بۆ سولەیمان پێغەمبەریان هێناوە ٣٧ هەندێکیش لە شەیتان و جنیەکان کۆت و زنجیر کرابوون ئەوانەی کە بە قسەیان نەکردایەو کاریان نەکردایا، یان ئیشەکانیان بە جوانی جێبەجێ نەکردایە٣٨

لەدوای وەفاتی حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ بەداخەوە کوڕ و کوڕەزاکانی نەیانتوانی موڵکەکەی بپارێزن و گەلی ئیسرائیل ساڵانێک بەبێ پادشا و پێغەمبەر مانەوە.

# پێڕست

# MAKWAN KERÎM

## MEMILEKETÎ PÊXEMBERAN - BERGÎ DUWEM

مەملەکەتی

## پێغەمبەران ٧

خاکی قودس دەبێت خەڵکانێک ڕزگاری بکەن سیفاتی داوودیان هەبێت، هەرجارەو کە ئەو خاکە داگیر دەکرا بە هۆکاری خوانـاسی پێغەمبـەران یاخـود جوانتر بڵـێین پاکی پێغەمبەران و چاکی شوێنکەوتوانی ڕزگار دەبوو، بە تەنها پێغەمبەرانیش هیچیان پێ نەدەکرا ئەگەر گەلەکەیان خواناس و موجاهید نەبوونایە، ئەوە نموونەی دوو پێغەمبەری عەزیز وەکو موسا و هارون سەلامی خوایان لێ بێت، بەڵام ئەوان نەوەستان لە پەروەردەکردن بەردەوام لە پەروەردەی جیلی نوێ دابوون، خۆشیان چاوەڕوانی ئەنجامیان نەکرد، بەڵکو تەنها کاریان ئەنجام ئەدا هەرچەندە ئامانجەکە چوونە ناو خاکی قودس بوو.


کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی




Cover Design: **Braw** Al-Najjar

لقی یەکەم: هەولێر - بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری
لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحموود - بەرانبەر مزگەوتی مەحموود عەللاف

٠٧٨٣٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤

M.Ktebxana

نرخ: ١٧٠٠٠